# قەڵای سپی

ئۆرهان پاموك

هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات ٢٠٠٦





بەکر شوانی

لە تورکییەوە وەری گێڕاوە

ئۆرهان پاموک

هەڵگری خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات ٢٠٠٦

# قەڵای سپی

بەکر شوانی

لە تورکییەوە وەری گێڕاوە

ناوی کتێب: قەڵای سپی - ڕۆمان

نووسینی: ئۆرهان پاموک

وەرگێڕانی لە تورکییەوە: بەکر شوانی

بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٩٠٥

دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم

بەرگ: مریەم موتەقییان

چاپی دووەم: ٢٠٠٩

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٢٤٧ی
ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

"پێشبینیکردنی ئەوەی کەسێکی مایەی بایەخ پێدانی ئێمە تێکەڵ بەڕەگەزەکانی ژیانێکی نادیار و، بارتەقای نادیارییەکەشی، سەرنجڕاکێش بووە و، بیرکردنەوە لەوەی تەنیا بەخۆشەویستیی ئەوەوە دەتوانین پێ بنێینە ژیانەوە، ئەگەر ئاماژە نەبێت بۆ دەسپێکی ئەڤینێک، ئەدی چ واتایەکی تر دەگەیەنێت؟"

ی. ک. قەرەعوسمانئۆغڵو
لە مارسێل پرۆست-ەوە وەری گێڕاوە

# ئۆرهان پاموک

ساڵی ١٩٥٢له ئەستەنبوڵ لە دایک بووە. لە ماڵباتێکی هاوشێوەی ماڵباتەکانی ناو ڕۆمانەکانی "جەودەت بەگ و کوڕەکانی" و "کتێبی ڕەش"، لە نیشانتاشی، بەشەشاری دەوڵەمەندنشین و بە ڕۆژئاواییبووی ئەستەنبوڵ پێ گەیشتووە. وەک خۆیشی لە کتێبی ئۆتۆبیۆگرافی ئەستەنبوڵدا باسی کردووە، لە منداڵییەوە تا تەمەنی ٢٢ ساڵی خووی داوەتە نیگارکێشان و پێی وا بووە لە داهاتوودا دەبێت بەنیگارکێش. قۆناغی ئامادەیی لە قوتابخانەی (Robert College)ی ئەمریکایی لە ئەستەنبوڵ خوێندووە. دوای سێ ساڵ خوێندنی نیگارکێشی و بیناسازی لە زانکۆی تەکنەلۆجیی ئەستەنبوڵ، تێ دەگات نابێت بە بیناساز و نیگارکێش، بۆیە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت. لە زانکۆی ئەستەنبوڵ دەست دەکات بە خوێندنی ڕۆژنامەگەری. پاموک لە تەمەنی بیست و سێ ساڵییەوە بڕیار دەدات ببێت بە ڕۆماننووس، دەست لە هەموو شتێکی تر هەڵدەگرێت، خۆی دەخزێنێتە سووچی ماڵەوە و دەست دەداتە نووسین.

ڕۆمانی یەکەمی، "جەودەت بەگ و کوڕەکانی"، ساڵی ١٩٨٢ بڵاو کرایەوە. ئەم ڕۆمانە خەڵاتی ئۆرهان کەمال و خەڵاتی ڕۆمانی ڕۆژنامەی میللیەتی وەرگرت. ساڵی دواتر، پاموک ڕۆمانی "ماڵی کپ"ی خستە بازاڕەوە. ئەم ڕۆمانە، پاش وەرگێڕانی بۆ زمانی فەرەنسی، ساڵی ١٩٩١ خەڵاتی (Prix de la Découverte Européene)ای پێ درا. ڕۆمانی "قەڵای سپی"، چیرۆکی ناکۆکی و دۆستایەتیی نێوان کۆیلەیەکی ڤینیسیایی و زانایەکی عوسمانی دەگێڕێتەوە و نووسەر لە ساڵی ١٩٨٥دا بە چاپی گەیاندووە. پاش ئەوەی ساڵی ١٩٩٠ بۆ زمانی ئینگلیزی و چەند زمانێکی تری ڕۆژئاوایی وەرگێڕدرا، یەکەم ڕۆمان بوو ناوبانگی پاموکی گەیاندە ئاستی نێودەوڵەتی. ساڵی ١٩٨٥ خۆی و

هاوسەری چوونە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ماوەی سێ ساڵ لە زانکۆی کۆڵۆمبیا لە نیویۆرک وەک "زانای میوان" کاری کرد. لەوێ، بەشێکی زۆری ڕۆمانی "کتێبی ڕەش"ی نووسی. نووسەر لەو ڕۆمانەدا، لە میانەی پارێزەرێکەوە کە بەدوای هاوسەری ونبووی خۆیدا دەگەڕێت، باسی کۆڵان و شەقامەکانی ئەستەنبوڵ، ڕابردووی شار، پێکهاتە و ڕایەڵەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. "کتێبی ڕەش سالی ۱۹۹۰ لە تورکیا بڵاو کرایەوە و دوای وەرگێڕانی بۆ زمانی فەرەنسی، خەڵاتی (Prix France Culture)ی وەرگرت. "کتێبی ڕەش"، ئەزموونێکە باس و خواسی زۆری هەڵگرتووە و ناوبانگی پاموکی زیاتر بە تورکیا و جیهاندا بڵاو کردەوە.

"ژیانی نوێ" ڕۆمانێکی تری پاموکە و بەسەرهاتی فێرخوازێکی زانکۆ دەگێڕێتەوە کە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کتێبێکی جادوو ئامێزەوە. ئەم ڕۆمانە ساڵی ۱۹۹٤ بڵاو کراوەیەوە و ژمارەیەکی پێوانەیی لە فرۆشتندا تۆمار کرد. نووسەر، ساڵی ۱۹۹۸ ڕۆمانی "من ناوم سوورە"ی بڵاو کردەوە. ئەم ڕۆمانە چیرۆکی وەستایانی نیگارکێشی عوسمانی و ئێرانی و جیهانی ڕۆژئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە. ساڵی ۲۰۰۲ لە فەرەنسا خەڵاتی (Prix du Meilleur Livre étranger)، لە ئیتاڵیا خەڵاتی (Grinzane Cavour) و ساڵی ۲۰۰۳ لە ئیرلەندا خەڵاتی (International Impac-Dublin)ی وەرگرت. پاموک لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدی سەدەی ڕابردووەوە دەستی دایە وتارنووسین لە بوارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی بیر و ڕا دەربڕیندا و کەوتە ڕەخنەگرتن لە دەوڵەتی تورکیا، بەڵام خۆی زۆر بە سیاسەتەوە سەرقاڵ نەکرد. گوڵبژێرێکی لە وتارە ئەدەبی و کولتوورییەکانی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کۆ کردەوە و ساڵی ۱۹۹۹ لە دوو توێی کتێبێکدا بەناوی "ڕەنگەکانی تر" بە چاپی گەیاند. ساڵی ۲۰۰۲ ڕۆمانی "بەفر"ی بڵاو کردەوە و نووسەر خۆی "بە یەکەمین و دوایین ڕۆمانی سیاسی"ی دادەنێت. ڕووداوەکانی "بەفر" لە شاری قارس دەقەومێن و ئیسلامی سیاسی، سوپا، لایست و توندوتیژی و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوەپەرستانی کورد و تورک دەخاتە بەرچاوان. نووسەر بەم ڕۆمانە شێوازێکی نوێی نووسینی ڕۆمانی سیاسیی تاقی

کردەوە. ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز لە ساڵی ٢٠٠٤دا ڕۆمانی "بەفر"ی خستە ریزی باشترین ١٠ کتێبی ساڵەوە لەسەر ئاستی جیهان. "ئەستەنبوڵ" کتێبێکی تری ئۆرهان پاموکە لە ساڵی ٢٠٠٣دا چاپ کراوە. نووسەر لەو کتێبەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی تا تەمەنی ٢٢ ساڵی دەگێڕێتەوە. ئەو کتێبە شیعر ئامێزەی نووسەر بە وێنەی ئەلبومی تایبەتیی نووسەر خۆی، وێنەی هونەرمەندانی نیگارکێشی بیانی و ناوخۆیی ڕازێندراوەتەوە و پۆلێنکردنیشی کارێکی دژوارە.

"مۆزەخانەی پاکیزەیی" نوێترین ڕۆمانی پاموکە لە هاوینی ٢٠٠٨دا کەوتە بازاڕەوە و مانگێک دوای بڵاوبوونەوەی بە زمانی تورکی، وەرگێردرایە سەر ٣٠ زمانی زیندووی جیهانی. یەکەم کاری نووسەرە لە دوای وەرگرتنی خەڵاتی ئەدەبیاتی نۆبڵ و سەرانسەریش بۆ ئەڤین و ڕۆمانسییەت تەرخان کراوە.

بە زمانی کوردی و بە کوردستانەوە، بەرهەمەکانی ئۆرهان پاموک بە زیاتر لە ٥٠ زمان لە ١٠٠ و هێندە وڵاتی جیهاندا دەخوێندرێنەوە. پاموک ساڵی ٢٠٠٥ خەڵاتی ئاشتیی کۆبەندی وەشانخانەکانی ئەڵمانیای وەرگرت. ئەمە دیارترین خەڵاتی بواری کولتووریی ئەڵمانیایە و لە ساڵی ١٩٥٠وە دابەش دەکرێت. خەڵاتی ساڵانەی (Le Prix Médicis étranger) بۆ باشترین ڕۆمانی بیانی لە فەرەنسا، ساڵی ٢٠٠٥ بە ڕۆمانی "بەفر" ڕەوا بیندرا. نووسەر لە هەمان ساڵدا خەڵاتی (Richarda Huch)ی وەرگرت. ئەو خەڵاتە هەر سێ ساڵ جارێک لە شاری دارمشتادتی ئەڵمانیا دەدرێت بە "کەسایەتیی خاوەن بیری ئازاد و هەڵوێستی بوێرانە." گۆڤاری (Time) لە ساڵی ٢٠٠٦دا ئۆرهان پاموکی وەک یەکێک لە ١٠٠ کەسایەتیی کاریگەری ساڵ هەڵبژارد. ڕۆمانی "بەفر" لە هەمان ساڵدا خەڵاتی (Méditerranée étranger) Le Prix)ی پێ درا. پاموک ئەندامی شانازیی (American Academy of Arts and Lettes))ی ئەمەریکی و ئەندامی شانازیی ئەکادیمیای زانستی مرۆیی چینە. نووسەر ساڵی ٢٠٠٦ خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت و بوو بەدووەم لاوترین کەس لە مێژووی پێدانی خەڵاتی نۆبڵدا.

# پێشەکی

ئەم دەستنووسەم لە ساڵی ١٩٨٢دا لە ناو پاشماوەی "ئەرشیف"ی سەر بە قایمقامییەتی گەبزەدا کە کردوومە بە خوو گشت هاوینێک هەفتەیەک سەروبنی دەکەم، دۆزییەوە. دەستنووسەکە لە بنی سندووقێکی تۆزاویی پڕ لە فەرمان، بەڵگەی تاپۆ، تۆماری دادگا و دەفتەری فەرمیدا بوو. لەبەر ئەوەی بەرگێکی بەنەخش و نیگاری زەریفی تێ گیرابوو، و بە دەستنووسێکی بۆ خوێندنەوە شیاو نووسرابوو، لە ناو بەڵگەنامە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەوڵەتدا دەدرەوشایەوە و بریسک و باسکی بوو، لەجێدا سەرنجمی ڕاکێشا. پێم وا بێت دەستێکی نامۆ، وەک ئەوەی مەبەستی بووبێت لە ڕادەی واقوڕماویی من بباتە سەرێ، سەردێڕێکی لە پەڕەی یەکەمی کتێبەکەدا نووسیبوو: "زڕکوڕی لێفەدروو". هیچ سەردێڕێکی تریشی بەسەرەوە نەبوو. دەستێکی منداڵکارانە، لە پەراوێز و بۆشاییی پەڕەکاندا وێنەی مرۆگەلی سەر بچووکی کێشابوو، هەمووشیان جلوبەرگی پڕ لە قۆپچەیان پۆشیبوو. یەکسەر بەچێژێکی زۆرەوە کتێبەکەم خوێندەوە. زۆر دڵم تێ چوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لەوە تەمبەڵتر بووم بتوانم بەنووسین دانەیەکی لەبەر بگرمەوە، بەقۆستنەوەی متمانەی فەرمانبەرەکەی ئەوێ، چونکە لە سۆنگەی ڕێز لێ گرتنمەوە چاودێریمی نەدەکرد، لە چاوتروکاندنێکدا کتێبەکەم لەو زبڵخانەیەی تەنانەت قایمقامی لاویش بە "ئەرشیف" ناوی نەدەبرد، دزی و هەڵم دایە بنی جانتاکەمەوە.

ڕۆژانی سەرەتا، جگە لە خوێندنەوەی لەسەریەکی، نەمدەزانی چی تر بکەم. بەهۆی ئەوەی هێشتا لە مێژوو بەگومان بووم، ویستم لەبری بەهای زانستی و کولتووری و ئانترۆپۆلۆجی، یان "مێژوویی"ی کتێبەکە، زیاتر بایەخ بە بەسەرهاتی ناوی بدەم. ئەمەش منی بەرەو لای چیرۆکنووس خۆی ڕادەکێشا.

لەبەر ئەوەی خۆم و هاوڕێکانم ناچار بووین زانکۆ بەجێ بهێڵین، گەڕابوومەوە سەر کاری ئەنسکلۆپیدی کە پیشەی باپیرم بوو: لەو سەروبەندەدا بەخەیاڵمدا هات پەرەگرافێک دەربارەی نووسەری کتێبەکە لە ئەنسکلۆپیدیای "ناوداران"دا کە خۆم سەرپەرشتیی بەشی مێژووەکەیم دەکرد، دابنرێت.

بەو جۆرە، ئەو کاتانەی دوای کاری ئەنسکلۆپیدی و خواردنەوە بۆم دەمانەوە، بەم کارە تەرخانم کرد. پاش گەڕانەوەم بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکانی سەردەمی نووسینی کتێبەکە، دەستبەجێ بۆم دەرکەوت هەندێک لە ڕووداوەکانی ناو بەسەرهاتەکە ڕەنگدانەوەی ڕاستییەکان نین: بۆ نموونە؛ لە ماوەی پێنج ساڵ فەرمانڕەواییی باشوەزیر کۆپرولودا لە ئەستەنبوڵ ئاگرێکی گەورە کەوتووەتەوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نەبوو بۆ نەخۆشییەکی شایەنی باس، بەتایبەتیش بڵاوبوونەوەی پەتایەک لەو جۆرەی لە کتێبەکەدا باسی لێوە کراوە. ناوی بڕێک لە وەزیرەکانی سەردەم بەهەڵە نووسرابوون، هەندێکیشیان جێگۆڕکێ بە ناوەکانیان کرابوو، تەنانەت بەشێکیان گۆڕدرابوون! ناوی گەورەی ئەستێرەناسانیش لەگەڵ ئەو ناوانەی لە تۆمارەکانی کۆشکدا هەبوون، یەکیان نەدەگرتەوە، بەڵام بەهۆی ئەوەی پێم وا بوو ئەم خاڵە پایەیەکی گرینگی لە کتێبەکەدا هەیە، لەسەری ڕاوەستام. لەلایەکی دی، "زانیارییەکانمان" لە بارەی مێژووەوە، بەشێوەیەکی گشتی ڕووداوەکانی ناو کتێبەکەیان پشتڕاست دەکردەوە. بگرە لە هەندێک لە وردەکارییە بچووکەکانیشدا ئەو "ڕاستی"یەم بینی: ڕووداوی کوژرانی حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان و ڕاوە کەروێشکی سوڵتان محەمەدی چوارەم لە کۆشکی میراخۆر لەگەڵ هەمان شێوازی گێڕانەوەی نەعیمەدا یەک دەگرێتەوە. ئەوەشم بەخەیاڵدا هات لەوانەیە نووسەر زۆری حەز لە خوێندنەوە و خەیاڵ ئافراندن بووبێت، بۆیە پێ دەچێت ئەو جۆرە سەرچاوانە و چەند کتێبێکی تریشی بۆ بەسەرهاتەکەی بە دەست هێنابێت و لەوانەیە بڕێک شتی لێیان وەرگرتبێت. هەرچەندە نووسەر دەڵێت ئەولیا چەلەبیی ناسیوە، بەڵام پێ دەچێت تەنیا کتێبەکانی خوێندبێتەوە. وای بۆچووم لەوانەیە، وەک لە

نموونەکانی تریشدا دەبیندرێت، پێچەوانەی ئەمەش ڕاست بێت. هەوڵم دا لە گەڕان بەدوای شوێنەواری نووسەری چیرۆکەکەمدا بێ ئومێد نەبم، بەڵام ئەنجامی بەدواداگەڕان و لێکۆڵینەوەکانم لە کتێبخانەکانی ئەستەنبوڵ، زۆربەی ئومێدەکانمی دایە دەم ئاوەوە. نەمتوانی نە لە کتێبخانەی کۆشکی تۆپقاپی و نە لە کتێبخانەکانی تر هیچ کام لەو لێکۆڵینەوە و کتێبانە بدۆزمەوە کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٦٥٢ و ١٦٨٠دا بۆ سوڵتان محەمەدی چوارەم نووسراون. تەنیا سەرەداوێکم کەوتە دەست: "خۆشنووسی چەپەوانە" کە لە بەسەرهاتەکەدا ناوی هاتووە، لەو کتێبخانانەدا پاشماوەی تری هەبوو. ماوەیەک دوای ئەم کارە کەوتم، بەڵام ئیدی بێزار بووم. زانکۆکانی ئیتاڵیام بەنامە داگرتبوونەوە، بەڵام وەڵامی ئومێد لێ بڕاوم لەوانەوە بۆ دەهاتەوە: بەپشتبەستن بەناوی نووسەر کە لە کتێبەکە خۆیەوە دەردەچێت، بەڵام لەسەری نەنووسراوە، لە گۆڕستانەکانی گەبزە و جەنەتحیسار و ئۆێسکودار دەستم بەگەڕان کرد، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم: بەو جۆرە دەستم لە گەڕان بەدوای شوێنپێیدا هەڵگرت و بەپشتبەستن بەناوەڕۆکی بەسەرهاتەکە، پەرەگرافی پێویستم بۆ ئەنسکلۆپیدیا نووسی. وەک بەترسەوە پێشبینیم کردبوو، ئەو پەرەگرافەیان چاپ نەکرد، بەڵام نەک لەبەر نەبوونی بەڵگەی زانستی، بگرە لەبەر ئەوەی کەسی باسکراو لە کتێبەکەدا وەک پێویست ناسراو نەبوو.

لەوانەیە زیاتر شەیدابوونم بەم بەسەرهاتە لەم سۆنگەیەوە بووبێت. تەنانەت ماوەیەک بیرم کردەوە دەست لە کار بکێشمەوە، بەڵام کارەکەم و هاوڕێکانم خۆشدەویست. بەو جۆرە، ماوەیەک تووشی هەر کەسێک دەبووم، بەسەرهاتەکەم بۆ دەگێڕایەوە، بەڵام وەک کەسێکی دۆزەرەوەی بەسەرهات نا، بگرە جۆری کەسێک کە خۆی نووسیبێتی. بۆ ئەوەی بتوانم سەرنجی زیاتر بۆ سەری ڕابکێشم، ئاماژەم بۆ بەهای سیمبولی کتێبەکە دەکرد، دەمگوت باس لە ڕاستییەکانی ئەم سەردەمەمان دەکات، لە میانەی ئەم بەسەرهاتەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان تێ دەگەین و شتی تری لەو بابەتە. هەرە زیاتر لاوانی

سەوداسەری بابتگەلی وەک سیاسەت و توندوتیژی و دیموکراسی بایەخیان بەم قسانەم دەدا، بەڵام ئەوانیش وەک هاوڕێیانی دەوری مێزی خواردنەوەم، پاش ماوەیەکی کورت بەسەرهاتەکەمیان لە بیر کرد. پرۆفیسۆرێکی هاوڕێم، پاش ئەوەی لەسەر پێداگرتنی خۆم چاوێکی بە پەڕەکانیدا گێڕا، دەستنووسەکەی بۆم گەڕاندەوە و گوتی: "لە ماڵە لە تەختە دروستکراوەکانی کۆڵانەکانی پشتەوەی ئەستەنبوڵدا بەدەیان هەزار دانە لەم جۆرە دەستنووسانەی لێوانلێو لە بەسەرهاتی لەو شێوەیە هەیە. ئەگەر دانیشتووانی ئەو ماڵانە لەسەر دۆلابی بەرز هەڵیان نەگرتبان لە ترسی ئەوەی پێیان وایە قورئانە، ئەوا پەڕە پەڕە بۆ گەرمکردنی سۆپاکانیان دەیاندڕین."

بەو جۆرە، بەهاندانی کچێکی چاویلکە لەچاو و بەردەوام جگەرە بە دەستەوە، بڕیارم دا کتێبەکە کە هێشتا بێ وچان دەمخوێندەوە، چاپ و بڵاو بکەمەوە. خوێنەرانم بۆیان ڕوون دەبێتەوە لە گواستنەوەی کتێبەکەدا بۆ سەر زمانی تورکیی هاوچەرخ، پێڕەویم لە هیچ شێوازێکی تایبەت نەکردووە. دەستنووسەکەم لەسەر مێزێک دانابوو، پاش ئەوەی دوو سێ ڕستەم لێ دەخوێندەوە، دەچوومە بەردەم مێزێکی تر لە ژوورێکی دی، ئەوەی لە خەیاڵمدا دەمایەوە، هەوڵم دەدا بە وشە و دەستەواژەی ئەم ڕۆژگارە بینووسمەوە. خۆم ناوی کتێبەکەم دانەنا، بگرە ئەو دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەیە دای نا کە ڕازی بوو بڵاوی بکاتەوە. ئەوانەی پێشکێشکردنەکەی سەرەتای ئەم کتێبە دەخوێننەوە، لەوانەیە بپرسن داخۆ ئەم شێوازە واتایەکی تایبەتی هەیە؟ بینینی شتەکان وەک ئەوەی هەموویان پێوەندییان پێکەوە هەبێت، پێم وا بێت یەکێکە لە نەخۆشییەکانی ئەم سەردەمە. منیش لەبەر ئەوەی تووشی هەمان نەخۆشی بووم، ئەم بەسەرهاتە بڵاو دەکەمەوە.

# ١

ئەو کاتەی کەشتییەکانی تورک ڕێیان پێمان بڕی، لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەچووین. هەموو کەشتییەکانی ئێمە بەسەریەکەوە سێ دانە بوون، بەڵام هینەکانی ئەوان لە ناو تەم و مژەکەوە سەریان دەردەهێنا و هێندە زۆر بوون، ئەوسەریان دیار نەبوو. لەپڕ ترس و شڵەژان باڵی بەسەر کەشتییەکەماندا کێشا؛ سەوڵ لێدەرەکانمان، لەبەر ئەوەی زۆربەیان تورک و مەغریبی بوون، هاواری خۆشییان لێ بەرز بووەوە. دەمارەکانی مێشکمان گرژ بوونەوە. کەشتییەکەی ئێمەش، وەک دووانەکەی دی، بەرەو وشکایی، ڕووی لە ڕۆژئاوا کرد، بەڵام نەمانتوانی بەخێرایی ئەواندا بگەین. هەرچۆنێک بێت، کاپتنی کەشتییەکەمان لە ترسی ئازاردان لە کاتی بەدیل گرتندا، دەستووری نەدەدا کۆیلە سەوڵ لێدەرەکان قایمتر قامچیڕێژ بکرێن. ساڵانی دواتر زۆر بیرم لێ کردەوە و بۆم دەرکەوت لە سۆنگەی ترسی ئەو کاپتنەوە بوو ڕەوتی ژیانی من بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا هات.

ئێستاش پێم وایە تەنانەت ئەگەر کاپتنەکەمان نەکەوتبایە ژێر کاریگەریی ئەو ترسە کورتخایەنەشەوە، ئەوا ڕەوتی ژیانی من لەو ساتەدا هەر دەگۆڕدرا. زۆربەی خەڵک دەزانن هیچ شتێک پێشتر لە ژیاندا یەکلایی نەکراوەتەوە و ئاگادارن هەموو بەسەرهاتەکان لە ڕاستیدا زنجیرەی کۆمەڵە ڕێککەوتێکن، کەچی تەنانەت ئەوانەی پەیبان بەم ڕاستییەش بردووە، کاتێک لە قۆناغێکی ژیاندا ئاوڕ بۆ دواوە دەدەنەوە، حـــسێـــبی چارەنووســـێکی حـــەتمی بۆ ڕووداوەکانی ڕابردوویان دەکەن. منیش بەقۆناغێکی لەو جۆرەدا تێ پەڕیم: ئێستا شێوەی کەشتیی لە تەم و مژەوە دەرچووی تورکەکان، وەک تارمایی دەهێنمە بەر زەینی خۆم و بەدەم نووسینەوەی کتێبەکەمەوە لەسەر مێزێکی

کۆن، وای بۆ دەچم کاتی ئەوە هاتووە بەسەرهاتی خۆم لە سیرەوە بۆ پیاز بگێڕمەوە.

کاتێک کاپتنەکەمان بینی وا دوو کەشتییەکەی تر بەنێوان کەشتییە تورکییەکاندا هەڵهاتن و خۆیان لە تەم و مژدا ون کرد، ئومێدێکی بەبەردا هاتەوە. لە ژێر پاڵپەستۆی ئێمەشدا غیرەتی دایە بەر خۆی و توانی دیلەکان بجووڵێنێت، بەڵام زۆر دواکەوتبووین. جگە لەوەش، ئەڤینی ئازادی دیلەکانی هێنابووە جۆش و بەزۆری قامچیش گوێڕایەڵی فەرمان نەدەبوون. زیاد لە دە کەشتیی تورک بەشێوەی ڕەنگاوڕەنگی خۆیانەوە دیواری تەمە وەڕسکەرەکەیان شەق کرد و بەجارێک بەرەو ڕوومان هاتن. کاپتنەکەمان، ئەمجار پێم وا بێت بەمەبەستی بەزاندنی دوژمن نا، بگرە بۆ زاڵبوون بەسەر ترس و شەرمی خۆیدا، بڕیاری دا شەڕ بکات؛ دەستووری دا قامچی وەشێنەکان بێبەبەزەییانە بکەونە وێزەی دیلەکان و تۆپەکانیش ئاگر بدرێن؛ بەڵام ئەم ئارەزووی شەڕە، وەک چۆن درەنگ گڕی گرت، بەزوویش کوژایەوە و خامۆش بوو. لە لاوە کەوتینە بەر هێرشێکی چڕ، ئەگەر دەستبەجێ خۆمان بە دەستەوە نەدایە، کەشتییەکەمان نقوم دەبوو، بۆیە بڕیارمان دا ئاڵای خۆ بە دەستەوەدان بەرز بکەینەوە.

ئەو کاتەی لە دەریای مەنگدا چاوڕێی کەشتییە تورکییەکانمان دەکرد، دابەزیمە خوارەوە بۆ کابینەی خۆم، هەروەک ئەوەی چاوەڕێی هاتنی چەند دۆستێک بم، نەک کۆمەڵێک دوژمن کە سەرتاپای ژیانم دەگۆڕن، دەستێکم بەشتومەکانمدا هێنا و ڕێکم خستنەوە، سندووقە بچووکەکەم کردەوە و داماوانە دەستم بەناو کتێبەکانمدا گێڕا. بەدەم هەڵدانەوەی پەڕەکانی کتێبێکەوە کە لە فلۆرنسا بە پووڵێکی زۆر کڕیبووم، فرمێسک ڕژایە چاوانمەوە. بانگکردن و دەنگی هەنگاوە شڵەژاوەکان و ژاوەژاوی دەرەوەی کابینەکە دەگەیشتە بەر گوێم. کەمێک دواتر بەخەیاڵمدا هات لە کتێبەکەی بەردەستم دوور بکەومەوە، بەڵام وام نەکرد، بگرە دەمویست بیر لە نووسراوی سەر پەڕەکانی بکەمەوە. وەک بڵێیت هەموو ڕابردووم، لە نێوان بیر و ڕستە و

هاوکێشەی کتێبەکەدا بێت و نەمەوێت لە دەستی بدەم. بە منجەمنج و وەک کەسێک تکا و نزا بکات، کەوتمە خوێندنەوەی ئەو دێڕانەی کەوتنە بەرچاوم. دەمویست کتێبەکە بەتەواوی لە هزری خۆمدا هەڵبکۆڵم، بۆ ئەوەی کاتێک ئەوان هاتن، من لە داهاتوودا بیر لەوان و ڕەفتارەکانیان نەکەمەوە، بگرە بتوانم ڕەنگەکانی ڕابردووم جۆری وشە خۆشەویستەکانی کتێبێکی بەئەڤینەوە لە بەرم کردووم، بێنەوە یادم.

ئەو سەردەمە من مرۆڤێکی تر بووم و دایک و دەزگیرانی و دۆستەکانی بەناوێکی دی بانگیان دەکرد. هێشتا ئەو کەسە کە هەر خۆم بووم، یان ئێستا پێم وایە خۆم بووم، جارویار لە خەوندا دەبینم، دوای هۆشیاربوونەوەش دەبینم جەستەم نیشتووەتە سەر ئاو. ئەو مرۆڤە کە ئێستا بیر لە ڕەنگە کاڵەوەبووەکان، ڕەنگی خەیاڵیی وڵاتە هەرگیز نەبیندراوەکان، ئاژەڵە ئەفسانەییەکان و ڕەنگی خەیاڵیی چەکە لە ئەقڵ بەدەرەکان دەکاتەوە، ئەو کاتە تەمەنی بیست و سێ ساڵ بوو. لە فلۆرنسا و ڤینیسیا "زانست و هونەر"ی خوێندبوو، باوەڕی وا بوو لە کەردووننناسی، بیرکاری، فیزیا و نیگارکێشیدا شارەزایە. بێگومان زۆر بە خۆی دەنازی، زۆربەی شتە ئەنجامدراوەکانی پێش خۆی هەرس کردبوو، دەمی لە هەموو شتێکەوە دەژەند. هیچ گومانی نەبوو لەوەی باشتریشی لە دەست دێت. بێ وێنە بوو، دەیزانی لە هەمووان ژیرتر و داهێنەرترە. بەکورتی، لاوێکی ئاسایی بوو. هەر جارێک پێویست بکات ڕابردوویەک بۆ خۆم دابتاشم، ناتوانم بڕوا بەخۆم بهێنم من هەمان ئەو لاوەم کە لەگەڵ خۆشەویستی خۆیدا سەبارەت بە ئەڤین و نەخشەکانی و جیهان و زانست دەدوا و زۆر بەشتێکی ئاساییی دەزانی ئەڤیندارەکەی پێی سەرسام بێت، بەڵام بەوە دڵی خۆم دەدەمەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسانێک بەپشووی درێژەوە ئەم نووسینانەم تا کۆتایی دەخوێننەوە و تێ دەگەن ئەو لاوە من نەبووم. لەوانەیشە خوێنەرانی پشووەدرێژ ڕۆژێک لە ڕۆژان، وەک ئێستای من، بیر لەوە بکەنەوە چیرۆکی ئەو گەنجەی بەدەم خوێندنەوەی کتێبە خۆشەویستەکانییەوە لە ژیان دوور کەوتەوە، ڕۆژێک، لەو

شوێنەوەی لێی ڕاوەستابوو، دەست پێ دەکاتەوە.

کاتێک مەلەوانەکان پێیان نایە سەر کەشتییەکەمان، کتێبەکەم نایەوە سندووق و چوومەوە دەرەوە. لەسەر کەشتییەکە ڕۆژی حەشر بوو. هەموانیان لە دەرەوە کۆ کردبووەوە و ڕووت و قووتیان دەکردنەوە. لەپڕ بیرم چوو بۆ ئەوەی پەشێوییەکە بقۆزمەوە و خۆم هەڵدەمە ئاوی دەریاوە، بەڵام بیرم کردەوە لەوانەیە لە دواوە بەر تیرم بەدەن، یان بمگرن و دەستبەجێ بمکوژن، جگە لەوەش، نەمدەزانی چەند لە وشکاییەوە دووریین. سەرەتا خۆیان لە من نەگەیاند. کۆیلە موسڵمانەکانی ڕزگار بوو لە کۆت و پێوەند هاواری خۆشییان لێ بەرز دەبووەوە. هەندێکیشیان یەکسەر دەستیان کردبوو بەتۆڵە سەندنەوە لە قامچی وەشێنەکان. تۆزێک دواتر منیان لە کابینەکەمدا دۆزییەوە، هاتنە ژوورەوە، شتومەکانمیان بەتاڵان برد. سندووقەکانیان بۆ گەڕان بەدوای زێڕدا ژێروژوور کرد، پاش بردنی برێک لە کتێبەکانم و هەموو شتومەکەکانم، یەکێکی تریان پەیدا بوو. لە کاتێکدا بەدامـاوی پەڕەی یەک دوو کتێبی پاشماوەی کتێبەکانم هەڵدەدایەوە، پەلی منی گرت و بردمی بۆ لای یەکێک لە کاپتنەکان.

ئەو کاپتنە، دواتر زانیم جێنێوایییەکی لە ئاین هەڵگەڕاوەیە و بووە بە موسڵمان، ڕەفتاری باشی لەتەکمدا نواند. پرسیاری کرد داخۆ شارەزای چ بوارێکم. بۆ ئەوەی نەمکەن بەسەوڵ لێدەر، یەکسەر باسی زانستی گەردوونناسیی خۆم و توانای ئاراستە دۆزینەوەم لە شەودا کرد، بەڵام فەرامۆش کرام. بۆیە بەپشتبەستن بەو کتێبی ئەناتۆمییەی کە بۆمیان هێشتبووەوە، لافی پزیشکیم لێ دا. کەمێک دواتر کەسێکی قۆڵبراویان پیشانم دا، من گوتم نەشتەرگەر نیم. ئەوان تووڕە بوون، خەریک بوو بمدەنە بەشی سەوڵ لێدان، کاپتن لەو کاتەدا کتێبەکانمی بینی و لێمی پرسی: داخۆ سەرم لە میز و لێدانی دڵ دەردەچێت؟ بەگوتنی: بەڵێ، سەری لێ دەردەکەم، هەم خۆم لە سەوڵ لێدەری پاراست و هەم چەند کتێبێکیشم پێ ڕزگار کرا.

بەڵام ئەم جیاوازبوونەم لەوانی دی، زۆر گران لەسەرم کەوت.

کرستیانەکانی تر، ئەوانەی درابوونە بەشی سەوڵ لێدان، یەکسەر نەفرەتیان لێم کرد. ئەگەر لە دەستیان بهاتایە لە کۆگای کەشتیی شوێنی حەسانەوەی شەوانمان منیان دەکوشت، بەڵام بەزوویی پێوەندی دانانم لەگەڵ تورکەکاندا، ترسی خستبووە بەر کرستیانەکان. ماوەیەکی کەم بەسەر مردنی کاپتنە ترسنۆکەکەماندا تێ پەڕیبوو، جەستەی سەرەوخوار هەڵواسرابوو. قامچی وەشێنەکان لووت و گوێیان بڕیبوو، بۆ ئەوەی ببێت بەپەند، بەستبوویانە کەڵەکێکەوە و خستبوویانە ئاوی دەریاوە. پاش ئەوەی بە بەکارهێنانی هۆشم، نەک زانستی ئەناتۆمی، برینی چەند تورکێکم تیمار کرد و برینەکان لە خۆیانەوە سارێژ بوونەوە، ئیدی هەمووان هاتنە سەر ئەو باوەڕەی من پزیشکم. تەنانەت چەند دوژمنێکی ئیرەیی پێبەریشم، لەوانەی بە تورکەکەیان گوتبوو ئەوە پزیشک نییە، شەو لە کۆگا برینەکانی خۆیان پێشانی من دا.

بەکەژاوەیەکی بە باق و بریقەوە براینە ئەستەنبوڵەوە. دەگوترا سوڵتانی هێشتا منداڵ سەیرمان دەکات. بەسەر ستوونەکانەوە ئاڵایان هەڵواسیبوو، بەلای خواریشەوە، ئاڵا، وێنەی دایە مریەم و خاچەکانی ئێمەیان سەرەوخوار هەڵواسیبوو، مۆڵەتیان بەڕەشە خەڵکەکەش دابوو لە خوارەوە تیربارانیان بکەن. دەنگی تۆپ لەو کاتەدا زەوی و ئاسمانی دەهەژاند. کەژاوەکە ماوەیەکی درێژی خایەند. من دواتر لە وشکاییەوە بەخەمگینی و بێزاری و مێشکی وڕەوە سەیری بەشی زۆریم کرد. کەسانێکی زۆر لەبەر گەرمای هەتاودا لە هۆش خۆیان چوون. لەگەڵ سوورایی خۆرنشینیدا لە قاسم پاشا لەنگەرمان گرت. بەمەبەستی بردنمان بۆ بەردەم سوڵتان، زنجیر خرایە دەست و پێمان، سەربازەکانیشمان بۆ ئەوەی ببنە مایەی گاڵتە و پێکەنین، ناچار کران زرێپۆشەکانیان بە پێچەوانەوە لەبەر بکەن، ئەڵقەی ئاسنینیان کردە ملی کاپتن و ئەفسەرەکان، بە پێ ڕابواردن و شادمانییەوە فوویان بە کەڕەنا و ترامپێتی بەتاڵان بردووی ناو کەشتییەکەماندا دەکرد. بەو جۆرە، بەدەم گێڕانی بەزم و ڕەزمەوە براین بۆ کۆشک. خەڵکی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگەکان بەسەرمەستی و پەرۆشەوە بۆمانیان دەڕوانی. سوڵتان، بێ ئەوەی ئێمە

بیبینین، بەشە دیلی خۆی هەڵبژارد و جیای کردەوە. دواتر براینە گالەتا و لەوێ فڕێ دراینە زیندانی والی سادق پاشاوە.

گرتووخانەکە شوێنێکی پەڕپووت بوو، سەدان دیل خزێندرابوونە ژووری بچووک و شێدار و داڕووخاوەوە. لەوێدا دەستە دەستە مرۆڤم بۆ پێڕەوکردنی پیشەی نوێم دەدۆزییەوە و زۆربەشیانم چاک کردەوە. ڕەچەتەم بۆ ئەو پاسەوانانە دەنووسی کە ئازاری پشت و ڕانیان هەبوو. بەمجۆرە، جارێکی تریش منیان لەوانی دی جیا کردەوە و برامە ژوورێک تیشکی هەتاو بەباشی دەیگرتەوە. بارودۆخی خۆم لەگەڵ ئەوانی دیدا بەراورد دەکرد و دەکۆشام سوپاسی خوا بکەم، تا بەیانیانێک منیشان لەگەڵ ئەوانی تر لە خەو هەڵساند و گوتیان دەبێت بۆ کار بڕۆم. گوتم پزیشکم و لە نۆشداری و زانست تێ دەگەم، کەچی گاڵتەیان بەقسەکانم هات. دەگوترا دیواری باخچەی والی بەرز دەکرێتەوە و پێویستیان بە کرێکار هەیە. بەیانیان بەر لە خۆر هەڵهاتن، زنجیر دەخرایە دەست و پێمان و دەبراینە دەرەوەی شار. بەدرێژایی ڕۆژ بەردمان گرد دەکردەوە، لای ئێوارە دیسان زنجیر دەخرایەوە دەست و پێمان و بەپێکەوە گرێدراوی بۆ زیندان دەبراینەوە. لە ڕێی گەڕانەوەماندا، دەمبینی ئەستەنبوڵ شارێکی دڵگیرە، بەڵام بیرم بۆ ئەوە دەچوو پێویستە مرۆڤ لێرە ئازاد و ئەفەندی بێت، نەک کۆیلە.

سەرباری ئەوەش، من کۆیلەیەکی ئاسایی نەبووم. ئیدی نەک بەتەنیا هەر بەهانای کۆیلە داڕزاوەکانی زیندانەوە دەچووم، بگرە بەهۆی کارەکەمەوە وەک پزیشک کەسانی تریشم تیمار دەکرد. ناچار دەبووم بەشی زۆری ئەو پووڵەی لە پیشەی پزیشکی دەستم دەکەوت، بدەم بەو پاسەوان و چاودێری کۆیلانەی کە بەدزییەوە مۆڵەتیان دەدا بچمە دەرەوە. ئەو دراوەی لەوانیشم دەدزییەوە، دەمدا بەدەرزی زمانی تورکیدا. مامۆستاکەم، پیاوێکی باش و بەتەمەن بوو، بەکارە بچووکەکانی والی ڕادەگەیشت. شادمان دەبوو ئەگەر دەیبینی بەخێرایی فێری تورکی دەبم، دەیگوت لە ماوەیەکی کورتیشدا دەبێت بە موسڵمان. هەموو جارێک بەشپرزەیی کرێی دەرزەکانی لێم وەردەگرت.

لەبەرامبەر خۆراکی باشیشدا هەر پارەم دەدایێ، چونکە بڕیارم دابوو ئیدی باش خزمەتی خۆم بکەم.

ئێوارەیەکی تەماوی چاودێر خۆی کرد بەژوورەکەمدا و گوتی والی ئارەزووی بینینت دەکات. سەرم سووڕما، خرۆشام و دەسبەجێ خۆم پۆشتە و تەیار کرد. بیرم چوو بۆ ئەوەی یەکێک لە خزمە دەستڕۆیشتووەکانی نیشتمان، باوکم یان خەزووری پاشەڕۆژم، سەرانەی ڕزگارکردنی منیان ناردبێت. ئەو دەمەی بەکۆڵانە تەسک و پێچاوپێچ و تاریکەکانی نقومبووی ناو تەمدا ڕێگەمان دەبڕی، وام دەزانی ئێستا دەگەینە بەردەم ماڵی خۆمان، یان وەک ئەوەی لە خەو بێدار ببمەوە، ئەوانم لە پێش خۆمدا دەبینی. جاروباریش خەیاڵم دەچوو بۆ ئەوەی کەسێکیان دزیبێتەوە و ناردبێتیان بۆ ئازادکردنم. پێم وا بوو هەر لەو تەمەدا سواری کەشتیم دەکەن و دەمنێرنەوە بۆ وڵاتەکەم، بەڵام کاتێک گەیشتینە کۆشکی والی، حاڵی بووم هەروا بەئاسانی ڕزگارم نابێت. خەڵکەکەی دەرباری والی لەسەر پەنجەی پێ ڕێیان دەکرد.

سەرەتا برامە داڵانێک، پاش کەمێک چاوەڕوانی، برامە ژوورێک. مرۆڤێکی بچووک و خوێنشیرین لەسەر تەختێکی بچووک ڕاکشابوو، بەتانییەکیشی بەسەردا درابوو. کەسێکی کەتە و چوار شانە بەژوور سەرییەوە ڕاوەستابوو. کەسە ڕاکشاوەکە والی بوو. منی بانگ کردە لای خۆی. قسەمان کرد: کەمێک پرسیاری کرد. لە وەڵامدا گوتم: ڕاستییەکەی، من گەردووناسی، بیرکاری و کەمێک ئەندازیاریم خوێندووە، بەڵام سەرم لە پزیشکیش دەردەچێت و چەندین کەسم چاک کردووەتەوە. ئەو دەیپرسی و منیش هێشتا هەر لە وەڵامدانەوەدا بووم، گوتی بەو پێیەی هێندە بەخێرایی فێری تورکی بوویت، لەوە دەچێت کەسێکی ژیر بیت. درێژەی دایێ: نەخۆشییەکی هەیە، هیچ کام لە پزیشکەکانی تر بۆیان چارەسەر نەکراوە، ناوی منی بیستووە و دەیەوێت منیش تاقی بکاتەوە.

والی بەشێوەیەک کەوتە باسکردنی دەردەکەی، بەجۆرێک ناچار بووم باوەڕ بهێنم دوژمنەکانی ئەو لەکن خوا زمانیان لێ دابێت و ئەم دەردە لەسەر ڕووی

زەوی بەتەنیا بۆ ئەو هاتبێتە خوارەوە. کەچی نەخۆشیی ناسراو و باوی هەناسەتەنگیی هەبوو. زۆر بەباشی پرسیارم لێ کرد و لێی ورد بوومەوە. گوێم بۆ کۆکەکەی ڕاگرت، پاشان چوومە خوارەوە بۆ چێشتخانە و لەو شتانەی کەوتنە بەردەستم، دەنکۆڵەی نەعنایی سەوزم دروست کرد و شروێکی کۆکەشم گرتەوە. لەبەر ئەوەی والی لە ژەهراویکردن دەترسا، قومێکم لە شروبەکە خواردەوە و دانەیەکیشم لە دەنکۆڵەکان قوت دا. پێمی گوت بەوریایی و بێ ئەوەی کەس بمبینێت، لە کۆشک بچمە دەرێ و بۆ زیندان بگەڕێمەوە. چاودێر دواتر ڕوونی کردەوە: والی نەیویستوە پزیشکەکانی تر ئیرەییم پێ ببەن. ڕۆژی دواتریش چوومەوە، گوێم بۆ کۆکەکەی ڕاگرت و هەمان دەرمانم دایێ. هێندەی منداڵێک شادمان بوو بەو دەنکۆڵە سەوزانەی لە مستیم نابوون. دوای ئەوەی بۆ ژوورەکەم دەگەڕامەوە، بۆ چاکبوونەوەی دەپاڕامەوە و نزام دەکرد. ڕۆژی دواتر بای شەماڵ هەڵی کرد، هەوایەکی خۆش و نەرم، لەبەر خۆمەوە دەمگوت مرۆڤ ئەگەر نەشخوازێت، بەم هەوایە هەر چاک دەبێتەوە، بەڵام کەس نەینارد بەدوامدا.

دوای مانگێک، لە نیوەی شەودا بانگ کرام. والی لەسەر پێ بوو، قسەی دەکرد و چوست و چالاک دەینواند. گێڕایەوە چۆن بەسانایی و بێ ئەوەی هەناسە بدات، کەسێکی سەرزەنشت کردووە. منیش بەخۆشحاڵییەوە گوێم بۆی ڕاگرت. کامەران بوو بە بینینم، گوتی باری نەخۆشییەکەی سووک بووە و بە منیشی گوت پزیشکی باشیت. لێمی پرسی چیم لێی دەوێت؟ من دەمزانی یەکسەر ئازاد و بەڕێم ناکات؛ بۆیە گازندەم لە دەست ژوورەکەم و زنجیرەکانم کرد، گوتم دەتوانم خۆم بەنۆشداری، گەردووونناسی و زانستەوە سەرقاڵ بکەم و هاوکاریتان بکەم، بۆم گێڕایەوە بە خۆڕایی لە کاری گراندا ماندووم دەکەن. نازانم گوێی لە چەندی قسەکانم گرت و گوێی لە چەندی نەگرت. پاسەوانەکانیش بەشی زۆری ئەو چەردە پارەیەی والی لە کیسەیەکدا پێمی بەخشیبوو، لە دەستم فڕاند.

دوای هەفتەیەک، چاودێر لە شەودا هاتە ژوورەکەم و پاش ئەوەی سوێندم

بۆی خوارد هەڵنایەم، زنجیری دەست و پێمی کردەوە. هێشتا هەر دەبرام بۆ کـار، بەڵام ئیـدی سـەرگـەورەی دیلەکـان هەوڵیـان دەدا مـەیلم بەلای خـۆیاندا رابکشـێن. چاودێر دوای سێ رۆژ جلوبەرگی نوێی بۆم هێنا و تێ گـەیشـتم والی چاوەڕێم دەکات.

شەوانە لە کۆشکەکانەوە دەیاننارد بەدوامدا. رۆماتیزمی چەتە پیرەکانی دەریا و سکئێشـەی سـەربازە لاوەکـانم تیـمـار دەکـرد، ئەوانەی نەخـۆشـیی خرۆکیـان هەبوو، رەنگیـان پەڕیبوو، یان سەرئێشـەیان هەبوو، خوێنم لێیـان دەگرت. کوڕی یەکێک لە خزمەتکارەکان قسەی دەبزرکاند، شروبێکم کرد بە قوڕگیدا، دوای هەفتەیەک زمانی کرایەوە و شیعرێکی بۆم خوێندەوە.

زسـتـان بەو جـۆرە بەسـەرچوو. والی، چەند مـانگێک بوو هەواڵی منی نەپرسـیبـوو، لە سـەرەتای بەهاردا زانیم بە رەوە کـەشتـیـەکـانییـەوە بەرەو قـولایـیی دەریای سـپی بەڕێ کـەوتووە. یەک دوو کـەس لەوانەی بەدرێژاییی رۆژانی گەرمی هاوین ئاگایان لە خاکەساری و تووڕەیی من بوو، پێمیان گوت تۆ وەک پزیشک داهاتێکی باشت هەیە، بۆیە پێویست ناکات گازندە لە حاڵی خۆت بکەیت. کـۆنە کۆیلەیەکیش کە ساڵانێک لەوەوبەر چووبـووە سـەر ئاینی ئیسلام و ژنی هێنابوو، ئامۆژگاریمی کرد هەڵنەیەم. دەیگوت هەر کۆیلەیەک بەکەڵکی کاری ئەوان بێت، وەک ئەوەی لەگەڵ مندا دەیکەن، هەرگیز رێی پێ نادەن بۆ وڵاتی خـۆی بگەڕێتەوە. بەقسـەی وی، ئەگەر منیش وەک ئەو بچمە سـەر ئاینی ئیسلام، ئازاد دەبم و هیـچی تر. بیرم کردەوە رەنگە ئەم قسانەی بۆ ئەوە بێت زمانم تاقی بکاتەوە، بۆیە پێم گوت بەهیـچ جۆرێک نیازی راکردنم نییە. راستییەکی، نیاز نا، بگرە غیرەتم نەبوو. هەڵهاتووان، پێش ئەوەی زۆر دوور بکەونەوە، سـەرلەنوێ دەسـتگیـر دەکـرانەوە. ئەو بەدبەخـتـانە، دوای دارکاریکردن فڕێ دەدرانە ژوورەکانیانەوە، منیش شەوان دەچوومە کنیان و هەتوانم لە برینەکانیان دەدا.

لەگەڵ نێزیکبـوونەوەی پایزدا والی لە شـەڕی دەریا گـەڕایەوە و بە ئاگری تۆپ پێشـوازیـی لێ کرا. ویسـتی وەک سـاڵی رابردوو کـەیف و سـەفا بۆ شـار

بسـازێنێت، بەڵام ڕوون و ئاشکرا دیار بوو وەرزی هەڵمـەتی دەریای بەباشی بەسەر نەبردووە. توانیبوویان تەنیا ژمارەیەکی کەمیش دیل بۆ زیندان بهێنن. دواتر زانیمان: ڤینیسایییەکان شەش گەمیی والیان سووتاندبوو. بەخۆم گوت دەبێت ڕێیەک بدۆزمەوە و لەگەڵ دیلەکاندا بکەومە قسە بۆ ئەوەی هەواڵێکی نیشتمـان بزانم. زۆربەیان ئیسپـانی بوون: شـتگەلێکی بێدەنگ، نەزان و ترسنۆک بوون، داوای یارمەتی و پاڕانەوە بۆ خواردن نەبێت، تاقەتیان نەبوو باسی هیچ شتێکی تر بکەن. تەنیا دانەکیان سەرنجی منی ڕاکێشا: ئەمیان قۆڵی پەڕیبوو، بەڵام بە ئومێد بوو. دەیگوت هەمـان ڕووداو بەسـەر یەکێک لە باپیرەکانیشیدا هاتووە، پاشان ڕزگاری بووە و بەقۆڵە نەپەڕیوەکەی ڕۆمانێکی سوارچاکیی نووسیوە. خۆیشی باوەڕی وا بوو بۆ ئەوەی هەمـان شت بکات، ڕزگاری دەبێت. دواتر، ئەو ساڵانەی لە پێناوی ژیاندا چیرۆکم دەخوڵقاند، ئەو پیاوەم بیر کەوتەوە کە لە پێناوی چیرۆک خوڵقاندندا بیری لە ژیان دەکردەوە. هێندەی نەبرد پەتایەکی کوشندە بەزینداندا تەشەنەی کرد، بە نقومکردنی پاسەوانەکان لە بەرتیلدا خۆم لەو پەتا چاوەڕوان نەکراوە پاراست. پەتاکە، پاش ئەوەی نیوەی کۆیلەکانی کوشت، ئەوسا ڕۆیشت و بڕایەوە.

دەستیان کرد بەناردنی ڕزگاربووەکان بۆ سەر کاری نوێ. من نەدەچووم، ئێـواران دەیانگوت تا ئەوبەری کەنداوی زێڕینی ئەستەنبوڵ دەڕۆن، لەوێ دەخرێنە ژێر فەرمانی وەستایانی دارتاش، بۆیاخچی و بەرگدروو، کاری بەردەستییان پێ دەکەن بۆ دروستکردنی کەشتیی و قەڵا و قووله لە کارتۆن. دواتر زانیمان، والی، کچی باشوەزیر بۆ کوڕەکەی دەهێنێت و بەنیازە زەماوەندێکی ڕازاوە ساز بکات.

بەیانییەک لە کۆشکی والییەوە بانگ کرام. بەدەم بیرکردنەوەوە لەوەی دیسان هەناسەتەنگیی سەری لێ هەڵداوەتەوە، کەوتمە ڕێ. والی سەری قاڵ بوو، پێم گوترا پێویستە چاوەڕێ بکەم. لە ژوورێک دانیشتم. پاش کەمێک، دەرگای تری ژوورەکە کرایەوە، یەکێکی پێنج شەش ساڵ لە خۆم بەتەمەنتر هاتە ژوورەوە، بە بینینی ڕووخساری، سەرم سووڕما، لەپڕ ترسم لێ نیشت!

## ٢

ئەوەی هاتە ژوورەوە، تا ڕادەی باوەڕ پێ نەکردن لە خۆم دەچوو. کتومت وەک ئەوەی خۆم لە وێدا بم! ئەوە یەکەم سەرنجم بوو. وەک بڵێیت کەسێک گەمەم لەتەکدا بکات و لە دەرگای بەرامبەر ئەو دەرگایەوەی لێی هاتبوومە ژووری، جارێکی تر بمکاتە ژووری و پێم بڵێت: بڕوانە، لە ڕاستیدا دەبوو تۆ وا بوایت، پێویست بوو بەو جۆرە لە دەرگاوە بێیتە ژوورەوە، دەبوو دەست و باسکت بەو شێوەیە بجووڵێنیت، پێویست بوو بەمجۆرە سەیری ئەوی دیی دانیشتووی ناو ژوورەکەت بکردایە! کاتێک نیگای چاومان یەکانگیر بوو، سڵاومان لە یەکدی کرد. بەڵام پێ نەدەچوو ئەو زۆر سەری سووڕمابێت. لەو کاتەدا هاتمە سەر باوەڕی ئەوەی هێندەش لە من ناچێت. ئەو گوڵمەیەک ڕیشی هەبوو، منیش وام بەخەیاڵدا هات لە مێژ بێت شێوەی ڕووخساری خۆم لە بیر چووبێت. لەگەڵ دانیشتنی ئەودا لە بەرامبەرم، بیرم کەوتەوە ساڵێکە سەیری ئاوێنەم نەکردووە.

ئەو دەرگایەی منی لێوە هاتبووم بەمدیودا، دوای کەمێک کرایەوە و ئەویان بانگ کردە ژووری. لە میانەی چاوەڕێکردنمدا وای بۆچووم ئەوەی دەیبینم، گەمەیەکی کارامە نییە، بگرە زادەی هۆشی شێواوی خۆمە. ئەو ڕۆژانە لەسەریەک بیرم دەکردەوە، خەونی دڵخۆشکەری وەک ئەوەی ئازاد دەکرام و بۆ ماڵ دەگەڕامەوە و هەمووان لە پێشوازیمدا بوون، یان هێشتا لە کابینەی خۆم لە کەشتیدا نووستبووم، دەبینی. بیرم کردەوە ئەم ڕووداوەش یەکێک بێت لەو داستانانە و بەدی هاتبێت، یان نیشانەیەک بێت بۆ گەڕانەوەی هەموو شتێک بۆ دۆخی جاران. لەو ساتەدا دەرگا کرایەوە و بانگ کرامە ژوورەوە.

والی کەمێک لەولای هاوشێوەکەمەوە بەپێوە ڕاوەستابوو. ڕێی پێم دا

دامێنی کەواکەی ماچ بکەم و لە هەواڵمی پرسی. ئارەزووم دەکرد بێزاریم لە ژوورەکەی خۆم و ویستی گەڕانەوەم بۆ نیشتمانی بۆ باس بکەم، کەچی ئەو هەر گوێشی لێم نەگرت. بیری کەوتبووەوە پێم گوتووە سەرم لە زانست، گەردووناسی و ئەندازیاری دەردەچێت، پرسیاری کرد داخۆ شارەزاییم لە باروت و ئەو فیشەکانەدا هەیە کە بۆ ئاسمان هەڵدەدرێن؟ یەکسەر گوتم سەری لێ دەردەکەم، بەڵام کاتێک نیگام کەوتە سەر ڕووخساری کەسەکەی تر، گومانی ئەوەم کەوتە دڵەوە ئەمانە تەڵەیەکم بۆ بنێنەوە.

والی دەیگوت زەماوەندەکەیان بێ وێنە دەبێت. بەنیازیش بوو دەستوور بدات بەزمی فیشەک هەڵدان ساز بکرێت، بەڵام پێویستە بەزمێک بێت لە هیچ ڕوویەکەوە لەوانی ڕابردوو نەچێت. هاوشێوەکەم کە والی تەنیا بە "خۆجە" ناوی دەبرد، لە ڕابردوودا لەگەڵ ئاگربازێکی مالتاییی ماوەیەک لەوەوبەر کۆچکردوو لە ئامادەکردنی جەژنی لە دایکبوونی سوڵتاندا کاری کردبوو، کەمێک سەری لەو کارە دەرچوو. والی بیری کردبووەوە لەوانەیە منیش بتوانم هاوکاری بکەم و پێی وا بوو تەواوکەری یەکترین! ئەگەر نمایشێکی باشیش ئامادە بکەین، ئەوا بە خەڵاتکردنمان کامەرانمان دەکات. لە دڵی خۆمدا گوتم کاتی هاتووە و لەوەدا بوو تکا لە والی بکەم مۆڵەتم بدات بۆ نیشتمان بگەڕێمەوە، ئەو پێش من کەوت و لێمی پرسی داخۆ لەو کاتەوەی هێندراومەتە ئێرە، لەگەڵ ژناندا نووستووم، یاخۆ نا؟ دوای زانینی وەڵامی من، گوتی ئەگەر ئەو کارە نەکەیت، ئیدی ئازادی بەکەڵکی چی دێت. لەو باسەدا هەمان وشە و دەستەواژەکانی سەر زمانی پاسەوانانی بەکار هێنا . منیش دەبوو گێژ و وێژ سەیری دەم و لەوچی بکەم، لەپڕ قاقایەکی بەرزی لێ دا . دوایی ڕووی لەو هاوشێوەیەم کرد و پێی گوت "ئیدی لێپرسراویی ئەم کابرایە لە ئەستۆی تۆدایە . هاتینە دەرەوە.

دەمەوبەیانی لە ڕێگەی گەڕانەوەماندا بۆ ماڵی هاوشێوەکەم، بیرم کردەوە هیچ شتێکم نییە فێری ئەوی بکەم، بەڵام زانستی ئەویش لە هی من زیاتر نەبوو. کەچی زانیارییەکانی هەردووکمان یەکیان دەگرت: هەموو گرفتمان

چۆنیەتیی بەدەستهێنانی تێکەڵەیەکی کافووری بوو. ئەوەی دەبوو بۆ ئەو مەبەستە بیکەین، ئامادەکردنی تێکەڵەیەک بوو بە تەرازوو، و پێوانە دەمانکێشا، شەوانە لە بن دیوارەکانی شووری شاردا گڕمان تێ بەردەدا و لەوەی دەمانبینی، ئەنجامەمان وەرگیردەخست. لە کاتێکدا دەستوورمان بە پیاوەکانمان دەدا بە بەرچاوی ئەو منداڵانەوە، ئەوانەی بە واقوڕمانەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، ئاگر لە فیشکە ئامادەکراوەکانمان بەربدەن، ئێمە، وەک ئەوەی ڕۆژانێکی زۆر دواتری ئەو ڕۆژگارە لەبەر تیشکی هەتاودا بۆ دروستکردنی چەکێکی لە ئەقڵ بەدەر کارمان دەکرد، دەچووینە ژێر دارە تاریکەکانەوە و بەجۆش و خرۆشەوە چاوەڕێی ئەنجامەمان دەکرد. دواتر، من جاروبار لەبەر تیشکی مانگ و هەندێک جاریش لە تاریکایی ئەنگوستەچاودا دەکۆشام ئەوەی دەیبینم لە دەفتەرێکی بچووکدا تۆماری بکەم. شەوانیش، پێش ئەوەی لە یەکدی جیا ببینەوە، دەچووینەوە بۆ ماڵەکەی خۆجە لە بەرزاییی سەرووی کەنداوی زێڕین و بە دوور و درێژی لە بارەی ئەنجامەکانەوە دەدواین.

ماڵەکەی بچووک، ژار و ناحەز بوو. ڕێی خانووەکە کەوتبووە سەر کۆڵانێکی پێچاوپێچ. ئاوێکی قرێژ کە هەرگیز نەمتوانی بزانم لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت، کۆڵانەکەی کردبوو بەقوڕ و لیتە. هیچ کەلوپەلێک لە ماڵەکەدا نەبوو، لە هەموو چوونە ژوورەوەیەکمدا دڵم دەگیرا و بێزار دەبووم. پێم وا بێت سەرچاوەی ئەم هەستەم دەگەڕایەوە سەر ویستی ئەو پیاوەی داوای لێم دەکرد بە "خۆجە" بانگی بکەم، چونکە حەزی لە ناوی لە باپیرییەوە بۆ بەجێماوی نەبوو. چاودێریی منی دەکرد، وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی بیەوێت شتێکم لێوە فێر بێت، بەڵام ئەو کاتە نەیدەزانی ئەو شتە چییە. بەهۆی ئەوەی نەمدەتوانی لەسەر دانیشتن لەپاڵ سەرینە ڕیزکراوەکانی بن دیوار خۆم ڕابهێنم، لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا من بەپێوە ڕادەوەستام، جارجاریش بەتووڕەیی ئەمسەر و ئەوسەری ژوورەکەم دەپێوا. وا بزانم خۆجە حەزی لەم ڕەفتارەم دەکرد. ئەو دادەنیشت. بەو جۆرە، تەنانەت

ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی لاوازی چرایەکیشدا بوایە، تێر و پڕ سەیری منی دەکرد. نیگاکانی و هەست نەکردنی بەلێکچوونی نێوانمان، منی نیگەران دەکرد. یەک دوو جار وای بۆچووم پەی بە لێکچوونی نێوانمان بردبێت، بەڵام خۆی وا پیشان دەدات وەک ئەوەی هەستی پێ نەکردبێت. بەجۆری ئەوەی بیەوێت گەمەم لەتەکدا بکات، دەیخستمە بەردەم تاقیکردنەوەیەکی بچووک و هەندێک زانیاریی بە من نامۆی وەگیردەخست. ڕۆژانی سەرەتا بەردەوام بەو جۆرە بۆمی دەڕوانی: وەک ئەوەی شتێک فێر بێت و لەگەڵ فێربوونیشدا زیاتر ماخۆلانی پێ کەوتبێت، بەڵام وا دیاربوو بەگومان بوو لە هەنگاو هاویشتن بەرەو قووڵکردنەوەی ئەو زانستە نامۆیە. ئا ئەم دابڕانە بوو ماڵەکەی لە خۆیدا نوقم دەکرد و منیشی دڵتەنگ دەکرد! ئەگەرچی شەرمنیی ئەو بوێریی بە من دەبەخشی، بەڵام سەبووری نەدەدامەوە. جارێکیان لە کاتی قسەکردندا دەربارەی تاقیکردنەوەکانمان، دووبارە پرسیاری کرد بۆچی هێشتا نەبووم بە موسڵمان. حاڵی بووم دەیەوێت بۆ گفتوگۆیەکی ناپاشکرا بەکێشم بکات، بۆیە بێدەنگ بووم و ددانم بە خۆمدا گرت. هەستی بە نیگەران بوونم کرد، تێ گەیشتم بە چاوی سووک تەماشام دەکات و ڕکی لێم دەبێتەوە، ئەمەش منی تووڕە دەکرد. تەنیا شتێک کە هەردووکمان لەو ڕۆژانەدا لەسەری کۆک بووین: نەفرەتکردنی هەردووکمان بوو لە یەکتر. ددانم بەخۆمدا دەگرت و لە دڵی خۆمدا دەمگوت با ئەم بەزمی ئاگربازییە بێ گرفت و بەڵا ساز بکرێت بۆ ئەوەی ئێ ئەمە خوایە مۆڵەتم پێ بدرێت بگەڕێمەوە وڵاتی خۆم.

شەوێکیان، خۆجە بەجۆشی سەرکەوتنی هەڵدانی فیشەکێکەوە بۆ بەرزاییەکی پێوانەیی، گوتی: ڕۆژێک دێت فیشەکێک دروست بکەم تەنانەت بگاتە مانگیش، بەڵام تاکە گرفت دۆزینەوەی تێکەڵەی پێویستی باروووت و لە قاڵبدانی کۆکایەک بوو بۆ گواستنەوەی ئەو تێکەڵەیە. پێم گوت مانگ زۆر دوورە، کەچی قسەکەی پێم بڕی. ئەویش دەیزانی مانگ لە ئێمەوە زۆر دوورە، بەڵام دەیگوت مەگەر نێزیکترین ئەستێرە نییە لە زەوییەوە؟ کاتێک بۆچوونەکەیم سەلماند، پێم وا بوو ئارام دەبێتەوە، کەچی زیاتر ئۆقرەی لێ بڕا،

بەڵام هیچ شتێکی تری نەگوت.

دوای دوو ڕۆژ، لە نیوەشەوێکدا پرسیاری کرد: چۆن توانیومە هێندە دڵنیا بم لەوەی مانگ نزیکترین ئەستێرەیە لە زەوییەوە؟ پێی وا بوو هەردووکمان تووشی هەڵەی بینین بووبین. ئەو کاتە بۆ یەکەمجار باسی ئەو دەرزانەی گەردوونناسیم بۆ کرد کە پێشتر فێریان بووبووم و بەکورتی باسی ڕێسا بنەڕەتییەکانی پەتلیمۆسم سەبارەت بە کۆسمۆگرافی بۆی ڕوون کردەوە. چاوم پێوەبوو بەپەرۆشەوە گوێی بۆم ڕاگرتبوو، بەڵام بۆ شاردنەوەی پەرۆشییەکەی، خۆی لە قسەکردن دەدزییەوە. کەمێک دواتر و دوای بێدەنگبوونی من، گوتی ئەویش زانیاریی لە بارەی پەتلیموسەوە هەیە، بەڵام ئەمە هیچ لەو گومانانەی کەم ناکاتەوە سەبارەت بەهەبوونی ئەستێرەیەکی نزیکتر لە مانگ لە دەوری زەویدا. تا دەمەویەیانی سەبارەت بەو ئەستێرەیە و نیشانەکانی هەبوونی، وەک ئەوەی لە ئێستاوە دۆزیبێتییەوە، دوا.

ڕۆژی دواتر، کتێبێکی بە دەستنووسێکی خراپ نووسراوەی دایە دەستم. سەرەڕای تورکییە ناتەواوەکەم، زانیم باسی چ دەکات: خودی ئالماگاست نا، بگرە دووەم پوختەی دەرهێندراوی کورتکراوەیەکی تری بوو. ئەوەی بەلای منەوە مایەی سەرنج بوو، ناوی هەسارەکان بوو بە عەرەبی، بەڵام لەوە نەدەچوو لەو ساتەدا ئەوەشم لەکن گرینگ بووبێت. کاتێک خۆجە بینی کتێبەکە سەرنجمی ڕانەکێشا و لە گۆشەیەکدا دام نا، تووڕە بوو. ئەو بەرگەی بە حەوت زێڕ کڕیبوو. بەڕای ئەو، ڕاستتر وا بوو دەستبەرداری لووتبەرزیی خۆم بومایە، پەڕەکانیم هەڵبدایاوە و چاوێکم پێیاندا بگێڕایە. وەک قوتابییەکی زیرەک سەرلەنوێ و بە ئارامی پەڕەکانی کتێبەکەم ئەمدیو و ئەودیو کرد، نیگام کەوتە سەر هێڵکارییەکی سەرەتایی. هەسارەکان بەهێڵی سادە و بەپێی دوورییان لە زەوییەوە کێشرابوون و لە خولگەکاندا جێگیر کرابوون. گەرچی شوێنی خولگەکان ڕاست بوون، بەڵام نیگارکێش هیچ بیرۆکەیەکی دەربارەی مەوداکانی نێوانیان نەبووە. دواتر، لە نێوان مانگ و زەویدا هەسارەیەکی بچووکم بەرچاو کەوت؛ بە کەمێک سەرنج لێدانەوە و بە

تازەیی مەرەکەبەدا بۆم دەرکەوت دواتر بۆ دەستنووسەکە زیاد کراوە. دوای ئەمدیو و ئەودیوکردنی دەستنووسەکە تا کۆتایی، دامەوە خۆجە. پێمی گوت ڕژدە لەسەر دۆزینەوەی ئەو ئەستێرەیە. هیچ لەوەش نەدەچوو گاڵتە و شتی لەو جۆرە بکات. من هیچم نەگوت. بێدەنگییەک هاتە ئاراوە، هێندەی بۆ من ترسناک بوو، بۆ ئەویش سامناک بوو. لەبەر ئەوەی هیچ فیشەکێکی ترمان نەگەیاندە ئاستێکی هێندە بەرز قسە بهێنێتەوە سەر گەردوونناسی، ئیدی جارێکی تر ئەو بابەتەمان نەکردەوە. سەرکەوتنە بچووکەکەمان وەک ڕێککەوتێک مایەوە و ڕازەکەیمان بۆ ئاشکرا نەبوو.

بەڵام ئەنجامی باشمان لە بواری ڕووناکی و تینی ئاگر و درەوشانەوەدا بەدەست هێنا و ئیدی نهێنیی سەرکەوتنەکەشمان دەزانی. خۆجە دووکان بە دووکانی عەتارفرۆشییەکانی ئەستەنبوڵ دەگەڕا. لە یەکێکیاندا، بێ ئەوەی ناوی یارۆی خاوەن دووکان بزانێت، تۆزێکی دۆزیبووەوە. ئەم تۆزە زەرباوە درەوشانەوەیەکی بێ وێنەی هەبوو، گوتمان هەبێت و نەبێت تێکەڵەیەکە لە گۆگرد و سولفات. دواتر و بەمەبەستی ڕەنگ بەخشین بە درەوشانەوەکە، هەرچیمان بەخەیاڵدا هات لەگەڵ تۆزەکەدا تێکەڵمان کرد، بەڵام جگە لە ڕەنگی قاوەیی و سەوزێکی کاڵی لەیەکچوو، هیچ ئەنجامێکی ترمان دەستگیر نەبوو. بە قسەی خۆجە، ئەوەی ئێمە کردبوومان، تا ئەو ساتە باشترین شتێک بوو لە ئەستەنبوڵدا کرابێت.

بەزمی شەوی دووەمی زەماوەندەکەش هەروا بوو، هەمووان هەمان شتیان دەگوتەوە، تەنانەت دوژمنانیشمان کە لە پشتەملە تەپکە و داویان بۆمان دەنایەوە و دەیانویست پیشەکەمان لێ بدزن، لەسەر هەمان ڕا بوون. گوتیان سوڵتان بۆ سەیرکردنمان لەوبەری کەنداوی زێڕینەوە دێتە لامان و من زۆر پەشۆکام. زراوم لەوە تۆقیبوو هەڵەیەک ڕووبدات و تا چەندین ساڵی تر نەتوانم بۆ وڵاتی خۆم بگەڕێمەوە. لەگەڵ ڕاگەیاندنی فەرمانی دەست بە کاربووندا، من تکا و نزای زۆرم کرد. بۆ بەخێرهێنانی میوانەکان و خۆ ئامادەکردن بۆ بەزمی ئاگربازی، سەرەتا فیشەکی بێ ڕەنگمان گڕ دا.

یەکسەر بەدوای ئەوەدا بەشێوەیەک کە من و خۆجە ناومان لێ نابوو "ئاش"، جێمان گرت. ئاسمان لەپڕ ڕەنگی سوور و زەرد و سەوزی گرت، ناڵەیەکی ترسناکی هەبوو، زۆریش جوانتر بوو لەوەی پێشتر پێشبینیمان کردبوو. فیشەکەکان، پاش هەڵدانیان بەدەوری خۆیاندا دەخولانەوە و دەخولانەوە، پاشان لەپڕ دەوەستان و دەوروبەری خۆیان وەک ڕۆژ ڕووناک دەکردەوە. بۆ ساتێک هەستم کرد لە ڤینیسیام. تەمەنم هەشت ساڵان بوو، جاری یەکەمم بوو بچمە سەیری پێشاندانێکی لەو جۆرە و وەک ئێستا ناشاد بووم، چونکە جلە سوور و تازەکەمیان لەبەر خۆم نەکردبوو، بگرە کرابووە بەری برا گەورەکەم، چونکە ڕۆژێک پێشتر لە شەڕێکدا جلوبەرگەکانی دڕێندرابوو. فیشەکەکان هەمان درەوشانەوەی سووری لە جۆری جلوبەرگە پڕ لە کوژەکەکانی منیان هەبوو، بەڵێ، ئەو جلوبەرگەی ئەو شەوە بۆم نەبوو بیپۆشم و سوێندیشم خواردبوو ببڕاییبێ لەبەری نەکەم. ڕەنگی قۆپچەکانیش لە هەمان ڕەنگی جلەکان بوو. جلەکانیش کەمێک بە بەری کاکم تەنگ بوون.

پاشان دەستمان کرد بە جووڵەیەکی تر و بە "کانی" ناومان دەبرد. لە دەلاقەی تاقێکەوە بەبەرزاییی بالای پێنج پیاو دەست کرا بە ڕژاندنی گڕی ئاگر. بە دڵنیاییەوە، خەڵکانی کەناری ئەوبەر، گڕ و بڵێسەی ئاگرەکەیان زۆر باشتر بینیوە. دەبێت لەگەڵ دەربەڕینی فیشەکدا لە دەمی تاقەکەوە هێندەی ئێمە بەخرۆش کەوتبن، بەنیازیش نەبووین لە جۆش و خرۆشیان کەم بکەینەوە. کەڵەکەکانی ناو کەنداوی زێڕین دەستیان بە جووڵە کرد. سەرەتا، قووله و قەڵا لە کارتۆن دروستکراوەکان کە لە بورجەکانیانەوە فیشەک دەردەپەڕی، گڕیان گرت و بەسەریەکدا ڕووخان. ئەمانە پێشاندانەوەی سەرکەوتنەکانی ساڵانی ڕابردوو بوون! ئەو کاتەی نۆرە هاتە سەر تێپەڕینی کەشتییەکانی ساڵی بە دیلگرتنی من، کەشتییە چارۆکەییەکەی ئێمە لەلایەن ئەوانی ترەوە درایە بەر دەستڕێژی فیشەک. بەمجۆرە من جارێکی تر هەمان ڕۆژی بە دیل گرتنم ژیامەوە. بینەرانی کەنارەکانی ئەمبەر و ئەوبەر لەگەڵ سووتانی کەشتییەکان و نوقمبوونیاندا هاواریان دەکرد: "ألله، ألله!" دواتر هێدی هێدی نۆرە هاتە

سەر ئەژدیهاکانمان، لە کونی لووت و دەم و گوێیانەوە گڕی ئاگر دەردەچوو. دامانن بە شەڕدا. بەپێی نەخشەیەکی پێشتر دانراو، سەرەتا هیچ کامیان نەیدەتوانی بەسەر ئەوانی تردا زاڵ بێت. بەو فیشەکانەی لە کەنارەوە هەڵمان دەدان، هێندەی دی هەوامان گەرم کرد. دواتر، پاش ئەوەی ئاسمان کەمێک تاریک بوو، پیاوەکەنمان لە کەڵەکەکاندا چەرخەکانیان خستە کار و هێدی هێدی دەستیان کرد بە بەرزکردنەوەی ئەژدیهاکان بۆ ئاسمان. خەڵکەکە، ئیدی لەبەر سەرسووڕمان و لە ترساندا کەوتنە ژاوەژاو و هاتوهاوار. هەر ئەوەندەی ئەژدیهاکان بە ناڵە و دەنگی بەرزەوە کەوتنە گیانی یەکدی، بەجارێک هەموو فیشەکی ناو کەڵەکەکان گڕ دران. ئەو مەشخەڵانەی لە ناو جەستەی بوونەوەرە دەستکردەکانی خۆماندا شاردبوومانەوە، دەبوو لە ساتێکدا گڕیان بگرتایە، بەجۆرێک وەک خۆمان نەخشەمان بۆ داڕشتبوو، هەموو ئەو ناوەیان بکردایە بە دۆزەخ. ئەگەر گوێم لە منداڵێک بوو لە نێزیکمانەوە زۆرەزۆر دەگریا، لە سەرکەوتنی خۆمان حاڵی بووم، چونکە باوک ئاگای لە کوڕی خۆی نەمابوو، دیار بوو حەپەساوە و بە دەمی داچەقیوەوە سەیری ئاسمانی سامناکی دەکرد. خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی ئیدی بۆ زێدی خۆم دەگەڕێمەوە. لە ناو ئەو دۆزەخەدا کە باسم کرد، پەیکەرێک، من ناوم لێینابوو "ئیبلیس"، بێ ئەوەی کەس چاوی پێوە بێت، چووە ژێر کەڵەکێکی ڕەش و بچووکەوە. ئەوەندەمان فیشەک لێ بار کردبوو، بەجۆرێک ترسی ئەوەمان هەبوو بە پیاوەکانی سەریشییەوە بە ئاسماندا ببات، بەڵام کارەکان بەباشی چوونە پێش. دوای ئەوەی بڵێسەی ئاگری ئەژدیها بە شەڕهاتووەکان کوژایەوە و دیار نەما، ئیبلیسەکە لەگەڵ فیشەکی لەپڕ گڕگرتوودا بۆ ئاسمان دەرپەڕی. پاشان بەهەموو جەستەی خۆیەوە لە ئاسمان بە تەرەقەکانی ناوییەوە تەقییەوە و بەهەر چوار لادا تۆپەڵی ئاگری پەخش کرد. بۆ چرکەیەک پەشۆکام و هەستم کرد هەموو ئەستەنبوڵمان نوقمی تۆقین و ترس کردووە. وەک بڵێیت خۆیشم ترساندبێت، جۆری ئەوەی بوێرانە دەستم کردبێت بەو شتانەی دەمویست لە ژیاندا بیانکەم، وێنەی ئەوەی لەو ساتەدا هیچ باکم نەبێت لە چ

شــارێکدام، ئارەزووم دەکــرد ئیــبلیــســەکــە بەدرێژاییی شــەو، لەوێ، بەهەڵواسـراوی بە ئاسمـانەوە گڕ و ئاگری بەسەر ئامادەبوواندا بڕژاندبایە. کەچی دوای کەمێک لەرینەوە بەلای ڕاست و چەپدا و بێ ئەوەی زیان بە کەس بگەیەنێت، هـاوڕێ لەگەڵ هاواری خۆشـی و جۆشـی بینەرانی هەردوو کەناردا کەوتە ئاوی کەنداوی زێڕینەوە. لە کاتی نغرۆبوونیشی لە ئاودا، هێشتا گڕی لێ هەڵدەسا.

ڕۆژی دواتر، والی، کتومت وەک ئەوەی لە ئەفسانەکانـدا دەگێڕدرێتـەوە، بە خۆجەدا کیسـەیەک زێڕی ناردبوو. گوتبووی زۆر لە کارەکەمان ڕازی بووە، بەڵام گلەییی لە سـەرکەوتنی ئیبلیس هەیە. ماوەی دە ڕۆژی تریش درێژەمان دا پێشـاندانی بەزمی ئاگربـازی. بەڕۆژ قاڵبەکانمان دادەڕشتەوە، نەخشـەمان بۆ کــەمـــەی نوێ دادەڕشـت و بەو دیلانـەی لە زینداـنەکـــانەوە دەهـێندران، فیشـەکمان دادەگرتەوە. دیلێک، دە توورەکە باروتی گڕ دا، دەموچاوی سووتا و کوێر بوو.

لە دوای تەواوبـوونی بەزمی زەمـاوەند، ئیـدی خـۆجـەم نەدەبینی. ئاسـوودە بووم بە ڕزگـاربوونم لە چاوە پڕ لە ئیـرەییـیەکـانی ئەو پیـاوە پەڕۆشـەی کە لە کزنگی بەیانـەوە تا خـۆرنشین چاودێریی منی دەکرد، بەڵام درۆیە ئەگـەر بڵێم هۆشم بەلای ئـەو ڕۆژە پڕ لە جـووڵە و بزاوتانـە نەبوو کە لەگەڵ ئەودا بەسـەرم بردبوون. ئەگـەر کـەڕابامــەوە وڵاتی خــۆم، باسی ئـەم پیـاوەم بۆ هـەمـووان دەگێڕایەوە، ئەگـەرچی سـەرباری ئەو هەمـوو لێکچـوونەی نێوانمـان تەنانەت وشـەیەکـیــشی لەو بارەیەوە نەدەدرکـاند. لە ژووری خـۆم دادەنیـشـتم و بۆ بەسـەربردنی کـات نـەخۆشـەکـانم دەپشکنی. ڕۆژێک بیـسـتم والـی لە دوومی ناردووە، بەهەسـتێکی پڕ لە جۆش و شـادی و بە پەلەپرووزێ ڕۆیشـتم. سەرەتا بەپەلە زۆر بە شـان و باڵی منیدا هـەڵدا. پاشـان گوتی هەمـووان لە تەدارەکی ئاگربازییەکە ڕازی بوون، گوایە من زۆر بەهرەمەندم و شتی تری لـەو جۆرەی گـوت. دواتر لەپڕ گـوتی: "ئەگـەر ببیت بە مـوسـڵمـان، ئەوا لە جـێدا ئازادت دەکـەم." سـەرم سـووڕمـا، گـیـژ و وێژ بووم، گـوتم دەمــەوێت بۆ وڵاتی خـۆم

بگەڕێمـەوە، بەدەم گـێـژبوونـەوە زمـانم تەتەڵەی کـرد و بـە ناوهێنانـی دایکم و مـارەبڕەکـەم جـۆرێک لە بچـووکـیم نـواند. والی وەک ئەوەی هیـچ گـوێـی لە من نەبووبێت، دیسـان هـەمان شـتی دووبارە کردەوە. کـەمێک بێدەنگ بووم. نازانم بۆچی لەو کاتەدا ئەو هاوڕێ تەمـەڵ و شـووم و نەفرەت لێکراوانەی سـەردەمی منداڵیم بیر کـەوتنەوە کە دەسـتیـان لە باوکـانی خـۆیان بەرز دەکردەوە؟ دوای ئەوەی گوتم ئامـادە نیم ئاینی خـۆم بگـۆڕم، والی لێم چوو بە قـینداو گـەڕامـەوە ژوورەکەی خۆم لە زیندان.

دوای سـێ ڕۆژ، والی جـارێکی تر ناردییـەوە بەدوامـدا. ئەمـجـار کـەیفی سـاز بوو. لەبەر ئەوەی بۆم یـەکلایـی نەکرابووەوە داخـۆ ئاین گـۆڕینم هـەلی ڕاکـردنم بۆ دەخـوڵقێنێت، یاخـۆ نا، نەمتـوانیبوو لەو بارەیەوە بڕیاری کۆتایی بدەم. والی لە بۆچوونمی پرسـی، دەیگـوت لێرە بە دەستەکـانی خـۆی کـچێکی جوانکیلەم لێ مـارە دەکات! تاوێک ئـازایی بە گـیـانمدا گـەڕا و گـوتم من ئاینـی خـۆم ناگـۆڕم. والی کـەمێک سـەری سـووڕمـا، پاشـان گـوتی تۆ گـەوج و دەبەنگیت. پێی وا بوو کـەسـانێکی ئەوتۆ لە دەوروبەرەکـەمـدا نین دوای ئاین گـۆڕین ڕووم نـەیەت سەیری ڕووخسـاریان بکەم! دواتر کـەمێک باسـی ئیسلامی کـرد. من بێدەنگیم هـەڵبژارد، ئەویش دەسـتووری دا بۆ ژوورەکەم بەڕێ بکرێمەوە.

لە سێیەمین ڕۆیشـتنمـدا نەیانبردمە بەردەم والی. چاودێرێک لە بڕیاری منی پرسـی. ئـەگـەری ئەوە هـەبوو بڕیاری خـۆم بگـۆڕم، بەڵام لە وەڵامـی پرسـیـاری چاودێرێکدا نـا! گـوتم لەم کـاتەدا ئامـادە نیم بۆ گـۆڕینـی ئاین. چاودێر قـۆڵمی گـرت، بـردمیـە خـوارەوە و ڕادەسـتی کـەسێکی تری کـردم. ئەمـیـان پیـاوێکی باڵابەرز و درێژکـۆڵەی لەو بابەتە بوو کە پەیتـاپەیتا لە خـەونەکـانمدا دەمبینی. وەک ئـەوەی پارمـــەتی نەخـــۆشـــێک بدات، چـووە بن بـاڵمــــەوە و بـە بەزەیـی پێداهاتنەوە بردمی بـۆ گۆشەیەکی باخـچەی کۆشک. لەو سـاتەدا یـەکێکی تری کـەتە و زەبەلاحی نـەشـیـاو بۆ هـاتنە ناو خـەونەکـانم، لێم نزیـک کـەوتەوە. بەهـەردووکـیـان لەپاڵ دیوارێکدا ڕایانگرتم و دەسـتـەکـانمیـان بەسـتـەوە، یەکێکیـان تەورێکی بچـووکی بە دەسـتـەوە بوو. گـوتیـان والی دەسـتووری داوە

ئەگەر نەبیت بە موسڵمان، یەکسەر لە گەردنت بدەین. وەک بەرد لە شوێنی خۆمدا وشک بووم.

لە دڵی خۆمدا گوتم یەکجار وا بەپەلەش نابێت. بە بەزەییەوە بۆمیان دەڕوانی. هیچم نەگوت. ئارەزووم بوو هەر هیچ نەبێت جارێکی تریش لێم بپرسنەوە. دوای کەمێک پرسیاریان کردەوە. من لە ڕوانگەی خۆمەوە ئاینەکەم وەک شتێکی شایەن بەوەی گیانمی لە پێناودا بەخت بکەم، هاتە پێش چاو. بەم ڕەفتارەم، لە سەرێکەوە بەهایەکم بۆ خۆم دادەنا و لە سەرێکی ترەوە، جۆری ئەو جووتە کە بە پرسیارکردنی بەردەوامیان وەرگەڕانی منیان لە ئاین دژوار تر دەکرد، بەزەییم بە خۆمدا دەهاتەوە. زۆرم لە خۆم کرد بیر لە شتێکی تر بکەمەوە و ئەو دیمەنانەم هێنایەوە پێش چاوی خۆم کە لە پەنجەرەیەکی باخچەی پشتەوەی ماڵەمانەوە دەبیندران: خۆخ و گێلاس لەسەر سینییەکی گەوهەرڕێژی سەر مێزێک دانرابوون. لە پشت مێزەکەوە کورسییەکی لە حەسیر چندراو هەبوو. چەند سەرینێکی پەڕی باڵندەش لە هەمان ڕەنگی سەوزی چوارچێوەی پەنجەرەکە لەسەر کورسییەکە دانرابوون. لە دواتریش، ئەستێرکێکی ژێر بڕێک دار زەیتوون و گێلاسم دەبینی چۆلەکەیەک بە قەراغییەوە نیشتبووەوە. جۆلانەیەکیش بەلقێکی بەرزی دارگوێزێکی کەمێک دوورترەوە هەڵواسرابوو، هێدی هێدی بەدەم بایەکی نادیارەوە دەلەرایەوە. جارێکی تریش پرسیاریان کردەوە و منیش لە وەڵامدا گوتم ئاینی خۆم ناگۆڕم. کۆتەرە دارێک لەوێدا بوو، چۆکیان پێم دادا و سەرمیان خستە سەری. لە پێشدا چاوم نوقاند، بەڵام دوایی کردمەوە. یەکێکیان تەورەکەی بە دەستەوە گرت. ئەوی تریان گوتی لەوانەیە پەشیمان بووبێتەوە. ڕاستی کردمەوە. داوام لێ کرا کەمێکی تریش بیری لێ بکەمەوە.

من بیرم دەکردەوە و ئەوان لە پەنای کۆتەرە دارەکەدا دەستیان بە هەڵکۆڵینی زەوی کرد. بیرم بۆ ئەوە چوو هەر لەوێدا بمنێژن. سەرەڕای ترس لە مردن، ترسی زیندە بەچاڵکردنیش لە هەناومدا چەکەرەی کرد. لە دڵی خۆمدا دەمگوت هەتا ئەوان لە هەڵکەندنی گۆڕەکە دەبنەوە، من بڕیاری خۆم

دەدەم. کەچی ئەوان دوای هەڵکەندنی چاڵێکی بچووک، بەرەو لای من هاتنەوە. لەو ساتەدا بیرم کردەوە ئەوپەڕی گەمژەییە لێرە بمرم. بەنیاز بووم ببم بە موسڵمان، بەڵام کات بە دەستەوە نەمابوو. گوتم: "ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ ژووره خۆشەویست و پێ ڕاهاتووەکەی زیندانم، بەدرێژاییی شەو دادەنیشم و بیر دەکەمەوە. لەوانەیە تا بەرەبەیان بتوانم بڕیاری گۆڕینی ئاینەکەم بدەم؛ بەڵام نەک بەم پەلەپەلە."

یەکسەر هەڵگیرام، ناچار کرام دیسان بکەومە سەر چۆک. بەرلەوەی سەرم بخەنەوە سەر کۆتەرە دارەکە، کەسێکم لە نێوان دارەکانەوە بینی وەک ئەوەی بفڕێت، تێ دەپەڕی. سەرم سووڕما. کتومت وەک ئەوە وا بوو خۆم بم، ڕیشم هاتبێت و درێژ بووبێت و لەوێدا، بێ ئەوەی پێیەکانم بە زەوی بگەن، بە بێدەنگی بڕۆم بەڕێوە. بەخۆم گوت با بانگێکی ئەو دیمەنەی خۆم بکەم کە بەناو دارەکاندا دێت و دەچێت. دەنگم دەرنەچوو، سەرم بە کۆتەرە دارەکەوە نووسابوو. لەو ساتەدا بەوە دڵی خۆم دایەوە ئەوەی دوای کەمێکی تر بەسەرم دێت، لەگەڵ خەوندا جیاوازیی نابێت. چاوەڕێم کرد، پەراسووم و پشتم ڕچین، نەدەمویست بیر بکەمەوە، بەڵام بیرم دەکردەوە وا خەریکە لە سەرمان ڕەق هەڵدێم. دواتر بەرز کرامەوە و لە بن لێوەوە گوتیان: لەوانەیە والی زۆر تووڕە بێت! لەوێدا، لەگەڵ کردنەوەی بەندی دەستەکانمدا کەوتنە جنێودان پێم: منیان بە دوژمنی خوا و پەیامبەر دانا. برامەوە سەرەوە، بۆ کۆشک.

والی، دوای ئەوەی دامێنی کەواکەی خۆی پێم بە ماچکردن دا، کەوتە دڵدانەوەم. پێمی گوت لەبەر ئەوەی ئامادە بووم لە پێناوی نەگۆڕینی ئاینەکەمدا ژیانی خۆم ببەخشم، منی خۆش ویستوە، بەڵام هێندەی پێ نەچوو دەستی کردەوە بە قسەی بێ سەروبەر: بەڕای ئەو، من بەختوخۆڕایی کەللەڕەقیم نواندووە، ئیسلام ئاینێکی پیرۆزترە و شتی تری لەو بابەتە. ئەوەندەی گوت تا تووڕە بوو، سوور بوو لەسەر سزادانم. دواتر باسی ئەوەی کرد بەڵێنی بە کەسێکی تر دابێت. وای بۆچووم ئەو بەڵێنە لە هەندێک لەو خراپەکارییانەی بۆیان هەبوو بەسەرم بێن، ڕزگارم دەکات. ئەو کەسەی والی

بەڵێنی پێ داوە و لە میانەی قسەکانییەوە بۆم دەرکەوت کەسێکی سەیر و سەمەرەیە، دواجار تێ گەیشتم خۆجەیە. لەو ساتەدا والی ڕای گەیاند منی بەدیاری بە خۆجە بەخشیوە. سەرەتا، بێ ئەوەی زۆر تێ بگەم، سەیرم دەکرد. والی ڕای گەیاند: "تۆ لەم ساتە بەدواوە کۆیلەی خۆجەیت. بەڵگەنامەم داوەتێ، ئازادکردن و نەکردنت لە دەستی ئەودایە. لەمەوپاش ئەو ئازادە چیت لێ دەکات." والی لە ژوورەکە چووە دەرێ و ڕۆیشت.

خۆجەش لە کۆشک بوو، لە خوارەوە چاوەڕێی منی دەکرد. ئەو ساتە حاڵی بووم ئەو کەسەی لە ناو دارەکانی باخچەدا دیبووم، ئەو بووە. بە پێ ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەکەی. بە منی گوت هەر لە سەرەتاوە زانیویەتی من لە ئاینی خۆم وەرناگەڕێم. تەنانەت یەکێک لە ژوورەکانی ماڵەوەی بۆ من ڕێکخستبوو. پرسیاری برسی بوون و نەبوونی لێم کرد. هێشتا لە ژێر کاریگەریی ترسی مردندا بووم. لە ڕەوشێکدا نەبووم بتوانم شتێک بخۆم. لەگەڵ ئەوەشدا چەند پارووییەکم لەو نان و ماستەی ئامادەیان کردبوو، خوارد. کاتێک من پاروو‌ەکانم دەجوو، خۆجە بە شادمانییەوە سەیری دەکرد. وەک گوندییەک ئالیکی نابێتە بەردەم ئەسپێکی تازە لە بازاڕ کڕدراو و بەخۆشحاڵییەوە بیر لەو ئەرکانە بکاتەوە کە پێی ڕادەپەڕێنێت، بۆ منی دەڕوانی. تا ئەو ڕۆژەی منی فەرامۆش کرد و نوقمی وردەکاریی ئەو سەعات و بیردۆزەی کۆسمۆگرافییە بوو کە دەبوو پێشکێشی والیی بکات، من بەردەوام ئەو نیگایانەی ئەوم بیر دەکەوتەوە.

دواتر بە منی گوت دەبێت هەموو شتێکی فێر بکەم. هەر بۆ ئەوەش منی لە والی خواستووە و تەنیا دوای ئەوەش دەتوانێت ئازادم بکات. چەندین مانگم پێویست بوو تا تێ گەیشتم ئەو "هەموو شتە" چییە. "هەموو شتێک" ئەو شتانە بوون کە لە دەرزخانە و خوێندنگاکان فێر کرابووم، واتە گشت ئەو گەردووناسی، پزیشکی، ئەندازیاری و زانستەی لەوێ، لە وڵاتی خۆم فێریان ببووم! پاشان دەیویست بۆچوونم سەبارەت بە ناوەڕۆکی هەموو کتێبەکانی ژووری زیندانم بزانێت. ڕۆژی دواتر دەستووری دا بۆمیان هێنا. خوازیار بوو

هەرچی من لە بارەی ڕووبار، ئاسمان، هەور و ئۆقیانووسەکان و هۆکاری بوومەلەرزە و گرمەی هەورەوە بیستومە و بینومە، بزانێت... لە دەوروبەری نیوە شەودا گوتی: "لە هەموو شتێک زیاتر خولیای ئەستێرە و هەسارەکانم لە سەردایە." لە پەنجەرە والاکەوە تیشکی مانگ دەهاتە ژوورەوە. گوتی: "هەرچۆنێک بووە دەبێت بەڵگەیەک سەبارەت بەهەبوون یان نەبوونی ئەو ئەستێرە بچووکەی نێوان مانگ و زەوی بدۆزینەوە." پێویست بوو من بەدوو چاوی پڕ لە ترسی ڕۆژێکی تۆقێنراو بە مردنەوە لە لێکچوونی وەرسکەری نێوان هەردووکمانم بڕوانیبایە. خۆجەش ئیدی وشەی "فێربوون"ی بەکار نەدەهێنا: بگرە دەیگوت پێکەوە لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدەین، بەجووتە داهێنان دەکەین و هەردووکمان کار بەڕێوە دەبەین.

بەمجۆرە، وەک دوو برای باش، دوو قوتابیی گوێڕایەڵ و باش کە گەورەکانیان لە درزی دەرگاوە چاودێرییان دەکەن و لە کاتی ئامادەنەبوونی ئەوانیشدا لە ماڵەوە، ئەمان بە باوەڕەوە ئەرکەکانی خۆیان ڕادەپەڕێنن، دەستمان کرد بە کار. لە سەرەتادا من خۆم وەک برا گەورەیەکی نیازپاک هاتە بەرچاو کە ڕازی بوو لە پێناوی پیادا ڕاگەیشتنی برای تەمەڵیدا چاو بەهەموو زانیارییەکانی خۆیدا بگێڕێتەوە. خۆجەش وەک برایەکی زیرەک هەوڵی دەدا بیسەلمێنێت زانیارییەکانی کاکی هیچ نین. بە بۆچوونی ئەو، جیاوازیی زانایی نێوانمان تەنیا هێندەی ژمارەی ئەو کتێبانە بوو کە لە ژووری زیندانەوە بۆم هێندرابوون و ئەو چاوێکی پیایاندا گێڕابوو، یان بارتەقای ئەو بەرگە کتێبانە بوون کە بیرم کەوتبوونەوە. بە لێهاتوویی و زیرەکیی لە ڕادەبەری خۆی پەی بە زمانی ئیتاڵی برد -دواتر زۆر بەباشی فێربوو-. لە ماوەی شەش مانگدا هەموو کتێبەکانی منی خوێندەوە و وای لێم کرد هەرچیم بەبیر دەهاتەوە بۆم دەگێڕایەوە. کار گەیشتە ئەوەی ئیدی من هیچ بالادەستییەکم بەسەر ئەوەوە نەمابوو. بەلام بەجۆرێک ڕەفتاری دەکرد وەک ئەوەی زانستێکی هەبێت بێ بەهایی کتێبەکان تێ بەڕێنێت و سرووشتی و قوڵتر بێت لەو شتانەی فێریان بووە. شەش مانگ دوای دەست

بەکاربووونمان، ئیدی جووتێک نەبووین پێکەوە فێر بین و پێکەوە پێش بکەوین، بگرە ئەو بیری دەکردەوە، منیش تەنیا هەندێک وردەکاریی پێویستم بیر دەخستەوە، یان لە چاو گێڕانەوە بە زانیارییەکانیدا هاوکاریم دەکرد.

بەزۆری لە درەنگانی شەودا، دوای خواردنێکی سەرپێییانە و ئەو دەمانەی هەموو چرایەکانی گەڕەک دەکوژێندرانەوە و کشوماتی باڵی بەسەر دەوروبەردا دەکێشا، "بیرۆکەکان"ی خۆی بیر دەکەوتەوە. من ئێستا هیچیانم لە بیر نەماوە. بەیانیان لە قوتابخانەی مزگەوتێکی دوو گەڕەک دوورتری ئەولای گەڕەکی خۆمانەوە دەرزی بە منداڵان دەگوتەوە. دوو ڕۆژیش لە هەفتەدا دەچووە موەقیتخانەی مزگەوتی گەڕەکێکی دوور، من هەرگیز بۆ ئەو مزگەوتە نەچووبووم. پاشماوەی کاتەکانی تریشمان بە خۆئامادەکردن بۆ "بیرۆکە"کانی شەوی داهاتوو، یان بۆ تاوتوێکردن و گفتوگۆکردن لە بارەیانەوە تێ دەپەڕاند. لەو سەروبەندەدا بە ئومێدەوە باوەڕم دەکرد لە کاتێکی نێزیکدا بۆ وڵاتەکەم دەگەڕێمەوە. لەبەر ئەوەی دەترسام نەبادا ببێت بەهۆی دواکەوتنی گەڕانەوەم، بەهیچ جۆرێک دژایەتی "بیرۆکە"کانی خۆجەم نەدەکرد. زۆریش بەپەرۆشەوە گوێم بۆ وردەکارییەکانی ڕادەگرت.

بەو شێوەیە ساڵی یەکەممان لە گەردوونناسیدا بەسەر برد و تەواوی کاتمان تەرخان کرد بۆ گەڕان بەدوای بەڵگەی هەبوون، یان نەبوونی ئەو ئەستێرە خەیاڵییەی نێوان مانگ و زەویدا. لە سەروبەندی کارکردنمان بە ڕوانگە، ئامرازی گەردوونی و ئەو تەلیسکۆپانەی بە دروستکردنی دابوون و زەڕەبینەکانی بە پووڵێکی زۆر لە فلاندەرستان کڕدرابوون، خۆجە بابەتی ئەستێرەی خەیاڵیی لە بیر کرد. ئاشکرای کرد چووەتە ناو پرسێکی زۆر قووڵترەوە و دەیەوێت سیستەمی پەتلیموس بکات بە بابەتی گفتوگۆ. بەڵام گفتوگۆمان نەدەکرد، ئەو دەدوا و من گوێم بۆ ڕادەگرت: بێهوودە باسی خولگە ڕوونەکانی ئاسمان دەکرد و دەیگوت ئەستێرەکانیان پێوە هەڵواسراوە. دەیگوت لەوانەیە شتێکی تر لەوێ هەبێت ئەو ئەستێرانەی ڕاگرتبێت. لەوانەیە هێزێکی نەبیندراو بێت، بۆ نموونە هێزی کێشکردن. پاشان درێژەی دایێ و

گـوتی لەوانـەیە زەویش وەک خـۆر بە دەوری شـتـێکی تردا بسـووڕێتـەوە، لەوانەیشە هەموو ئەستێرەکان بە دەوری ناوەندێکی تردا کە ئێمە بە هەبوونی نازانین، بخولێنەوە. دواتر لافی ئەوەی لێ دا دەتوانێت لە پەتلیموس قوڵتر بیر بکاتەوە. بۆ بەدەستـهێنانی کۆسمۆگرافییەکی زۆر فراوانتر دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە هێشـوویەک ئەسـتـێـرەی نوێ و چەند بیـرۆدۆزمیەکـیـشی بۆ سیستەمێکی نوێ خستە بەردەست. دەشێت مانگ بە دەوری زەوی و زەویش بە دەوری خـۆردا بسـووڕێتـەوە و ڤینـۆسیش چەق بێت، بەڵام هێندەی نەبرد، لەمـانەش بێـزار بوو. دوای مـاوەیەک گوتی: "لەم کاتەدا گرفت خستنە رووی ئەم بیـرۆکانە نییـە، بگرە ناسـاندنـی ئەسـتێرەکان چۆنیـەتیی سـووڕانەوەیانە بەمانەی ئێرە و ئەمـەش لە والییەوە دەست پێ دەکات." لەم قسـە و باسـانەدا بووین هەواڵمـان بۆ هـات والی سـادق پاشـا بۆ ئـەرزەڕووم دوورخـراوەتەوە. دەگوترا لە پیلانێکی سەرنەکەوتوودا دەستی هەبووە.

ئەو سـاڵانەی چاوەڕێی گەڕانەوەی والیمان دەکرد لە تاراوگە، بەمـەبەسـتی نووسـینی لێکۆڵینەوەیەک سـەبارەت بە هۆکـارەکـانی ڕێژگـە و ئاوەڕۆی ئاوی تەنگەی بوسفۆر، چەندین مانگ لە هەوایەکدا کە کاری لە مۆخمان دەکرد، بە لێوارەکانی ئەمبـەر و ئەوبەری بوسفۆردا گەڕاین، سـەیری ڕێژگەی دەریامـان دەکـرد و بەو قـاپانەی بە دەسـتـمـانەوە بوون، لە دۆڵەکـاندا پلەی گـەرمـا و خێرایی ئەو جۆگەلانەمان دەپێوا کە دەڕژانە تەنگەی بوسفۆرەوە.

لەسـەر داوای والی بۆ ڕاپەڕاندنی کارێک چووینە گەبزە و سێ مـانگ لەوێ مـاینـەوە. بێ سـەروبـەریی کـاتـی نوێژ لە نێـوان مـزگـەوتـەکـانی ئەوێدا، بیرۆکەیەکی تری بە خۆجە بەخشی: بڕیاری دا سەعاتێکی بێ کەموکورتی بۆ پێشاندانی کاتەکانی نوێژ دروست بکات. لەو کاتەدا بوو فێرم کرد ئەو شتەی مـێزی پێ دەگـوترێت، چییـە. پێـوانەکـانم دایە دارتـاشـێک و مـێـزەکـەم بە دروستکردن دا. پاش ئەوەی بۆ ماڵ هێنامەوە، خۆجە لە پێشدا بەدڵی نەبوو، بە بەردی مردووشـۆری چوواند و دەیگوت مایەی نەگبەتییە، بەڵام دواتر لەتەک کورسییەکان و لەگەڵ مێزەکەشدا ڕاهات. دەیگوت بەو جۆرە دەتوانێت باشتر

بیر بکاتەوە و بنووسێت. لە ڕێی گەڕانەوەماندا بۆ ئەستەنبوڵ بەنیازی لە قاڵبدانی ددانەی پێچاوپێچی هاوتەریب لەگەڵ ڕێڕەوەی خولانەوەی خۆر بۆ سەعاتی نوێژ، مێزەکەمان بەسەر پشتی کەرێکەوە بوو لە دوامانەوە.

ئەو چەند مانگەی سەرەتا، کاتێک بەرامبەر بەیەک لەمبەر و ئەوبەری مێز دادەنیشتین و کارمان دەکرد، خۆجە دەکۆشا لەوە بگات کاتەکانی نوێژ و ڕۆژوو لە وڵاتانی سارد کە بەهۆی شێوەی هێلکەیی گۆی زەوییەوە جیاوازییەکی زۆری کات لە نێوان ڕۆژ و شەودا هەیە، چۆن دەستنیشان بکرێت؟ پرسیارێکی تری، هەبوون، یان نەبوونی خاڵێکی تری جگە لە مەککە بوو، بەجۆرێک مرۆڤ لە هەرلایەکەوە ڕووی تێ بکات، ڕوو لە ڕووگە وەرنەگێڕێت. ئەگەر دەدی بایەخ بەو گرفتانە نادەم و لە ناخەوە ڕقم لێیان دەبێتەوە، بە چاوی سووک بۆمی دەڕوانی، بەڵام هەستم دەکرد پەی بە "باڵادەستی و جیازازی"ی من بردووە. وای بۆچووم ئەویش هەستی بەم پەی پێبردنەی من کردبێت، بۆیە یەکجار وا ڕقی لێم دەبووەوە. بەدرێژی باسی زانستی دەکرد و هێندەی ئەوەش سەبارەت بە زیرەکی دەدوا. دەیگوت: "والی لە گەڕانەوەمیدا بۆ ئەستەنبوڵ، دەکەوێتە ژێر باندۆری نەخشەکانم، سەعاتە نوێیەکەم و بیرۆدۆزەی نوێی کۆسمۆگرافیم. کاری زیاتری لەسەر دەکەم و بۆ باشتر ڕوونکردنەوە، لە شێوەی میناتۆردا دەیخەمە ڕوو." لێرەدا بە ڕژاندنی تۆوی ژیاندنەوەیەکی نوێ، هەمووانی تووشی خولیای ناو دەروونی خۆی دەکرد: هەردووکمان چاوەڕێمان دەکرد.

## ٣

خـۆجـه لـەو ڕۆژانەدا بیـری لەوە دەکـردەوە چۆن ددانـەیەکی گـەورەی ئـەوتۆ دروست بکات ئەگـەر هەفـتـەی جـارێکیش نەبێت، بەلایـەنی کـەمـەوە مـانگی جـارێک سـەعـاتەکەی پـێ قـورمـیش بـکرێت. ئەوەی لە خـەیاڵدا بوو لە دوای بە دەسـتخستنی تاقـمە ددانەیەکی لەو جۆرە، سـەعاتێکی نوێژ کە ساڵی جـارێک قـورمیش بکرێت، دروست بکات. ئەو دەمـەی سـەرقـاڵی بیـرکردنەوە بوو لەوەی تاکـە گـرفت دۆزینـەوەی هێـزی پێـویسـتـه بۆ بەگـەرخـسـتنی ددانـەکـانی ئەو سـەعـاتە گەورەیە کە بەئەندازەی دوورکەوتنەوەیان لە یەکدی کێشـیـان زیادی دەکـرد، لـە ڕێـی دۆسـتـەکـانیـیـەوە لە مـوەقـیـتـخـانە، هەواڵی زانـی والی لە ئەرزەڕووم گەڕاوەتەوە.

ڕۆژی دواتـر چـوو بۆ پیـــرۆزبـاییکردن لە والـی. ئـەویـش، لـە ناو ئـاپۆڕەی مـێـوانـاندا هەواڵـی ئـەمی پرسـیـبـوو، پەرۆشـیـی خـۆی بۆ زانیـنی داهێنـانە نوێیـەکـانی دەربڕیبـوو، تەنـانـەت پرسـیـاری مـنیـشـی لێی کـردبوو. ئەو شـەوە چەندین جـار سـەعـاتەکـەمان لەبەریـەک هەڵوەشـاندەوە و دیسـان بـەسـتـمـانەوە، چەند شتێکمان بۆ ئێرە و ئەوێی میناتوری گـەردوون زیاد کرد و بە قڵچـەکانی دەسـتمان ئەسـتێرەکـەنمان بۆیاخ کرد. خۆجە، چەند بڕگەیەکی دەقێکی لەبەر بۆم خوێندەوە. دەقەکەی سەبارەت بە لۆجیکی خولانەوەی ئەستێرەکان بوو، بە زمانێکی شاعیرانە و سەرنجڕاکێش نووسیبووی، مەبەستی کاریگەری دانان بوو لەسـەر گـوێگران. بۆ ئـەوەی لە کـاتی خـوێندنەوەیدا جۆش و خـرۆشـی کـەم نەبێتەوە، دەمـەوبەیانی جـارێکیش دەقـەکەی بە پێچـەوانەوە خوێندەوە. پاشـان ئـامـێـرەکـانی لە گـالیـسـکەیەکی بۆ ئەو مـەبەسـتـە بـانگکراو بار کـرد و بەرەو کـۆشـکی والی بەڕێ کـەوت. سـەعـات و مـیـنـاتورەکـەش کـە چەندین مـانگ بوو

هەموو ماڵەکەیان پڕ کردبوو، بە سەرسووڕمانەوە بینیم هێندە بچووک بوون، بەجۆرێک لە گالیسکەیەکدا جێیان بووەوە. خۆجە ئێوارەیەکی زۆر درەنگ گەڕایەوە بۆ ماڵ.

پاش داگرتنی ئامێرەکان لە باخچەکە و دوای ئەوەی والی وەک کابرایەکی پیری بێ تام و کاڵتەنەزان لەگەڵ شتی سەرنجڕاکێشدا، چاوێکیان پێدا دەگێڕێت، خۆجە ئەو دەقانەی بۆ دەخوێنێتەوە کە پێشتر لەبەری کردبوون. والی لەو دەمەدا منی بیر دەکەوێتەوە، ئەو پرسیارەی لێ دەکات کە سوڵتانیش چەندین ساڵ دواتر دووپاتی دەکردەوە: "ئایا ئەو تۆی فێری ئەم شتانە کردووە؟" ئەمە یەکەم کاردانەوەی والی بووە. خۆجەش بە پێشاندانی کاردانەوەیەک والیی تووشی سەرسووڕمان کردووە. دەپرسێت: "کێ؟" دواتر، دەستبەجێ تێ دەگات کەسی باس لێوەکراو، منم. بەدوای ئەوەدا بە والی گوتووە ئەوە گەمژەیەکی خوێندەوارە. هەڵبەتە مەبەستی من بووە. خۆجە لە کاتی گێڕانەوەی ئەم بابەتانەدا بۆ من، بایەخی پێم نەدەدا، بگرە هێشتا خەیاڵی لای ڕووداوەکانی کۆشکی والی بوو. دواتر بە پێداگرتنەوە گوتبووی هەموو شتەکان لە داهێنانی خۆین، بەڵام والی باوەڕی پێ نەکردبوو. وای نواندبوو بەدوای تاوانبارێکدا بگەڕێت و دڵی نەهاتبێت بڵێت تاوانبارەکە خۆخەی خۆشەویستی خۆیەتی.

بەو جۆرە لەبری ئەستێرەکان، باسی منیان کردبوو. پێشبینیم دەکرد خۆجە زۆر مەیلی لێ نەبووە لە بارەی ئەو بابەتەوە بدوێت. بۆیە بێدەنگییەک هاتووەتە ئاراوە، سەرنجی والیش کەوتووەتە سەر میوانەکانی تر. خۆجە لە کاتی نانی ئێوارەدا هەوڵێکی تری دابوو لە بارەی ئەستێرەکان و داهێنانەکانی خۆیەوە بدوێت، والی لەو ساتەدا گوتبووی هەرچی هەوڵ دەدات شێوەی منی بیر بکەوێتەوە، ڕووخساری خۆجەی دێتە بەرچاو. لەوێ خەڵکی تریش بە دەوری خوانەکەوە بوون. چەلەحانێیەک سەبارەت بە خولقاندنی مرۆڤی دووانە دەستی پێ کردووە و نموونەی قەبە و زیاد پێوەنراو لەو بارەیەوە بەبیر هێندراوەتەوە. باسی ئەو جمکانە کراوە کە دایکان لە

جیاکردنەومیاندا سەریان لێ دەشێوێت، ئەو لێکچوونانەی لە یەکەم بەیەک گەیشتندا لە یەکدی دەترسن، بەڵام دواتر وەک ئەوەی جادوویان لێ کرابێت، هەرگیز لە یەکدی جیا نابنەوە. قسەیان بردووەتەوە سەر ئەو چەتە و ڕێگرانەی کە لەبەر وێکچوونیان جێی کەسانی بێ تاوان دەگرنەوە. دوای نان خواردن و بڵاوەکردنی ئاپۆرەی میوانەکان، والی داوای لە خۆجە کردبوو بمێنێتەوە.

خۆجە سەرلەنوێ دەست بە گێڕانەوە دەکات، بەڵام والی لە پێشدا زۆر چێژ لە قسەکانی وەرناگرێت، تەنانەت ناڕازیش دەبێت لەوەی بەبیستنی چەند زانیارییەکی قورس بۆ تێگەیشتن، دووبارە چارەی داوە بەیەکدا، بەڵام پاش ئەوەی جاری سێیەم گوێ لە دەقە لەبەرکراوەکەی خۆجە دەگرێت و زەوی و ئەستێرەکانی سەر میناتورەکەمان چەند جارێک بە بەرچاوییەوە دەخولێنەوە، خۆی وا پێشان دەدات وەک ئەوەی کەمێک حاڵی بووبێت. بەلایەنی کەمەوە جۆرێک لە پەرۆشیی لەکن دروست دەبێت و بەوردی گوێ بۆ گێڕانەوەکانی خۆجە ڕادەگرێت. لەو ساتەدا خۆجە دووبارە بەخرۆشەوە دەڵێت ئەستێرەکان بەو جۆرە نا کە هەموو کەس پێیان وایە، بگرە بەمجۆرە دەخولێنەوە. دواجار والی دەڵێت: "باشە، تێ گەیشتم، ئاواش دەبێت، بۆچی نەبێت!" خۆجە لەو ساتەدا بێدەنگ دەبێت.

وای بۆچووم لەو ساتەدا بێدەنگییەکی درێژ هاتبێتە ئاراوە. خۆجە لە پەنجەرەکەوە نیگای لە تاریکایی کەنداوی زێڕین بڕی و لەبەر خۆیەوە دەستی بە قسان کرد: "بۆچی والی ڕاوەستا، لەبەر چی زیاتر نەچووە پێشەوە؟" ئەگەر ئەمە پرسیارێک بێت، منیش وەک ئەو وەڵامەکەیم نەدەزانی. وای بۆچووم خۆجە بیرۆکەیەکی سەبارەت بەو شوێنە هەبێت کە دەبێت والی لێی بچێتە پێشەوە، کەچی هیچی نەگوت. پێ دەچوو ئەوەی هەموو کەس لەو نەدەچوون، نیگەرانی کردبێت. والی، دواتر بایەخی بە سەعاتەکە دابوو، ناوەکەی پێ کردبوونەوە و پرسیاری کەڵکی ددانە و میکانیزم و بارستەکەی لە خۆجە کردبوو. وەک ئەوەی پەنجە بە کونی تاریک و ترسناکی ماردا بکات، بەترسەوە

پەنجەی کردبوو بە ئامێرە کرتەکرتکەرەکەدا و دەری هێنابووەوە. خۆجە لەو هەلەدا بورجەکانی سەعاتەکەی کردبووەوە، باسی لە هێزی ئەو نوێژانە کردبوو کە هەمووان لە هەمان ساتدا دەیکەن. والی لەو چرکەیەدا تەقیبووەوە و گوتبووی: "خۆتی لێ رزگار بکە! ئەگەر دەتەوێت بە ژەهر بیکوژە، ئەگەر دەخوازیت ئازادی بکە. دەحەسێیتەوە." دەبێت من لەو کاتەدا بۆ ساتێک بە ترس و ئومێدەوە نیگام لە خۆجە بڕیبێت. ئەو گوتی: "تا ئەوانە لە کارەکە نەگەن، ئازادت ناکەم."

نەمپرسی ئەو کارە چییە پێویستە لێی تێ بگەن. لەوانەیشە ترسەکەم لەوێوە سەرچاوەی گرتبێت کە هەستم دەکرد خۆجە خۆیشی نەیزانێت. پاشان باسی شتی تریان کردبوو. والی چارەی خۆی دابوو بەیەکدا و بەرقەوە سەیری ئامێرەکانی بەردەستی کردبوو. خۆجە بە ئومێدی ئەوەی والی جارێکی تر ئاوڕی لێ بداتەوە، چاوەڕێی کردبوو. ئەگەرچی زانیبووی ئەو ئێوارەیە هیچی تر کەسێکی خوازراو نییە، کەچی تا درەنگانی شەو لە کۆشکی والی دانیشتبوو. پاشان فەرمانی دابوو ئامێرەکان لە گالیسکەکە بار بکرێن. من کەسی ناو ماڵێکی سەر ڕێگەی تاریک و بێدەنگی گەڕانەوەی خۆجەم هێنایە بەرچاوی خۆم: یارۆ لە پێخەودا خەوی زڕاوە، لە نێوان دەنگی تایەکانی گالیسکەکەوە گوێی لە کرتەکرتی سەعاتە گەورەکە بووە و سەری سووڕماوە.

خۆجە، تا گزنگی بەیان بەپێوە مایەوە. ویستم مۆمێکی تر لەبری مۆمە کوژاوەکە دابگیرسێنم، بەڵام ڕێی پێم نەدا. لەبەر ئەوەی دەمزانی دەیەوێت شتێک بڵێم، گوتم: "والی، ڕۆژێک لە ڕۆژان هەر تێ دەگات." ئەمەم لە تاریکییەکەدا گوت و پێم وا بوو ئەویش دەیزانی خۆیشم بڕوام بەم قسەیەم نییە، بەڵام پاش کەمێک وەڵامی دایەوە: "هەموو کارەکە، لە هەڵماڵینی ڕازی ئەو ساتەدایە کە والی تیایدا بێدەنگ بوو."

بۆ هەڵدانەوەی پەردە لەسەر ئەو ڕازە، لە یەکەم هەلدا چووە کن والی. ئەمجارە والی بە کەیفێکی سازەوە پێشوازی لێی کردبوو. بە خۆجەی گوتبوو

له ڕەوتی ڕووداوەکـان و له نیـازی ئەو حـاڵی بووە. دوای دڵدانەوەی خـۆجـە، ئامـۆژگـاریی کـردبوو هـەوڵەکـانی بخـاتـە گـەڕ بۆ دروسـتکردنـی چەکـێک. گـوتبـووی: "چەکـێکی ئەوتۆ دنیـا له دوژمنمـان بکات بە زیندان!"، بەڵام نەیگوتبـوو پێویسـتـە چۆن چەکـێک بێت. والی ئامـادەیی خـۆی دەربڕیبـوو پشتیوانی له خۆجە بکات، بەمەرجێک مەیلی زانستیانەی خۆی بـەو ئاقارەدا ببـات. بێگومـان بەهیـچ جۆرێک باسـی داهاتی مـانگانەی ئێمـەی نەکـردبوو، ئەوەندە نەبێت کیسەیەکی پڕ له پارەی زیوینی دابوو بە خۆجە. کیسەکەمان له مـاڵ کردەوە و پـارەکەمـان ژمـارد، ١٧ دانە بوو، ژمـارەیەکی وا ناجـۆر! والی دوای ئەوەی کیسـەکەی دابوو بە خۆجە، گوتبووی سوڵتان له خشتە دەبات بۆ ئەوەی گویێ بۆ خـۆجـە ڕابگرێت. گوتبـووی سـوڵتـانی لاو خـولیـای "ئەو جۆرە شتـانە"ی له سەردایە. نە من و نە خۆجـەش کە بە ئاسانی ئومێدی لەکن پەیدا دەبوو، دڵمان بەو بەڵێنە خۆش نەکرد، بەڵام دوای هەفتەیەک هەواڵێکیان هێنا: والی، دوای ڕۆژووشکاندن، ئێمە، بەڵێ منیش، دەباتە دەرباری سوڵتان.

وەک خـۆ ئامـادەکـردنێک، خـۆجـە ئەو دەقـەی بۆ والی خـوێندبووەوە، بەشێوەیەک منداڵێکی نۆ ساڵە لێی تێ بگات، گۆڕانکاری تێدا کرد و لەبەری کرد. بەڵام خەیاڵی لای سوڵتان نەبوو، بگرە لەبەر هەر هۆیەک بێت، لەکن والی و هۆی بێـدەنگ بوونەکـەی بوو. دەیگوت دەبێت ڕۆژێک له ڕۆژان نـهێنیی ئەو بێـدەنگبـوونە ئاشکرا بکات. دەیپـرسـی: "ئەو چەکـەی والی دەیەوێت، دەبێت شـتێکی چۆن بێت؟" من شـتێکی ئەوتۆم نەمـابـوو بۆ گوتن، ئەو بەتاقـی تەنیا کـاری دەکـرد. دەچووە ژوورەکـەی و تا نیـوەی شـەوان دەرگـای لەسـەر خـۆی دادەخست. منیش، ئیدی تەنانەت بێ ئەوەی بیر لەوە بکەمـەوە کەی بۆ وڵاتی خـۆم دەگەڕێمـەوە، وەک منداڵێکی گەمـژە، بێ کـاروبار له بەردەم پەنجـەرەی ژوورەکەمدا دادەنیشـتم و پەتم بۆ خەیاڵەکانم شل دەکرد: له خـەیاڵی خۆمـدا، ئەوەی له بەردەم مێزەکەدا دادەنیشـت و کاری دەکرد، خـۆجە نەبوو، من بووم، هـەموو کاتێک دەمتوانی بۆ هـەر شـوێنێک ئارەزووم بکردایە، بڕۆم!

لەگەڵ خۆرنشـیندا ئامێرەکانمان له گالیسکەیەک بار کرد و بەرەو کۆشک

بەڕێ کەوتین، ئیدی کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵم خۆش دەویست، لە خەیاڵی خۆمدا ئارەزووم دەکرد مرۆڤێکی نەبیندراو بومایە و بمتوانیبایە بەناو بەرزە چنار و شابەڕوو، و دار ئەرخەوانەکاندا هاتوچۆم بکەم، بەهاوکاری کەسانی تر لەوێ، ئامێرەکانمان لە شوێنی تماشیکردنیان لە ناوەوە دامەزراند.

سوڵتان منداڵێکی خوێنشیرین و ڕوومەت سوور بوو، بالای لە گوێرەی تەمەنی، کورتتری دەنواند. بەجۆرێک دەستی لە ئامێرەکان دەدا وەک ئەوەی کەلوپەلی گەمەی خۆی بن. ئێستا باش بۆم ناخرێتەوە سەریەک ئایا لەو کاتەدا بوو ویستم ببم بە هاودەم و هاوڕێی، یاخۆ لە دەمی کاتی دووەماندا بوو کە پاش پازدە ساڵ لەو ڕۆژە پێک هات؟ بەڵام دەستبەجێ حاڵی بووم مرۆڤ نابێت نارەوایی لە بەرامبەردا بکات. خۆجە لەو ساتەدا نوزەی لە خۆی بڕیبوو. دەست و پێوەندەکانی سوڵتانیش بەپەرۆشەوە چاوەڕێیان دەکرد، دواجار توانی دەست پێ بکات. کۆمەڵێک شتی نوێی بۆ بەسەرهاتەکەی زیاد کردبوو: بەجۆرێک باسی ئەستێرەکانی دەکرد وەک ئەوەی بوونەوەری زیندوو بن و ئاوەزیان هەبێت. ئەستێرەکانی بە کۆمەڵێک بوونەوەری ڕاکێشەر و پڕ لە ڕاز چوواند و بەشێوەیەک کەوتە باسکردنیان وەک ئەوەی لە ئەندازە و زانستی ماتماتیک تێ بگەن و بەپێی ئەو تێگەیشتنەیان بخولێنەوە. کاتێک دەیبینی منداڵەکە چاروبار سەر بەرز دەکاتەوە و بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی ئاسمان دەکات، ئەم هێندەی دی تاوی دەسەند. ئا لێرەدا ئەو میناتورە ڕوونەی گەردوونی پێشان دا کە ئەستێرەکانی پێوە هەڵواسرابوون و دەسووڕانەوە. دەیگوت: "ڤینۆس لەوێدایە و بەو جۆرە دەسووڕێتەوە، ئەو شتە زەبەلاحەی ئێرەش مانگە و بەشێوەیەکی تر شوێنی خۆی دەگۆڕێت. هەر جارێکیش خۆجە لەگەڵ خولانەوەی ئەستێرەکاندا زەنگە هەڵواسراوەکەی قەد میناتورەکەی بە دەنگە خۆشەکەیەوە دەلەراندەوە، سوڵتانی بچکۆڵە لە ترساندا شەقاوێک دەچووە دواوە. پاشان هێزی خۆی گرد دەکردەوە و وەک ئەوەی بیەوێت بچێتە قوتوویەکی ئەفسوناوییەوە، لە ئامێرە زەنگ لێدەرەکە نێزیک دەکەوتەوە و هەوڵی دەدا تێ بگات.

ئێستا، ئەو دەمانەی بیرەوەرییەکانم دەهێنمەوە سەریەک و هەوڵ دەدەم ڕابردوویەک بۆ خۆم بسازێنم، پێم وایە ئەو دیمەنە تابلۆیەکی بەختەوەریی گونجاوە لەگەڵ چیرۆک و ئەفسانەکانی سەردەمی منداڵیم و هاوشێوەی کاری نیگارکێشانی ئەفسانەکانە. میناتورەکە لە ئامێرێکی گەمەی منداڵان دەچوو، تەنیا لەو تۆپە شووشەییانەی کەم بوو کە بە هەڵگێرانەوەیان، بەفریان بەسەر ماڵانی سەربان سووری لەسەر شێوازی کێک بنیاتنراودا دەباراند. پاشان منداڵەکە دەستی بە پرسیار کرد و خۆجەش هەوڵی دەدا فریای وەڵامدانەوە بکەوێت:

ئەو ئەستێرانە چۆن بەو جۆرە بە ئاسمانەوە ڕاوەستاون؟ بە خولگە ڕوونەکانەوە هەڵواسراون! ئەو خولگانە لە چی دروست بوون؟ لە مادەیەکی ڕوون و ڕوونییان پێ دەبەخشێت! ئایا بەریەک ناکەون؟ نەخێر، وەک ئەوانەی سەر میناتورەکە قات قاتن! ئەو هەموو ئەستێرەیە هەیە، ئەدی بۆچی ژمارەی ئاستەکان هێندەی ژمارەی ئەستێرەکان نییە؟ چونکە ئەوانە زۆر دوورن! چەند دوورن؟ زۆر، زۆر! ئەستێرەکانی تریش لە کاتی خولانەوەیاندا زەنگی لەراوەیان هەیە؟ نەخێر، خۆمان زەنگەکەمان بۆ تێگەیشتن لە خولێکی تەواوی ئەستێرەکان داناوە! گەرمەی هەور پێوەندیی بەمەوە هەیە؟ نییەتی! ئەدی پێوەندیی بە چییەوە هەیە؟ بە بارانەوە! سبەینێ دەبارێت؟ ئەگەر بە شێوەی ئاسماندا بێت، سبەی نابارێت! گەلۆ ئاسمان چی دەڵێت بۆ شێرە نەخۆشەکەی سوڵتان؟ چاک دەبێتەوە، بەڵام پێویستە ئارامی هەبێت و شتی تری لەو جۆرە.

خۆجە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی بۆچوونی خۆیدا سەبارەت بە شێرە نەخۆشەکە، وەک ئەوەی لە کاتی دوان لە بارەی ئەستێرەکانەوە دەیکرد، دیسانەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە. دوای گەڕانەوەمان بۆ ماڵ، بەرقەوە باسی ئەم وردەکارییانەی گێڕایەوە. دەیگوت گرینگ ئەوە نییە منداڵەکە زانست و سۆفیگەری لێک جیا بکاتەوە، بگرە گرینگ ئەوەیە شتێک تێ بگات. دیسان هەمان وشەی بەکار دەهێنا و بەجۆرێکیش دەری دەبڕی وەک ئەوەی

من پەیم بەو شتە بردبێت کە دەبێت بزانرێت. منیش ئیدی بیرم دەکردەوە ببم بە موسڵمان یان نا. ئەو کیسەیەی لە کاتی دەرچوونماندا لە کۆشک پێمان درابوو، پێنج زێڕی تەواوی تێدابوو. خۆجە گوتی سوڵتان پەی بردووە بە هەبوونی لۆجیکێک لە پشت چیرۆکی ئەستێرەکانەوە. ئاخ سوڵتان! دواتر، زۆر دواتر بەتەواوی ناسیم! لە پەنجەرەکەوە مانگم دەبینی. سەرم سوورما لەوەی ئەمە هەمان ئەو مانگەیە کە لە پەنجەرەی ماڵەکەی ئێمەوە دەبیندرا. خۆزگەم خواست ببمەوە بە منداڵ! خۆجە خۆی پێ نەگیرا و گەڕایەوە سەر هەمان بابەت: گرفتی شێرەکە گرینگ نییە، منداڵەکە ئاژەڵی خۆش دەوێت و هیچی تر.

ڕۆژی دواتر چووە ژووری خۆی و دەستی کرد بە کار. دوای چەند ڕۆژێک دیسان سەعات و میناتوری ئەستێرەکانی لە گالیسکەیەک بار کرد. ئەمجارەیان لە ژێر ئەو نیگا پڕ لە پرسیارانەدا کە لە پەنجەرە قەفەسدارەکانەوە ئاڕاستەی دەکرا، چوو بۆ دەرزخانەی منداڵان. ئێوارە لە گەڕانەوەیدا بێزار بوو، بەڵام نەک بەڕادەی ئەوەی بێدەنگی بکات. گوتی: "وام زانی منداڵەکانیش وەک سوڵتان تێ دەگەن، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم." منداڵەکان تەنیا ترسابوون. خۆجە پاش تەواوکردنی قسەکانی، پرسیاری بابەتەکەی لێیان کردبوو. منداڵێک گوتبووی ئەودیوی ئاسمان دۆزەخە، دوای ئەوەی ئەم قسەیەی کردبوو، دەستی کردبوو بەگریان.

خۆجە، هەفتەی دواتری بە قوڵکردنەوەی باوەڕییەوە، بەجۆرێک لە ئاستی تێگەیشتنی سوڵتاندا بێت، بەسەر برد. یەک بەیەکی ساتەکانی چوونە ژوورەمان بۆ حەوشەی ناوەوە دەهێنێتەوە بیری من. دەکۆشا من بۆچوونەکانی بۆ بسەلمێنم: منداڵەکە زیرەک بوو، بەڵێ. هەر لە ئێستاوە دەیزانی پێویستە بیر بکاتەوە، بەڵێ. هەر لە ئێستاوە خاوەنی کەسایەتی پێویست بوو بۆ خۆ ڕزگارکردن لە پاڵەپەستۆی دەوروبەر، بەڵێ! بەو جۆرە، ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی سوڵتان دەست بکات بە خەون بینین بۆ ئێمە، ئێمە دەستمان کرد بە خەون بینین بۆ ئەو. خۆجە، ئەو ماوەیە لە سەعاتەکەشدا

کاری دەکرد. پێم وا بێت لە بارەی چەکەکەشەوە بیری دەکردەوە، چونکە کاتی بانگردنی بۆ لای والی، وای گوتبوو. بەڵام هەستم کردبوو ئومێدی پێی نەماوە. لەمەڕ والی گوتی: "وەک ئەوانی تری لێ هاتووە، ئیدی ناخوازێت ئەو شتەی نایزانێت، بیزانێت!" هەفتەیەک دواتر سوڵتان دیسان ناردی بەدوایدا، ڕۆیشت.

سوڵتان بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازی لە خۆجە کردبوو. گوتبووی: "شێرەکەم چاک بووەتەوە، قسەی تۆ دەرچوو." دواتر لەگەڵ دەست و پێوەندەکاندا دەچنە حەوشە. سوڵتان ماسیی ناو حەوزێک پێشانی خۆجە دەدات و پرسیار دەکات ڕای چییە بەرامبەریان. لە کاتی گێڕانەوەی ئەم قسانەدا بۆ من، گوتی: "تەنیا گوتم سوورن. هیچ شتێکی ترم بەخەیاڵدا نەهات بۆ گوتن بشێت." لەو ساتەدا لە جووڵەی ماسییەکاندا پەی بەهەبوونی نەزمێک بردبوو، وەک ئەوە وا بووە لە نێوان خۆیاندا بدوێن بۆ ئەوەی نەزمەکەیان بێ کێماسی بێت. خۆجە بە سوڵتانی گوتبوو ماسییەکانی بەلاوە ژیرن. گرگنێکی تەنیشت یەکێک لە ئاغایانی حەرەمخانە، لەوانەی بەردەوام ئامۆژگارییەکانی دایکی سوڵتانی دەهێنایەوە بیری سوڵتانی منداڵ، پێکەنینی بەو قسەیە هاتبوو. سوڵتانیش سەرزەنشتی کردبوو. دواتریش لە کاتی سواربوونی گالیسکەکاندا، وەک سزایەک، مۆڵەتی نەدابوو ئەو کورتەبالا مووسوورە لەگەڵیان سوار بێت.

بە گالیسکە چووبوون بۆ شێرخانە لە مەیدانی ئەسپ. لەوێ، سوڵتان دانە بەدانەی چەندین شێر و پشیلەی فارسی و پڵنگی پێشانی خۆجە دابوو. گشت ئاژەڵەکان بە زنجیر بە ستوونەکانی کۆنە کڵێسایەکەوە بەسترابوونەوە. لە بەردەم ئەو شێرەدا ڕاوەستابوون کە خۆجە پێشبینیی چاک بوونەوەی کردبوو. منداڵەکە قسەی دواندبووی و بە خۆجەی ناساندبوو. دواتر چووبوونە لای شێرێکی لە گۆشەیەکدا نووستوو. ئاژەڵەکە دووگیان بووە و وەک ئەوانی تر بۆنی پیسی لێ نەهاتووە. سوڵتان بەدوو چاوی درەوشاوەوە پرسیبووی: "ئەم شێرە چەند بەچکەی دەبێت، چەندیان نێر و چەندیان مێ دەبن؟"

خۆجە زۆر بێزار بووبوو، دواتر لەکن من ددانی پێدا نا کە "هەڵەی کردووە." بە سوڵتانیشی گوتبوو سەرم لە گەردووونناسی دەردەچێت، بەڵام ئەستێرەناس نیم. سوڵتانیش گوتبووی: "بەڵام تۆ باشتری لێ دەزانیت وەک لە حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان!" خۆجە لە ترسی ئەوەی نەبادا یەکێک لەوانەی دەوروبەر ئەم قسەیە ببیستێت و بە حوسێن ئەفەندیی بگەیەنێتەوە، خۆی لە وەڵامدانەوە پاراستبوو. سوڵتانی خەیاڵشکاو بەردەوام بووە و گوتوویەتی: "خۆجە یان هیچ نازانێت، یاخۆ لەبری ئەستێرەکان سەیری شوێنی خاڵی دەکات؟"

پاشان خۆجە، ئەو قسانەی دای نابوو دواتر بیانکات، ناچار بووە دەستبەجێ دەستیان پێ بکات: گوتبووی زۆر شت لە ئەستێرەکانەوە فێر بووە و گەلێک ئەنجامیشی لەو فێربوونانەوە دەستگیر بووە. بە کەڵک وەرگرتن لە بێدەنگبوونی سوڵتان کە بە چاوی داچەقیوەوە گوێی بۆی ڕاگرتووە، گوتبووی پێویستە ڕوانگەخانەیەک بۆ چاودێریکردنی ئەستێرەکان بێتە دامەزراندن. شتێک لە شێوەی ئەو ڕوانگەخانەیەی کە مورادی سێیەمی باپیری خوالێخۆشبووی ئەحمەدی یەکەمی باپیری سوڵتان نەوەد ساڵ لەمەوبەر فەرمانی دابوو بۆ خوا لێخۆشبوو تەقیەدین ئەفەندی دروست بکرێت و دواتر لەبەر فەرامۆشکردن خاپوور بووبوو. نەخێر، شتێکی زۆر لەوە پێشکەوتووتر؛ خانەیەک بۆ زانستەکان، تەنیا بۆ چاودێریکردنی ئەستێرە نا، بگرە سەرجەم ئەو زانایانە لە خۆ بگرێت کە لە سەرانسەری جیهاندا، لە ڕووبار و دەریاکانی، هەور و چیا و گوڵ و بێگومان، ئاژەڵانیش دەکۆڵنەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە سەبارەت بە لێکۆڵینەوەکانی خۆیان بدوێن تا خۆیان پێش بکەون و گەشە بە ئاوەزی ئێمەش بدەن.

یەکەمجارم بوو گوێم لەم نەخشەیەی خۆجە دەبوو. سوڵتانیش وەک ئەوەی گوێی بۆ داستانێکی شیرین شل کردبێت، گوێی بۆی ڕاگرتبوو. لە کاتی گەڕانەوەیاندا بە سواری گالیسکە بەرەو کۆشک، دیسان پرسیبووی: "پێت وایە شێرەکە چۆن دەزێت؟" خۆجە لەبەر ئەوەی پێشتر بیری لێ کردبووەوە،

ئەمجار گوتبووی: "بێچووە تازە لە دایکبووەکان هاوکێشی یەکتر دەبن!" لە ماڵەوە بە منی گوت ئەو قسەیە هیچ مەترسییەکی نییە. دەیگوت: "ئەو منداڵە گەمژەیە دەخەمە لەپی دەستمەوە، زۆر لە حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان بە تواناترم!" بەکارهێنانی ئەو وشەیە سەبارەت بە سوڵتان لە کاتی قسەکردندا، منی سەرسام کرد. دواتر لەبەر هەر هۆیەک بێت، لەو قسانەی زویر بووم. لەو کاتانەدا دڵم پڕ بوو لە خەم و خۆم بەکاری ناوماڵەوە سەرقاڵ دەکرد.

دواتر، دەستی کرد بە بەکارهێنانی ئەو وشەیە وەک کلیلێکی ئەفسووناوی بۆ کردنەوەی هەموو قفڵێک: "لەبەر گەمژەیی خۆیان، سەرێک هەڵنابڕن تا سەیری ئەو ئەستێرانە بکەن کە بەسەر سەریانەوە دەخولێنەوە. لەبەر گەمژەیی خۆیان بەر لەوەی فێری شتێک بن، لە پێشدا دەپرسن داخۆ بەکەڵکی چی دێت. لەبەر گەمژەیی خۆیان پەرۆشی پوختەی مەسەلەکانن نەک وردەکارییەکان. لەبەر گەمژەیی خۆیان لە یەکدی دەچن و هتد..." ئەگەرچی منیش چەند ساڵێک لەمەوبەر لە وڵاتەکەی خۆم زۆرم حەز بەو شێوازی قسەکردنە دەکرد، بەڵام بوارم نەبوو هیچ بە خۆجە بڵێم. بۆخۆیشی لەو کاتانەدا منی بەلاوە گرینگ نەبوو، بگرە گری لە گەمژە و دەبەنگەکانی ئالاندبوو. گەمژەیی منیش جۆرێکی تر بوو. لە ڕووی چەنەبازی و لەوچەیی خۆمەوە، لەو ڕۆژانەدا خەونێکی خۆم بۆی گێڕایەوە: لە خەونمدا خۆی خستبووە جێی من و چووبووەوە وڵاتی من، لەگەڵ دەزگیرانمدا زەماوەندی کردبوو، لە زەماوەندیشدا کەس هەستی نەکردبوو ئەو من نیم. منیش دەستێک جلی تورکیم لەبەر کردبوو، لە گۆشەیەک ڕاوەستابووم و سەیری ئاهەنگەکەم دەکرد. لە ناوەڕاستی زەماوەندەکەدا لەگەڵ دایکم و دەزگیرانی شادمانمدا ڕووبەڕووی یەکتر بووینەوە. سەرباری فرمێسکەکانم کە لە خەو بێداریان کردمەوە، هیچ کامیان منیان نەناسییەوە، پشتیان تێم کرد و لێم دوور کەوتنەوە.

خۆجە لەو سەروبەندەدا دوو جاران چوو بۆ کۆشکی والی. وا دیار بوو والی

پێی خۆش نەبوو خۆجە دوور لە چاوی ئەو خۆی لە سولتان نیزیک بکاتەوە. کەوتبـووە لێپێـچینەوەی: زۆر دواتر و پاش ئەوەی والی لە ئەستەنبـوڵەوە بۆ تاراوگە دوورخرایەوە، ئەوسا خۆجە پێمی گوت والی پرسیاری منی کردووە و دەستووری داوە لێکۆڵینەوەم لە بارەوە بکرێت. ئەگەر ئەمەی زووتر بگوتبایە، دەبوو من ڕۆژانی خـۆم بـە ترسی ژەهـراویکردنەوە بگوزەراندایە. سـەرباری ئەوەش، هەستم دەکرد والی زیاتر بایەخ بە من و کەمـتر بە خۆجەی دەدات، لێکچوونمان لەگەڵ خۆجەدا، لە خۆم زیاتر، والی نیگەران دەکرد و ئەمەش ختووکەی شکۆی منی دەدا. پێ دەچوو ئەم لێکچوونەمان لەو کاتانەدا ڕازێک بێت خۆجە هەرگیز نەخوازێت بیزانێت و ئازایەتییەکی سەرسووڕهێنەریش بە من ببەخشێت. هەندێک جار بیرم دەکردەوە تا خۆجە لە ژیاندا بێت، بەهۆی ئەم لێکچوونەوە من لە مەترسی دوور دەبم. ڕەنگە لەو سۆنگەیەشەوە بووبێت کاتێک خۆجە والیشی خستە ڕیزی دەبەنگەکانەوە، من بەرەنگاری بوومـەوە. ئیدی ئەو لەو ساتانەدا هەڵدەچوو. دەمزانی ناتوانێت دەستم لێ هەڵبگرێت و هەمـان کاتیش شـەرم دەکات، ئەمـەش پاڵی پێـوەم نا بەرەو بێ ئابڕووییـەکی تەنانەت بە خۆیشم نامۆ. بە پرسیارە یەک لەسەریەکەکانم سەبارەت بە والی و قسەکانی ئەو لە بارەی هەردووکمـانەوە، خۆجەم لە هەڵچوونێکدا نوقم دەکرد پێم وا بێت خۆیشی نەیدەزانی هۆیەکەی چییە. لەو کاتەدا سەرسەختانە دەیگـوت و دووبارەی دەکــــــردەوە: "بەڕە لە ژێـر پێـی والیش دەردەهێنن. یەنیچـەرەکان بەم زووانە شتێک دەکەن، درکم بە داڕشتنی نەخشەی چەند شتێکیش لە کۆشکدا کردووە. بۆیە ئەگەر کار بۆ دروستکردنی چەکێک بکەم، وەک والی داوای دەکات، نامەوێت بۆ وەزیرێکی کاتی، بگرە پێویستە بۆ ئەوەی بێخەمە بەردەستی سولتان، دروستی بکەم."

ماوەیەک پێم وا بوو سەرجەم کاتی خۆی بە نەخشەی ئەو چەکە نادیارەوە بەسـەر دەبات. بەخـۆم دەگـوت هـەوڵ دەدات، بەڵام پێـشڕەویی پێ ناکرێت، چونکە ئەگەر بیتوانیبا پێشڕەوی بکات، ئەوا دڵنیا بووم، تەنانەت ئەگەر بۆ سووکایەتی پێکردنیشم بوایە، ڕای منی هەر وەردەگرت و بۆچوونەکانی خۆی

بۆم ڕوون دەکردەوە. ئێوارەیەک، لە گەڕانەوەماندا لەو ماڵەی ئاکسەرای کە دوو سێ هەفتە جارێک ڕوومان تێ دەکرد و دوای گوێگرتن لە موزیک، لەگەڵ ژنەکاندا دەنووستین، خۆجە پێمی گوت بەنیازە تا بەیانی کار بکات. پاشان لە بارەی ژنەکانەوە پرسیاری کرد، قسەکردن سەبارەت بە ژنان شتێک بوو پێشتر هەرگیز نەمانکردبوو. دواتر لەپڕ گوتی: "بیر دەکەمەوە. هەر ئەوەندەی گەیشتینەوە ماڵ، بێ ئەوەی بڵێت بیر لە چی دەکاتەوە، چووە ژووری خۆی و دەرگای لەسەر خۆی کڵۆم دا. منیش ئیدی لە نێو کتێبەکانی خۆمدا کە تەنانەت وزەی هەڵدانەوەی پەڕەکانیشیانم تێدا نەمابوو، مامەوە و بیرم کردەوە: لە پرۆژەیەک کە من باوەڕم وا بوو ناتوانێت پێشڕەوی تێدا بکات، یان لە بیر و بۆچوونەکانی، یاخۆ لە سەیرکردنی بێهوودەی کاغەزەکانی سەر ئەو مێزەی هێشتا بەتەواوی ڕانەهاتبوو لە ژوورەوە لە بەردەمیدا دابنیشێت، یان دانیشتنی ختوخۆڕاییی چەندین سەعاتەی بە شەرم و هەڵچوونەوە لە بەردەم مێزەکەدا...

درەنگانێکی دوای نیوەی شەو لە ژوورەکەی هاتە دەرێ. لەبەر ئەوەی گرفتێکی بۆ هاتبووە پێش، وەک قوتابییەکی خاکیی خوازیاری هاوکاری، بە شەرمەوە منی بانگ کرد بۆ بەردەم مێزی ژووری خۆی. بێ هیچ دوودڵی نواندێک گوتی: "هاوکاریم بکە، با پێکەوە بیریان لێ بکەینەوە، بەتەنیا پێشڕەویم پێ ناکرێت." لەبەر ئەوەی پێم وا بوو ئەوەی دەیڵێت، پێوەندیی بە ژنانەوە هەیە، ساتێک بێدەنگ بووم. سەرنجی دا تەنیا سەیر دەکەم و هیچی تر، بۆیە بە دەربەستەوە گوتی: "بیر لە گەمژەکان دەکەمەوە. بۆچی هێندە دەبەنگن؟" دواتر، وەک ئەوەی وەڵامی من بزانێت، درێژەی دایێ و گوتی: "باشە، گەمژە نین، بەڵام مێشکیان لە شتێکی کەمە." من نەمپرسی "ئەوانە" کێن. گوتی: "ئەرێ شوێنێک لە مێشکیاندا نییە جێی ئەو زانستانەی تێدا ببێتەوە؟" وەک ئەوەی بیەوێت بەدوای وشەیەکدا بگەڕێت، بۆ دەوروبەری خۆی ڕوانی: "پێویستە گۆشەیەک لە مێشکیاندا هەبێت بۆ جێگرکردنی شتومەکی تێکەڵ و پێکەڵی وەک قوتوو، و چاوەکانی ئەم دۆڵابە، بەڵام پێ دەچێت شتی

وایان نەبێت. تێ دەگەیت؟" دەمویست باوەڕ بەخۆم بهێنم شتێک تێ گەیشتووم، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبووم. هەردووکمان ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بووین. دواجار گوتی: "جا کێ دەزانێت مرۆڤ بۆچی بەم شێوەیە، یاخۆ بەجۆرێکی ترە؟" پاشان گوتی: "ئاخ، خۆزگە بەڕاستی پزیشک دەبوویت و منت فێر دەکرد جەستەمان چییە و چی لە کەللە و لەشماندا هەیە." وا دەهاتە پێش چاو کەمێک شەرم بکات. لەبەر ئەوەی نەیدەویست بمترسێنێت، بەشێوەیەکی سرووشتی ڕای گەیاند: "لەوانە نیم خۆم بە دەستەوە بدەم، تا کۆتایی بەردەوام دەبم. هەم لەبەر ئەوەی پەرۆشی زانینی ئاکامم و هەم بەهۆی ئەوەی شتێکی تر شک نابەم بیکەم. من تێ نەدەگەیشتم، بەڵام ئەگەر بیرم دەکردەوە هەموو ئەو شتانە لە منەوە فێر بووە، بسکەی سمێلم دەهات.

لە کاتەکانی دواتردا وەک ئەوەی هەردووکمان بزانین واتەی ئەم قسەیە چییە، لەسەریەک دووبارەمان دەکردەوە. لەم بڕیارگرتنەی خۆیدا وەک قوتابییەکی خەیاڵفراوان و بەردەوام پرسیارکەر خۆی پێشان دەدا. هەر جارێک دەیگوت تا کۆتایی بەدوای ئەم کارەوە دەبم، من وا هەستم دەکرد بینەری ناڵینی خەمگین و هەڵچووی ئەڤیندارێکی دەستەوستانم پرسیاری هۆکاریی ئەو نەهامەتییانە دەکات کە بەسەری هاتوون. لەو ماوەیەدا ئەو قسەیەی زۆر دەگوتەوە. کاتێک بە خۆسازدانی یەنیچەرەکانی بۆ یاخیبوون دەزانی، دەیگوتەوە. دوای ئەوەی بۆ منی دەگێڕایەوە چۆن منداڵانی دەرزخانە زیاتر پەرۆشی فریشتەن نەک ئەستێرە، دووپاتی دەکردەوە. پاش کڕینی دەستنووسێک بە چەردەیەک پارە و پێش ئەوەی لە خوێندنەوەیدا بگاتە نیوەی، بە تووڕەبوونەوە توڕی دەدایە لاوە، هەمان شتی کاوێژ دەکردەوە. دوای گەڕانەوەی لەکن دۆستانی موەقیتخانە کە ئیدی وەک خوویەک سەری لێ دەدا، دەیپرسیەوە. پاش خواردنی سەرما لە گەرماو بەهۆی باش گەرم نەکردنی و دوای ئەوەی لەپاڵ کتێبە خۆشەویستەکانیدا لەسەر لێفەی بە گوڵ نەخشێندراو پاڵ دەکەوت و پاش ئەوەی لە حەوشەی مزگەوت گوێی لە قسەی تووڕەهاتی دەستنوێژ هەڵگران دەگرت، هەمان بالۆرەی دەگوتەوە. دوای

ئەوەی بیستی ڤینیسیاییەکان ڕەوە کەشتیی ئەمانیان بەزاندووە و پاش ئەوەی بەددان بەخۆداگرتنەوە گوێی بۆ خەڵکی گەڕەک ڕادەگرت کە پێیان دەگوت وا خەریکە تەمەنی بەسەر دەچێت و بۆ ئەوە هاتوون هانی بدەن ژن بهێنێت، دیسان هەمان شتی دەیگوتەوە: تا کۆتایی بەدوای ئەم کارەوە دەبم.

ئێستا بیر دەکەمەوە: کام خوێنەر لەوانەی ئەم نووسراوەم تا کۆتایی دەخوێننەوە و بە پشوودرێژی بەدوای ڕووداوەکان، یان هەر شتێکی تری خەیاڵکردی خۆمدا دەچن، دەتوانێت بڵێت خۆجە پابەندی ئەم بەڵێنەی خۆی نەبوو؟

٤

لە ڕۆژێکی کۆتایی بەهاردا بیستمان تەرمی حوسێن ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسان لە نێزیک ناوچەی ئیستینیەی قەراغ تەنگەی بوسفۆر دۆزراوەتەوە. کەواتە والی لە دوایین ساتدا فەتوای کوشتنی دەرکردبوو. ئەویش ئەوە نەبوو سەر کز بکات و لە حەشارگەی خۆیدا ئارام بگرێت، بگرە بەڕاست و چەپدا نامەی دەنارد و دەینووسی نیشانەی مردنی والی سادق پاشا دەرکەوتووە و بەم زووانە دەمرێت. بەمجۆرە، حوسێن ئەفەندی شوێنی خۆی ئاشکرا کردبوو، هەوڵی دابوو ڕوو لە ئەنادۆڵ بکات، بەڵام پیاوکوژان خۆیان گەیاندبووە بەلەمەکەی و خنکاندبوویان. خۆجە بیستی دەست بەسەر ماڵ و سامانی گەورەی ئەستێرەناساندا گیراوە و کەوتە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی کاغەز و کتێب و دەفتەرەکانی. بۆ ئەمەش، هەرچی پارەیەک کۆی کردبووەوە، کردی بە قورگی بەرتیلخۆراندا. ئێوارانێکی درەنگ سندووقێکی گەورەی بۆ ماڵەیەوە هێنایەوە و بە هەفتەیەک هەزاران پەڕەی ناو سندووقەکەی خوێندەوە. دواجار بە هەڵچوونەوە گوتی شتی زۆر باشتر لەوانەی لە دەست دێت.

هەر ئەوەندەی دەستی کرد بەکار، منیش هاوکاریم کرد. بۆ دوو کتێب بەناوی "حیاة الحیوان وعجائب المخلوقات" کە بڕیاری دابوو پێشکێش بە سوڵتانی بکات، من باسی ئەو ئەسپە جوان و گوێدرێژە ئاسایی و کەروێشک و مارمێلکانەم بۆ گێڕایەوە کە لە باخچەی فراوان و مێرگی ماڵەکەی ئەمپۆلیماندا دیبوومن. دوای ئەوەی خۆجە بە ئاماژەیەک لە سنوورداربوونی بیرەوەرییەکانم منی ئاگادار کردەوە، بۆقی فەرەنگی و سمێڵداری ناو حەوزی نیلوفەری، تووتیی شینی سیسیلیاییی زمان و ئەو سمۆرانەم بیر کەوتەوە کە

پێش جـووتبـوونیـان، بەرامـبـەر بەیەک دادەنیـشـتن و تووکی یەکتـریان پاک دەکردەوە. هەمـوو ئەمانەم بۆی گێڕایەوە. ژیانی مێروولە کە زۆر مـایەی بایەخ پێـدانی سـوڵتـان بوو، بەڵام بەهۆی پاک و خـاوێنیی لە ڕادەبەدەری حـەوشـەی ناوەوەی کۆشکەوە وەک پێـویست زانیـاری لەو بارەوە نەبوو، بوو بـە یەکێک لە بەشەکانی کتێبەکە و ماوەیەکی درێژ کارمان لەسەر کرد.

خـۆجە لەگەڵ دەسـتکردن بـە نووسـینەوەی ژیانی ڕێکوپێک و لۆجـیکداری مێروولەدا، پێشبینی دەکرد ئێمە هەمـان کات سوڵتان پەروەردەش دەکەین. بۆ ئەو مەبەستە، باسکردنی مێروولەی ڕەشی ناسراوی بەلای ئێمەوە بەکەم زانی و باسـی چۆنیـەتیی نەزمی مـێروولە سوورەکانی ئەمریکای گێڕایەوە. ئەمـەش بیرۆکەی ئەوەی پێی بەخـشـی کتـێبێکی هـەمـان کات خـەمگین و سـوودبەخش سەبارەت بە بەسەرهـاتەکانی خەڵکی خـۆجێی دەبەنگی ئەو وڵاتە پڕ لـە مارەی ئەمـریکای پێ دەگـوترێت و ڕووداوەکـان هـیـچ شـتـێکیـان لە ڕەوتی ژیانیـان نەگۆڕیبـوو، بنووسێت. بەدەم گێڕانـەوەی وردەکارییەکانەوە، گـوتی بەسـەرهـاتی ئەو پادشـا منداڵەش دەنووسم کـە لەبەر بایەخ نەدانی بە زانست، گـاورەکانی ئیسپانیا دواجار لەسەر مێخ دایاننیشاند، بەڵام خۆجە هـەرگیز غیرەتی نەکرد ئەو کتێبە تـەواو بکات. نیگارەکانی ئـەو وەسـتـای میناتورەی بانگمان کردبوو وێنەی کـامـێـشی باڵدار و گـای شـەش پێ و مـاری دووسـەرمـان بـەشـێوەیەکی بەرجـەسـتـە بۆ بکێشێت، جێی ڕەزامەندیمان نەبوو. خۆجـە گوتـی: "ڕاسـتی لە ڕابردوودا بەو جۆرە بوو، بەڵام ئێستا هـەمـوو نیگارێک سێ ڕەهەند و سێبەری ڕاسـتـەقینەی هـەیە. تۆ بڕوانە؛ تەناتەت مێروولەیەکی زۆر ئاسایی، وەک ئەوەی هـاوجـمکی خـۆی بەدوای خـۆیدا ڕابکێـشـێت، سـێـبـەری خـۆی هـەڵگرتووە و لەسەرخۆ دەیگوازێتەوە.

لەبەر ئەوەی سـوڵتـان هـیـچ لێی نەپرسـییـەوە، بڕیاری دا کـتێـبـەکـان لە ڕێی والییەوە پێشکێش بە سـوڵتـان بکات، بەڵام دواتر زۆر لەمـە پەشـیـمـان بووەوە. والی گوتبووی: "ئەسـتێرەناسـی سۆفیگەرییە، حوسێن ئەفەندی دەسـتی دابووە کـاری باڵاتـر لە بەژنی خـۆی و دەسـتی کـردبوو بـە فـرت و فـێـڵی سـیـاسـی.

ئێستاش گومانم هەیە تۆ چاوت لە جێی ئەو بڕیبێت. من بڕوام بە شتێک هەیە زانستی پێ دەگوترێت. ئەمەش پێوەندیی بە چەکەوە هەیە، نەک بە ئەستێرەوە. ئەستێرەناسی کارێکە نەگبەتی بەدواوەیە. ئەمەشم لەوەوە بۆ دەرکەوتووە هەموو ئەوانەی چوونەتە ئەو کارەوە، یان کوژراون، یاخۆ لە هەمووی خراپتر، ڕۆژێک لە ڕۆژان بەشێوەیەکی نهێنی بێ سەروشوێن کراون، بۆیە بەهیچ جۆرێک نامەوێت تۆ کە زۆرم خۆش دەوێیت و باوەڕم بە زانستەکەت هەیە، ئەو ئەرکە بگریتە ئەستۆ. بڕیار وایە پۆستی گەورەی ئەستێرەناسان بدرێت بە سدقی ئەفەندی. ئەو، بەشی ئەوە گەمژە و ساویلکەیە بتوانێت پێداویستییەکانی ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنێت. بیستوومە دەستت بەسەر کتێبەکانی گەورەی ئەستێرەناسانی پێشوودا گرتووە. داوات لێ دەکەم توخنی ئەو کارە نەکەویت." خۆجەش پێی گوتبوو لە زانست بترازێت، خۆی بەهیچ شتێکی ترەوە خەریک ناکات. پاشان ئەو کتێبانەی دابوویێ کە دەیویست بە سوڵتانی بگەیەنێت. ئێوارە لە ماڵ گوتی لە زانست بترازێت، خۆی بەهیچ شتێکی ترەوە سەرقاڵ ناکات، بەڵام هەرچییەک لە پێناوی پێرەوکردنی زانستەکەیدا پێویست بێت، دەیکات. وەک سەرەتای کاریش، ئەفرەتی لە والی کرد.

مانگی دواتر، ئەو دەمەی پەرۆشی زانینی چۆنیەتیی کاردانەوەی سوڵتانی منداڵ بووین لە بەرامبەر ئاژەڵە ڕەنگاوڕەنگەکانی زادەی خەیاڵی ئێمە، خۆجە بیری لەوە دەکردەوە بۆچی دەبێت تا ئێستا لە کۆشکەوە بانگ نەکرابێت؟ دواجار بۆ ڕاو بانگیان کرد. پێکەوە چووین بۆ کۆشکی میراخۆر لە کەناری چەمی کاغەزخانە بۆ ئەوەی ئەو لە تەنیشت سوڵتانەوە بێت و منیش لە دوورەوە سەیری بەزمی ڕاو بکەم. ئەو ناوە زۆر جەنجاڵ بوو. سەرکردەی پاسەوانان گشت شتێکی ئامادە کردبوو. هەموومان بینیمان چۆن کەروێشک و ڕێوی بەرەڵا کران و تاژی نیشتنە سەریان. سەرجەم چاوەکان بینییان چۆن یەکێک لە کەروێشکەکان لە هاوڕێکانی جیا بووەوە و خۆی هەڵدایە ئاوەوە، بە مەلە خۆی گەیاندە ئەوبەری ئاو، بینیمان و گوێمان لێ بوو پاسەوانەکان

ویستیان لەویش سەگی تێ بەردەن، بەڵام سولتان مۆڵەتی نەدا و گوتی: "با کەروێشک ئازاد بێت." سەگێکی بەرەڵا لەوبەری ڕووبار بوو، کەروێشکی بەستەزمان دیسانەوە خۆی هەڵدایە ناو ئاو، بەڵام سەگەکە فریای کەوت و گرتی. پاسەوانەکان دەستبەجێ خۆیان گەیاندێ و کەروێشکیان لە دەمی دەرهێنا، هێنایانە بەردەمی سولتانی مندالّ، ئەویش یەکسەر کەروێشکی پشکنی و دڵخۆش بوو بەوەی برینی سەختی پێوە نەبوو. پاشان دەستووری دا ببرێتە سەر شاخ و لەوێ ئازاد بکرێت. دواتر، ئاپۆڕەیەک کە خۆجە و گرگنە قژ سوورەکەشم لە ناویاندا بینی، لە دەوری سولتان گرد بوونەوە.

خۆجە، ئێوارە گێڕایەوە گوتی: سولتان پرسیاری چۆنیەتیی لێکدانەوەی ڕووداوەکەی کردبوو. دوای هەمووان نۆرەی خۆجە هاتبوو قسە بکات و گوتبووی لە شوێنی چاوەڕوان نەکراوەوە دوژمن بۆ سولتان پەیدا دەبێت، بەڵام بێ دەرد و بەڵا لەو مەترسییە دێتە دەرێ. ئاپۆڕەکە، هەوڵیان دابوو لێکدانەوەکەی خۆجە، لەبەر ئەوەی باس لە دوژمن و مەترسیی مردن دەکات و تەنانەت سولتان لەگەڵ کەروێشکدا بەراورد دەکات، خراپ لە سولتان بگەیەنن، بەڵام سولتان هەموویانی، بە سدقی ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسانیشەوە بێدەنگ دەکات دەڵێت قسەکانی خۆجە دەکات بە گوارە و لە گوێیان دەکات. پاشان بەدەم سەیرکردنی نیشتنەوەی چەند بازێک بەسەر قەڵەڕەشێکەوە و بینینی کۆتاییی خەمگینی ڕێوییەک کە بەهەموو تواناوە بەرگری لە خۆی دەکرد و لە ئاکامدا تاژییە بێ شەرمەکان لەتوپەتیان کرد، سولتان گوتبووی شێرەکەی دوو بەچکەی بووە، یەکێکیان نێرە، ئەوی تریان مێیە و هەردووکیشیان هاوکێشی یەکترن و کتێبەکانی ئاژەڵانیشی زۆر بەدڵ بووە. پرسیاری گای باڵ شین و پشیلەی پەمەییی مێرگەکانی کەناری ڕووباری نیلی کردبوو. خۆجە بەشێوەیەکی سەیر مەستی سەرکەوتن بوو، هەمان کات ترسیشی لێ نیشتبوو.

ماوەیەکی زۆر دوای ئەوە هەواڵمان زانی چەند شتێک لە کۆشکدا ڕوویان داوە: سولتان کوێسەم دەستی لەگەڵ ئاغاکانی یەنیچەرە تێکەڵ کردووە و

نەخشەیەکی داڕشتووە بۆ بە کوشتدانی سوڵتان و دایکی و دانانی شازادە سلێمان لە جێی سوڵتان، بەڵام هەوڵەکەی سەری نەگرتووە. تا مردن دەست خرابووە بیناقاقای سوڵتان کوێسەم و خوێن لە دەم و لووتی فیچقەی کردبوو. خۆجە هەواڵی ڕووداوەکانی لە میانەی قسە و قسەڵۆکی هاوڕێ گەمژەکانی دەچوونە موەقیتخانەوە پێ دەگەیشت. جاروبارێش دەچووە دەرزخانە، ئەگەرنا، ڕووی لە هیچ شوێنێکی دی نەدەکرد.

لە پایزدا بیری کردەوە جارێکی تر بیردۆزەی کۆسمۆگرافی بگرێتەوە دەست، بەڵام تووشی نائومێدی بوو: ڕوانگەخانەیەک پێویست بوو. دەیگوت هەروەک چۆن گەمژەکان قروشێک بە ئەستێرە نادەن، ئەستێرەکانیش هیچ بایەخێک بۆ ئەوان دانانێن. زستان هات و تەم ڕۆژگاری داگرت. ڕۆژێک بیستمان والی لە کار دوور خراوەتەوە. ویستبوویان ئەویش بخنکێنن، بەڵام دایە سوڵتان ڕازی نەبووبوو، دەست بەسەر ماڵ و موڵکیدا گیرابوو، خۆیشی بۆ ئەرزنجان دوور خرابووەوە. دواتر جگە لە هەواڵی مردنی، هیچ دەنگوباسێکی تریمان پێ نەگەیشتەوە. خۆجە گوتی ئیدی لە کەس ناترسێت و قەرزاری هیچ کەسێکیش نییە. نەمزانی داخۆ لەو کاتەدا بیری لەوە کردووەتەوە زۆر شت لە منەوە فێر بووە، یاخۆ نا؟ ئیدی نە لە منداڵەکە دەترسا و نە لە دایکی. دەتگوت دروشمی: "یان گەیشتن بە لوتکەی دەوڵەت، یان مردار بوونەوە وەک قەلەڕەشکە"ی بەرز کردووەتەوە! لە ماڵ بە بێدەنگی لە ناو کتێبەکانماندا دادەنیشتین، لە بارەی مێروولە سوورەکانی ئەمریکاوە دەدواین و خەیاڵاتی مێرووڵەنامەیەکی نوێمان دادەڕشت.

ئەو زستانەشمان وەک زۆری پێشووتر و دواتر لە ماڵ بەسەر برد. هیچ شتێک نەقەوما. لە شەوانی سارددا، لە نهۆمی خوارەوەی ماڵەوە کە بای باکور لە دەرگا و پەنجەرەکانەوە خۆی پێدا دەکرد، دادەنیشتین و قسەمان دەکرد. ئیدی بە چاوی سووک بۆمی نەدەڕوانی، یان وای پێشان دەدا بەو جۆرە بۆم ناڕوانێت. من، هۆی ئەم نێزیکبوونەوەی ئەوم گەڕاندەوە بۆ ئەوەی نە لە کۆشک و نە لە دەوروبەری کۆشکەوە کەس بەدوویدا نەدەنارد.

جاروباریش بیرم دەکردەوە ئەویش وەک من لێکچوونی نێوانمان دەبینێت. بە خۆمم دەگوت ئیدی کاتێک سەیری من دەکات، خۆی دەبینێت، بەپەرۆش بووم بزانم لەو ساتانەدا بیر لە چی دەکاتەوە. کتێبێکی تری درێژمان لەسەر ئاژەڵان تەواو کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی والی دوور خرابووە و خۆجەش دەیگوت ئامادە نییە بۆنی دەمی ناسیاوە دوورەکانی هاتوچۆکەری کۆشک بکات، کتێبەکە هەروا لەسەر مێز کەوتبوو. جاروبار، لە بێزاریی ڕۆژانی بێکاریمدا، پەڕەکانیم هەڵدەدایەوە و سەیری نیگاری کوللەی مۆر و ماسییە فریوەکانی دەستکاری خۆمم دەکرد و بەپەرۆش بووم بزانم سوڵتان لە کاتی خوێندنەوەی ئەم دێرانەدا بیر لە چی دەکاتەوە.

سەرەتای بەهار ئینجا خۆجە بانگ کرا. سوڵتانی منداڵ بە بینینی خۆجە زۆر کەیفخۆش بووە. بەگوێرەی قسەکانی خۆجە، لە سەرجەم ڕەفتار و گوتارییەوە بۆی دەرکەوتبوو ماوەیەکی درێژە بیری لە خۆجە کردووەتەوە، بەڵام بەهۆی پاڵەپەستۆی گەجەر و گوجەری دەوروبەرەوە لە دووی نەناردووە. سوڵتان یەکسەر قسەی بردبووەوە سەر پیلانەکەی ئەنکی و گوتبووی خۆجە پێشبینیی ئەم مەترسییەی کردووە، بەڵام هەمان کات پێشبینیی ئەوەشی کردووە سوڵتان بە سەلامەتی لەو مەترسییە ڕزگاری دەبێت. سوڵتان، ئەو شەوە هیچ لە ژاوەژاوی بەنیازی لە ناوبردنی ئەو سازکراو نەترساوە، چونکە ئەو سەگە ناپاکەی بیر کەوتبووەوە کە ددانەکانی کاریان لە کەروێشکەکە نەکردبوو. سوڵتان، دوای پیاهەڵدان و ستایشکردن، دەستووری دابوو لە شوێنێکی گونجاو کێڵگەیەک بدرێت بە خۆجە. بەرلەوەی کار بە فاڵگرتنەوە بکات، خۆجە ناچار بووبوو بێتە دەرەوە. پێشیان گوتبوو دەبێت بۆ بەراتی کێڵگەکە تا کۆتاییی وەرزی هاوین چاوەڕێ بکات.

خۆجە لە ماوەی چاوەڕوانیکردندا و بە پشتبەستن بە داهاتی کێڵگەکەی، نەخشەی داڕشت بۆ دامەزراندنی ڕوانگەخانەیەکی بچووک لە باخچەی ماڵەوەدا. پێوانەکانی ئەو چاڵەی دەبوو هەڵبکەندرێت و تێچوونی ئەو ئامێرانەی پێویست بوو جێگیر بکرێن، حسێب کرد، بەڵام ئەمجاریان هەر زۆر

زوو بێزار بوو. لەو سەروبەندەدا دەستنووسێکی بە هێلێکی ناخۆش نووسراوی کتێبێکی دۆزییەوە. دەستنووسەکە ئەنجامی چاودێریکردنی ئەستێرەی لەلایەن سۆفی تەقیەدین ناوێکەوە لە خۆ گرتبوو. دوو مانگی خۆی بە پشکنینی ڕاستی و دروستیی چاودێریکردنەکانەوە بە خەرج دا، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆی ئاشکرا نەبوو کام هەڵە لە ئامێرە هەرزان بەهاکانی خۆی و کامیان لە تەقیەدین خۆی و کامیان لە بێ سەروبەریی کتێبە دەستوخەت ناخۆشەکەوە سەرچاوەی گرتووە، لە ئاکامدا بە هەڵچوونەوە دەستی لە کار هەڵگرت. ئەو شتەی زیاتر ڕقی هەڵساند، چەند بەیتێکی سەروادار و هاوکێش بوون کە بەشێوازی شەشەوانە حسێب کرابوون و لەلایەن یەکێک لە خاوەنەکانی پێشووتری کتێبەکەوە خزێندرابوونە نێوان خشتەی سێگۆشەییی هێڵەکانەوە. خاوەنی کتێبەکە بە بەکارهێنانی حسێبی ئەبجەد و بە گرتنەبەری شێوازی تر، چەند بۆچوونێکی سادەی سەبارەت بە داهاتووی جیهان خستبووە ڕوو: بەو پێیە دەبوو کابرا دواجار لە دوای چوار کچ، کوڕێکی ببێت، پەتایەک بڵاو ببێتەوە بێ تاوانان لە گوناهکاران جیا دەکاتەوە و بەهانەدین ئەفەندیی هاوسێشی دەمرێ. خۆجە، ئەگەرچی لە سەرەتاوە کەیفی بە خوێندنەوەی ئەو فاڵانە دەهات، بەڵام دواتر دووچاری نائومێدی بوو. ئیدی بە باوەڕ بەخۆبوونێکی سەیر و ترسناکەوە باسی ناواخنی مێشکمانی دەکرد. بەجۆرێک دەدواین وەک ئەوەی باسی سندووقگەلێک بکەین و بتوانین سەریان هەڵبدەینەوە و سەیری ناویان بکەین، یان باسی دۆلابەکانی ناو ژوورەکە بکەین.

ئەو کێڵگەیەی سوڵتان دەستووری دابوو بدرێت بە خۆجە، نە لە کۆتاییی هاوین و نە لە سەرەتای زستاندا بەناوییەوە نەکرا. لە بەهاریشدا پێیان گوتبوو تۆمارێکی نوێی بۆ دەکرێت و دەبێت چاوەڕێ بکات. لەو ماوەیەدا، ئەگەر جاربەجاریش بوایە، بۆ کۆشک بانگ دەکرا و وەڵامی پرسیارەکانی سوڵتانی لەمەڕ لێکدانەوەی پەیدابوونی درزێک لە ئاوێنەدا، برووسکەیەکی سەوز لە کەناری دووڕگەی یاسیادا، وردوخاشبوونی سوراحییەکی ڕەنگ

سووری خوێنینی پڕ لە ئاوی گێلاس لە شوێنی خۆیدا و سەبارەت بە ئاژەڵەکانی ناو دوایین کتێبی ئێمەی دەدایەوە. پاش گەڕانەوە بۆ ماڵ، دەیگوت منداڵەکە گەیشتووەتە قۆناغی پێگەیشتن. ئەمەش باشترین قۆناغە بۆ کاریگەریدانان لەسەر مرۆڤ و دەیگوت سوڵتان دەخاتە ناولەپی دەستی.

بۆ ئەو مەبەستە دەستی کرد بە نووسینی کتێبێکی سەرلەبەر نوێ. لە منەوە کۆتاییی ئارتیکەکان و بیرەوەرییەکانی کۆرتێزی بیستبوو، هەر لە سەرەتاشەوە چیرۆکی ئەو پادشا منداڵە بەلەنگازەی لە خەیاڵدا بوو کە بەهۆی پشتگوێخستنی زانستەوە لەسەر مێخ دانیشێندرابوو. ئەو ماوەیە لە بارەی کەسانێکی بی نامووسەوە قسەی دەکرد کە بە تۆپ و ئامێری شەڕ و ئەفسانە و چەکەوە لە کاتی خەودا پەلاماری مرۆڤە باشەکانیان داوە و ناچاریان کردوون سەر بۆ نەزمی ئەمان دابنەوێنن، بەڵام ئەو شتانەی خەریکی نووسینیان بوو، ماوەیەکی درێژ لە منی شاردنەوە. پێم وا بوو چاوەڕێی سەرنجی منی دەکرد، بەڵام تاسەی نیشتمانم لەو ڕۆژانەدا لەپڕ بەرەو نائومێدییەکی قوڵ بەکێشمی کردبوو، ئەمەش ڕقی منی لە بەرامبەر خۆجەدا ئەستوورتر کردبوو. پەرۆشیی خۆم جڵەو کرد و توانیم لە بایەخ نەدان بەو ئامانجانەی بە زیرەکیی خۆی و بە پشتبەستن بە خوێندنەوەی چەند کتێبێکی شڕ و هەرزان بەها و بە گێڕانەوەکانی من بە دەستی هێنابوو، سەرکەوتوو بم. بەمجۆرە، بە شادمانییەوە بینیم چۆن ڕۆژ بەڕۆژ، سەرەتا متمانەی بە خۆی و دواتر بەو شتە نەما کە سەرقاڵی نووسینی بوو.

دەچووە ژووری بچووکی سەرەوە و وەک ژووری کار بەکاری دەهێنا، لە بەردەم ئەو مێزەی من بە دروستکردنم دابوو، دادەنیشت، بگەرە بیریشی دەکردەوە، بەڵام نەیدەتوانی بنووسێت. هەستم دەکرد ناتوانێت بنووسێت. دەمزانی تا ڕای من لە بارەی بۆچوونەکانی خۆیەوە نەزانێت، ناوێرێت بنووسێت. ئەوەی وای لێ دەکرد متمانەی بە خۆی نەبێت، هەر کەموکورتیی بۆچوونە سادەکانی من نەبوو کە بەلای ئەوەوە مایەی ڕق لێ بوونەوە بوو،، ڕاستییەکەی، ئەو دەیویست زانستەکانی من و بیرکردنەوەی "ئەوانە"ی گشت

ئەو چاو قوتووی زانستانەیان لە مێشکی مندا چەسپاندبوو، فێر ببێت. گەلۆ ئەوانە لە ڕەوشێکی وەک ئەوەی ئەمدا چۆن بیر دەکەنەوە؟ ئەمە پرسیارێک بوو دەیویست ژیانی خۆی لە پێناودا دابنێت و لە منی بکات، بەڵام نەیدەکرد! ئای چەندە چاوەڕێم کرد پێ بە جەرگی خۆیدا بنێت و ڕاست و مەردانە ئەو پرسیارەم لێ بکات! بەڵام نەیپرسی. دوای ماوەیەک دەستی لەو کتێبە هەڵگرت، جا نازانم تەواوی کرد، یاخۆ نا. سەرلەنوێ گەڕایەوە سەر بەزمی "گەمژەکان". دەیگوت پێڕەوکردنی زانستی ڕاستەقینە بە تێگەیشتن لە هۆکاری گەمژەیی ئەواندا تێ دەپەڕێت، بە زانینی هۆی ئەوەی بۆچی مێشکیان وایە و پاشان بیرکردنەوە لەبەر ڕۆشنایی بەرئەنجامەکانیدا! بەخۆم دەگوت لە نائومێدیدا هەمان شت کاوێژ دەکاتەوە، چونکە لە کۆشکەوە ئاماژەی بانگهێشتی چاوەڕوانکراوی پێ نەدەگەیشت. کات بەفیڕۆ دەچوو. قۆناغی باڵقبوونی سوڵتانیش بە کەڵکی هیچی ئەوتۆ نەدەهات.

لە هاوینی پێش گەیشتنی کۆپرولو مەمەد پاشا بە پلەی باشوەزیر، خۆجە دواجار بە کێڵگەکەی شاد بوو، بەدڵی خۆی شوێنێکی گونجاوی هەڵبژارد. داهاتی دوو ئاشی ئاوی دەوروبەری گەبزە و داهاتی دوو گوندی سەعاتە ڕێیەک دوور لە شارۆچکەکەی بۆ دیاری کرابوو. لە وادەی بەروبووم کۆکردنەوەدا چووین بۆ گەبزە و هەمان خانووە کۆنەکەی پێشوومان بەکرێ گرت، چونکە بەڕێککەوت چۆڵ کرابوو. بەڵام خۆجە ئەو مانگانەی لەوێمان بەسەر بردبوو، ئەو ڕۆژانەی من مێزەکەم لای دارتاش هێنایەوە و ئەو نەفرەتی لێ دەکرد، هەمووی لە بیر کردبوو. وا دیار بوو بیرەوەرییەکانی ئەمیش وەک ماڵەکە کۆن و دزێو بووبن. تووشی بێ ئۆقرەییەکیش هاتبوو بواری پێ نەدەدا خۆی بەهیچ شتێکی ڕابردووەوە خەریک بکات. چەند جارێک سەردانی گوندنیشنەکانی کرد و کاروبارەکانی بەسەر کردەوە. بڕی داهاتەکانی ساڵی پێشووی بۆ ئاشکرا بوو، ئاشکراشی کرد لە ژێر کاریگەریی ئەحمەد پاشای تەرخونچوودا کە ئەم ناوی لە دۆستەکانی خۆیەوە لە موەقیتخانە بیستبوو، فێری شێوازێک بووە بۆ تۆمارکردنی بڕی داهاتی کێڵگەکەی بەجۆرێکی سادە

و شیاوی تێگەیشتن.

بەڵام بەم داهێنانەشەوە ڕانەوەستا، چونکە نە باوەڕی بە ڕەسەنایەتی و نە بە سوودەکانی هەبوو. دانیشتنەکانی شەوانەی لە باخچەی پشتەوەی ماڵ و ڕوانینی بۆ ئاسمان سەرلەنوێ خولیای گەردوونناسی تێدا زیندوو کردبووەوە. جارێکیان منیش غیرەتم خستە بەر، چونکە پێم وا بوو دەتوانێت بیر و ڕامانی خۆی هەنگاوێک بباتە پێشەوە، بەڵام ئەو نیازی چاودێریکردن، یان بەرهەمهێنانی ئەقڵی نەبوو. منداڵان و هۆشمەندترین ئەو گەنجانەی لە گوند و لە گەبزە دەیناسین، بۆ ماڵ بانگ کرد و پێیانی ڕاگەیاند فێری بەرزترین زانستیان دەکات. منی ناردەوە بۆ ئەستەنبوڵ بۆ هێنانی میناتور و زەنگەکان، خۆیشی دەستێکی پیایاندا هێنایەوە، چەوری کردن و لە باخچەدا بۆ میوانەکانی دامەزراند. ئێوارانێک، بەهێز و بە ئومێدێکی زۆرەوە، من نەمتوانی تێ بگەم لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت، بەجۆش و بێ زیاد پێوەنان ئەو بیردۆزانەی ئاسمانی دووپات کردەوە کە پێشتر بۆ والی و دواتر بۆ سوڵتانی شی کردبوونەوە. ڕۆژی دواتر لەبەر دەرگای ماڵەکەماندا دڵی کونکونی مەڕێکمان دۆزییەوە هێشتا خوێنی لێ دەچۆڕا. ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی بۆ دواجار هیوای خۆمان لە گەردوونناسی و ئەو ئاپۆڕەیەش ببڕین کە بێ ئەوەی تەنانەت پرسیارێکیش بکەن، لە نیوەی شەودا بڵاوەیان کرد و هەرکەس بۆ ماڵی خۆی گەڕایەوە.

ئەم دۆڕانەشی زۆر گەورە نەکردەوە و بەسەر خۆی نەهێنا. پێی وا بوو ئەوانە کەسانێک نین لە خولانەوەی زەوی و ئەستێرەکان تێ بگەن و پێویستیش ناکات لەم کاتەدا تێ بگەن. ئەوەی دەبوو لەم بابەتە تێ بگات، کەسێک بوو لە دەورانی باڵقبووندا بوو. لەوانەیە لە ئامادەنەبوونماندا منەمانی کردبێت. کەچی ئێمە وا خەریکە لێرە لە پێناوی بە دەستخستنی چوار پێنج قروشی دوای کۆکردنەوەی بەروبووم ئەو هەلە لە دەست دەدەین. یەکسەر دوای ئەوەی کاروبارەکانی خۆمان جۆر کرد، یەکێک لە لاوە ئاوەزیاوەکانی بەڕواڵەت هۆشمەندترینی لاوی دێی بە سەرپاڵە گرت و خۆمان

گەڕاینەوە بۆ ئەستەنبوڵ.

سێ ساڵی دوای ئەوە لە ڕیزی خراپترین ساڵانی ئێمەدا بوون. هەر ڕۆژێک و مـــانگێک و وەرزێک بەســـەرمـــان دەبرد، دووبارەبوونەوەیەکی بێــزار و وەڕسکەری ڕۆژ و مـــانگ و وەرزی پێــشـــووی خـــۆیان بوون. بەدەم دەرد و نائومێدییەوە هەمان شتەکانی پێشوومان دەبینییەوە و دەتگوت چاوەڕێی دۆڕانێکی ناو لێ نەنراو بکەین. دیسان ناوبەناو لە کۆشکەوە بەدوای خۆجەدا دەنێـردرا و داوای لێکدانەوەی بێ شـەرمـانەی لێ دەکـرا. دیســان، هەمــوو دوانیــوەڕۆیەکی ڕۆژانـی پێنـجـشـەمـە لەگـەڵ هـاوزانیـارەکـانی خـۆیدا لە موەقیتخانە بەیەک دەگەیشتن و قسە و باسیان ئاڵوگۆڕ دەکرد. ئەگەرچی بەهەمان ڕێکوپێکیی جارانیش نەبوو، بەڵام دیسان بەیانیان قوتابیانی دەبینی و لێیـانی دەدا. دیسـان. سـەرەڕای ئەوەی کەمـێک شل بووبوو، بەڵام هێشتا دەیتوانی خۆی لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا ڕابگرێت کە بەمەبەستی هاندانی ئەم بۆ ژنان هێنان دەهاتن. دیســان، ناچار دەبوو لە پێناوی خـەوتن لەگـەڵ ژناندا گوێ لە موزیکێک بگرێت کـە خۆی دەیگوت حـەزی لێی نییە. دیسـان، هەندێک جـار وا دەهاتە بەرچاو وەک ئەوەی لەو نەفرەتەدا کـە لە گەمژەکـانی دەکـات، نقـوم بووبێت. دیســان، دەچووەوە ژوورەکـەی خـۆی، لە جـێگەدا ڕادەکشا و دوای هەڵدانەوەی پەڕەی کتێب و دەستنووسەکانی دەورووبەری بە هەڵچوونەوە، چەندین سەعات بۆ بنمیچەکەی دەڕوانی و چاوەڕێی دەکرد.

ئەوەی لە نائومێدی ئەمی زیاتر دەکرد، سـەرکەوتنەکانی کۆپرولو مـەمەد پاشا بوو. ئەم لە ڕێی دۆستەکانی موەقیتخانەوە هەواڵەکانی پێ دەگەیشت. دەیگێـڕایەوە و دەیگوت ڕەوە کـەشـتـیی کـۆپرولو مـەمــەد پاشــا بەســەر ڤینیسیاییەکاندا سـەرکەوتووە و بۆزجائادا و لیمنیی بە دەست هێناوەتەوە، یان ئابازا حـەســەن پاشـای یاخـیـبـووی تەمێ کـردووە. درێژەی دەدایێ و دەیگوت: "ئەمانە کۆمـەڵێک سـەرکـەوتنی کۆتایی و کاتین، دوایین لەقـەفرتێی کـەمــئـەندامــێکە هێندەی پێ ناچێت لە قـوڕاوی دەبەنگی و بێ تواناییـدا دەچەقێت. وا دیار بوو چاوەڕێی خراپەیەک بکات بۆ گۆڕینی ئەو ڕۆژانەی کە

خۆیان دووپات دەکردەوە و ئێمەیان پتر ماندوو دەکرد. سەرباری هەموو ئەمانەش، حەوسەڵە و ئومێدی نەمابوو خۆی بەو شتەوە سەرقاڵ بکات کە بە زانست ناو دەبرا و ئەو خۆی پێیانەوە ماندوو دەکرد. خرۆشی هەر بیرۆکەیەکی نوێ لە هەفتەیەک زیاتر بڕی نەدەکرد، چونکە لە ماوەیەکی کورتدا دەبەنگەکانی بیر دەکەتەوە و هەموو شتێکی تری لە بیر دەکرد. ئایا ئەو هەموو بیرەی تا ئەو کاتە لەوانی کردبووەوە، بەس نەبوو؟ ئەو هەموو هەڵچوونە؟ لەوانەیشە نەیتوانیبێت هێز و ویست بۆ شۆڕبوونەوە بە وردەکارییەکانی ئەو زانستەدا گرد بکاتەوە، چونکە لەو کاتانەدا تازە بەتازە فێر بووبوو خۆی لەوانی دی جیا بکاتەوە، بەڵام هاتبووە سەر باوەڕهێنان بەوەی ئەو لەوان جیاوازترە.

یەکەمین خرۆشی ڕووناکیبەخش ڕاستەوخۆ لە هەناوی بێزارییەوە لە دایک بوو. لەبەر ئەوەی ئیدی نەیدەتوانی بە دووروودرێژی لە هیچ بابەتێک ڕامێنێت، کتومت جۆری ئەو منداڵە گەمژە و خۆپەرستانەی کە نازانن خۆیان بە چییەوە سەرقاڵ بکەن، ئەو ڕۆژانە بەوە کاتی بەسەر دەبرد خۆی بەم ژووری ماڵدا بکات و لەوی تریانەوە بێتە دەرەوە، سەربکەوێتە نهۆمی سەرەوە و دابەزێتە خوارەوە و بێ کار و کردەوە لە پەنجەرەکانەوە سەیری دەرەوە بکات. لە میانەی گەڕانی وەڕسکەر و بێ کۆتاییی ئەوەوە کە ماڵی لە تەختە بنیاتنراوی پڕ کردبوو لە جیک و هوڕ، دەمزانی چاوڕێی بەزمێک بۆ خۆ پێوە خەریککردن و بیرۆکەیەک و وشەیەکی ئومێدبەخش لە من دەکات، بەڵام من بەهۆی ئەوەی هێزی ڕق و نەفرەتم لە بەرامبەری هیچ کەمی نەکردبوو، سەرباریی چاوترساویی خۆیشم، وشەی چاوەڕوانکراوم پێی نەدەگوت. هەر جارێکیش بۆ دەستکەوتنی وەڵامێک لە من پێی لە جەرگی خۆی دەنا و چەند ڕستەیەکی بۆ دڵدانەوەم دەگوت، من ئەو وشە ڕزگارکەرەم هەر نەدەدرکاند. ئەو کاتانەی دەمبیست لە کۆشکەوە هەواڵێکی بەخێری پێ گەیشتووە، یان بیرۆکەیەکی نوێی هەیە و ئەگەر خۆی ڕابگرێت و دوای بکەوێت لەوانەیە ئەنجامێک بە دەستەوە بدات، من، یان خۆم کەڕوکپ دەکرد، یان دەستبەجێ لایەنی گشتی و

باوی قسەکانی ئەوم دەخستە ڕوو، و بەو جۆرە گڕی خرۆشیم دەکوژاندەوە. شادمان دەبووم ئەگەر دەمدی لە بۆشایی و نائومێدیدا پێچی دەخوارد.

بەڵام دواتر هەر لەو بۆشاییەدا بیرۆکەیەکی نوێی بۆ خۆ سەرقاڵکردن دۆزییەوە. ڕەنگە ئەم دۆزینەوەیەی لە ژێر کاریگەریی بەتەنیایی مانەوەی خۆیدا سەری گرتبێت، یان بەهۆی ئەوەی نەیدەتوانی هۆشی لە وردەکاریی هیچ شتێکدا چڕ بکاتەوە و بپەڕێتەوە دەرەوەی سنوورەکانی نائاسوودەیی خۆی. ئەو کاتە وەڵامم دایەوە، چونکە دەمویست هێزی بخەمە بەر و هانی بدەم. ئەو شتەی بەخەیاڵی ئەودا هاتبوو، سەرنجی منیشی ڕاکێشابوو. بیرم کردەوە لەو نێوانەدا هەست بە منیش بکات. ئێوارانێک، خۆجە بە هەنگاوەکانی، ماڵەکەی هێنایە کرتە، هاتە ژورەکەم و وەک ئەوەی لە بارەی شتێکی ڕۆژانە و زۆر ئاساییەوە بدوێت، لێمی پرسی: "بۆچی من منم؟" منیش لەبەر ئەوەی لە هاندانی بووم، وەڵامم دایەوە.

پاش ئەوەی پێم گوت نازانم بۆچی ئەو ئەوە، گوتم ئەم پرسیارە، لەوێ، لە نێوان ئەواندا، زۆر دەکرێت و هەموو ڕۆژێکیش زیاتر و زیاتر دەکرێت. کاتێک ئەمانەم دەگوت هیچ نموونە و بیرۆکە و شتێکی ترم لە خەیاڵدا نەبوو تا لە قسەکانمدا پشتیان پێ ببەستم، تەنیا ویستم بەو جۆرەی ئەو ئارەزوو دەکات، وەڵامی پرسیارەکە بدەمەوە. لەوانەیشە بە غەریزەیەکی سادەوە هەستم کردبێت ئەم گەمەیەی بەلاوە خۆش بێت. سەری سووڕما. بەپەرۆشەوە بۆمی دەڕوانی، دەیویست بەردەوام بم. "ئەوانیش ئەو پرسیارە لە خۆیان دەکەن؟" بە بینینی ئەوەی بە پێکەنینەوە سەری بەڵێی بۆ دەلەقێنم، یەکسەر هەڵچوو: "من ئەمەم نەپرسیوە لەبەر ئەوەی ئەوان دەیپرسن. بێ ئەوەی بزانم ئەوان ئەمەیان لە خۆیان پرسیوە، من لە خۆمم پرسیوە. بەلایشمەوە گرینگ نییە ئەوان چییان کردووە. دواتر بە خۆپێشاندانێکی سەیرەوە گوتی: "وا هەست دەکەم دەنگێک لە گوێیەکانمدا بەردەوام گۆرانیم بۆ دەڵێت. ئەم گۆرانیبێژەی قوڵایی ناو گوێیەکانی، باوکی خوا لێخۆشبووی هێنابووەوە یادی، ئەویش پێش مردنی گۆرانیبێژێکی لەو جۆرەی هەبووە، بەڵام گۆرانییەکانی ئەو

جـۆرێکی تر بووە. گـوتی: "ئەوەی من هـەمـان بالـۆرە دەڵێـتــەوە." لەوە دەچوو کەمێک شەرم بکات، درێژەی دایێ و گوتی: "من منم، من منم، ئاخ!"

خـەریک بوو بدەمە قـاقـای پێکەنین، بەڵام ددانم بە خـۆمدا گرت. ئەگەر ئەمـە گاڵتەیەکی خۆش بوایە، پێویست بوو ئەویش پێ بکەنێت. پێ نەدەکەنی، بەڵام خۆی هەسـتی کرد لە تـخـووبەکانی پێکەنین نێزیک بـووەتەوە. ئەوەی لەسـەر من بوو دەبوو پێـشـانی بدەم هەسـتم بە پێکەنینەکـەی و واتای بالۆرەکـە کردووە، چونکە ئەمـجـارەیان دەمـویست گەمـەکـە درێژە بکێشـێت. گـوتم پێـویسـتـە بالۆرەکە بەهەند وەربگیرێت. بێگومـان ئەو کـەسـەی لە قـوڵایی گـوێیەکانیـدا گـۆرانی دەچڕی، لە خـۆی بترازێت، کەسـێکی تر نـەبوو. لەوەدا بوو جـۆرێک لە گاڵتـە لە قسەکانمـدا بدۆزێتەوە، بەڵام لەپڕ هەڵچوو: خـۆیشـی ئەمەی نەدەزانی؛ ئەوەی ئەم دەیویست بیـزانێت، ئەوە بـوو بۆچی ئەو دەنگە هـەمـان ڕیـزە وشـە دەڵێتەوە؟

بێگومـان نەمگوت لە ڕووی بێزارییەوە، بەڵام لە ڕاسـتیـدا مەبەسـتم بوو پێی بڵـێم: نـەک هـەر خـۆم، بگرە لە ڕێـی خـوشـک و براکـانیـشـمـەوە دەمـزانی ئەو بێـزارییـەی لە منداڵانـی خـۆپەرسـتـدا بـەدی دەکـرێت، لەو جـۆرە بـەرهەمـە و تەنانەت شتی توورەهـاتـی تریشی لێ دەکەوێتەوە. گوتم پێویستە بیر لە واتای بالـۆرەکــە بکەینەوە نـەک هـۆیەکــەی. لـەپڕ بەخــەیاڵمــدا هـات بـۆی هـەیـە لەو بۆشـاییـیـەدا شـێـت بێت. ئەگـەر وا بوایە، مـنیش لە بێـزاریـی و نائومـێـدی و ترسنۆکیی ئەو ڕزگـارم دەبوو. لەوانەش بوو ئەمـجـار بەڕاسـتی پێی سـەرسـام بوومایە. ئەگەر ئەمـەی بکردبایە، ئەوا ئەمجارە شتێک لە ژیانی هەردووکماندا ڕووی دەدا. پاشـان دامـاوانـە گـوتی: "واتا چی بکەم؟" گـوتم بیـر لە هـەبوونی خۆت بکەرەوە. بەڵام ئـەمەم بەجۆرێک نەگوت وەک ئەوەی ئامـۆژگاریی بکەم، چونکە نەمـدەتوانی لەو بابەتەدا هـاوکـاریـی بکەم. هەمـوو کـارەکە کـەوتبـووە ئەسـتــۆی خــۆی. بەگـاڵتــەوە گـوتی: "واتا چ بکەم، سـەیری ئاوێنە بکەم؟" هێـوربوونەوەش بە ڕووخسـارییەوە دیار نـەبوو. من بێدەنگ بووم بۆ ئەوەی بیر بکەمـەوە. ئەو دووبـارەی کـردەوە: "سـەیری ئاوێنە بکەم؟" لەپڕ هەڵچـووم، بیـرم

کردەوە خۆجە بەتەنیا ناتوانێت بەهیچ ئاکامێک بگات. خۆزگەم دەخواست هەست بەم ڕاستییە بکات. دەمویست لە ناخەوە پێی بڵێم بەبێ من ناتوانێت بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە، بەڵام غیرەتم نەدەکرد. پێم گوت بە سستی و خاوی سەیری ئاوێنە بکات. نەخێر، غیرەت نا، بگرە هێزم تێدا نەبوو. هەڵچوو، بەدەم دەرچوونەوە لە ژوورەکە، دەرگای دا بە یەکدا و قیژاندی: "تۆ گەمژەیت."

دوای سێ ڕۆژ، سەرلەنوێ بابەتەکەم کردەوە و بۆم دەرکەوت ئەو دەیەوێت دیسان قسە بباتەوە سەر "ئەوان"، بۆیە من ویستم درێژە بە گەمەکە بدەم، چونکە تەنانەت تەنیا ڕاوەستانیش لەسەر بابەتەکە، لەو کاتەدا مایەی ئومێد بوو. گوتم ئەوانەی ئەوێ سەیری ئاوێنە دەکەن، بگرە زۆر زیاتر لەمانەی ئێرە، نەک بەتەنیا کۆشک و سەرای پادشا و شازادە و نەجیبزادەکان، بگرەماڵی کەسانی سادەش پڕ لە ئاوێنەی بە زەرافەت لە چوارچێوە گیراو و بە دیواردا هەڵواسراو. ئەمەشیان بۆ لاساییکردنەوەی پادشا و شازادەکان نییە، بگرە خۆیان ڕەنجیان لەو کارەدا کێشاوە و تیایدا پێشکەوتوون. بەپەرۆشی و سادەییەکیی مایەی سەرسووڕمانی منەوە پرسی: "لە کام کاردا؟" وای بۆچووم باوەڕی بەدانە بەدانەی قسەکانم کردبێت، بەڵام دوایی زەردەخەنەیەکی خستە سەر لێوی و گوتی: "کەواتە ڕۆژ تا ئێوارە سەیری ئاوێنە دەکەن!" جاری یەکەمی بوو گاڵتەی بەوانە دەکرد کە من لە نیشتمان لە دوای خۆم بەجێم هێشتبوون. بە هەڵچوونەوە بەدوای قسەیەکدا گەڕام ئاگر لە ڕۆحی بەربدات. بێ بیرکردنەوە و بێ ئەوەی خۆیشم باوەڕم بەوە هەبێت کە دەیڵێم، یەکسەر گوتم: "مرۆڤ تەنیا خۆی دەتوانێت بیر بکاتەوە و بزانێت چییە، بەڵام خۆجە بەشی ئەو کارە بوێری تێدا نییە." کۆڵێک دڵخۆش بووم کاتێک بینیم ئازار، وەک من دەمویست، ڕووخساری دەجەڕاند.

بەڵام ئەم دڵخۆشبوونەم زۆر گران لەسەر کەوت. نەک لەبەر ئەوە هەڕەشەی لێم کرد ژەهرم دەرخوارد بدات، نەخێر، بگرە لەبەر ئەوەی دوای چەند ڕۆژێک داوای لێم کرد ئەو بوێرییەی پێشان بدەم کە من بەوم گوتبوو توانای

پێشاندانی نییە. سەرەتا ویستم بەرگی گاڵتە بکەم بەبەر شتەکەدا. گوتم بیرکردنەوەی مرۆڤ لەوەی بزانێت چییە، گاڵتەیەکە لە جۆری سەیرکردنی ئاوێنە، گوتم ئەو قسانەم بە هەڵچوونەوە کردووە بۆ ئەوەی توورەت بکەم، بەڵام پێ نەدەچوو ئەو بڕوا بە قسەکانم بکات. هەڕەشەی لێم کرد ئەگەر بوێریی خۆم نەسەلمێنم، ئەوا خۆراکم کەم دەکاتەوە و لەوەش خراپتر، دەرگام لەسەر قفڵ دەدات. پێویست بوو بیر بکەمەوە من چیم و ئەنجامی بیرکردنەوەکەشم لەسەر کاغەز تۆمار بکەم. ئەوسا ئەویش بۆی دەردەکەوت ئەم کارە چۆن دەکرێت و منیش چەند بوێرم.

## ٥

سەرەتا، چەند پەڕەیەکم سەبارەت بەو ڕۆژە خۆشانەی لەگەڵ براکانم، دایکم و نەنکم "دایکی دایکم"دا لە کێڵگەی خۆمان لە ئەمپۆلی بەسەرم بردبوو، نووسییەوە. ڕاستییەکەی، نەمدەزانی بۆچی ئەمانەم هەڵبژارد بۆ گێڕانەوەی من بۆچی منم." پێم وا بێت لەبەر پێویستیی تاسەکردنی ڕۆژانی جوانی بەباچوو بوو. سەرباری ئەوەش، دوای قسەکانی توندەکانی ڕۆژی پێشووترم، خۆجە هێندە پاڵەپەستۆی خستبووە سەرم، وەک ئێستا ناچار بووم ترش و خوێ بە وردەکارییەکانەوە بکەم و بەخەیاڵ هەندێک شت بخولقێنم و بنووسم بەجۆرێک خوێنەر بڕوای پێ بکات. بەڵام خۆجە لە سەرەتاوە نووسینەکانمی پەسەند نەکرد، چونکە بە بۆچوونی ئەو، ئەمە کردەوەی کەسانێکە کە بەدەم سەیرکردنی ئاوێنەوە ڕادەمێنن و ئەوەشی من نووسیومە، شتگەلێکن هەموو کەسێک دەتوانێت بیریان لێ بکاتەوە و بیانووسێت. دەیگوت ئەمە ئەو بوێرییە نییە تۆ لە مندا بەکەمی دەبینیت. دوای خوێندەوەی ئەوەی چۆن جارێک لەگەڵ باوکم و براکانمدا چووین بۆ ڕاو، لەپڕ ورچێکی ئالپ لە بەردەممدا قووت بووەوە، ماوەیەکی درێژ چاومان بڕییە چاوی یەکتر؛ بەیانکردنی هەستی خۆم بەرامبەر مردنی لێخوڕی خۆشەویستی گالیسکەکانمان چۆن بە بەرچاومانەوە کەوتە ژێر پێی ئەسپەکانی خۆیەوە و دوایی لە ناو جێدا گیانی لە دەست دا، خۆجە هەمان وەڵامی دایەوە: هەموو کەسێک دەتوانێت ئەمانە بنووسێت.

بەدوای ئەو قسەیەیدا گوتم ئەو شتانەی ئەوانەی ئەوێندەرێش دەیکەن، لەمانە زیاتر نین. پێم گوت قسەی یەکەمم جۆرێک بووە لە زیاد پێوەنان، بە هەڵچوونەوە دەربڕدراوە و نەدەبوو لەوە زیاتر لە من چاوەڕێ بکات. بەڵام گوێی بۆم ڕانەدەگرت. لە ترسی قفڵدانی دەرگا لەسەرم، درێژەم بە

نووســـینەوەی خـــەیاڵەکـــانم دا . بەو جـۆرە، لـە مــاوەی دوو مــانگدا ناوبـەناو بەخـۆشی و جـاروباریش بەدەم ئازارەوە کـۆمـەڵێک بیـرەوەریی بـچـووکی لەو جۆرەی شـایەن بە بیرهێنانەوەم ڕێکخسـتەوە و چاوم پێدا گێڕانەووە. هەرچی شـتی باش و خـراپ هەیە، ئەوانەی تـا کـاتی کـەوتنە داوی دیلی بەسـەرم هاتبوون، هێنامەوە بەرچاوی خۆم و جارێکی تر هەستم بە ڕوودانیان کردەوە. لە ئاکامدا هەسـتم کرد چێژ لـەم کارەم وەردەگرم. ئیدی پێویسـتی نەدەکرد خۆجـە بۆ نووسینەوە زۆرم لێ بکات. هەر جارێک بیگوتایە ئەمـە ئەو شـتـانە نییە کە ئەو دەیەوێت، من دەسـتم دەدایە بیرەوەرییەکی تر و بەسـەرهاتێکی تر لەوانەی پێشوەخت بڕیاری نووسینەوەیانم دابوو.

پاش مــاوەیەکی درێژ، ئەگـەر دەمـدی خـۆجـەش چێـژ لە نـووسـراوەکـانم وەردەگرێت، کـەوتمە چاوەڕێکردنی کـاتێکی گونجـاو بۆ بەکێشکـردنی بۆ ناو ئەم گەمـەیە. بەمـەبەسـتی ئامـادەکردن و سـازدانی، باسـی چەنـد ئەزمـوونێکی سـەردەمی منداڵیی خـۆمم بۆی گێڕایەوە: بێ خـەوی و ترسـی شـەوێکی درێژ و نەبڕاوە؛ هەسـتی نـزیکیم لە برادەرێکی تافی لاویم کە خوومان بەوەوە گرتبوو لە یەک کاتدا بیر لە هەمـان شت بکەینەوە؛ دواتریش باسـی مردنی برادەرەکەم و ترسـی ئەوەم بۆ گـێڕایەوە وا تێ بگەن مـنیش مـردووم و بە زیندوویـی لەگـەڵ ئەودا بمنێژن: دەمـزانی کەیفی بەم شتـانە دێت! پاش ماوەیەکی کورت، غیـرەت گـرتمی و خـەونێکـی خـۆم بۆی گێڕایەوە: جـەسـتـەم لە خـۆم جیـا بووبـووەوە، لە تاریکیـدا لەگەڵ هاوشێـوەیەکی ڕووخسـار نادیاری خۆمدا سـازشـیـان دەکرد و هەردووکیان دەیانویست گەلەکۆمـەم لێ بکەن. خۆجـەش لەو ڕۆژانەدا دەیگوت دیسـانەوە زۆر بەچڕی هەمـان باڵۆرەی سـەمـەرەی ناو گوێی دەبیسـتێت. پاش ئەوەی بینیم، وەک خـۆم دەویست، کـەوتـبـووە بەر کـاریگـەریـی خـەونەکـەم، بە سـووربوونەوە پێم گوت ئەم جۆرە نووسـینـەوەیە کارێکە دەبێت ئەویش تاقیـی بکاتـەوە. گوتم بەمـە هەم خـۆت لەو چاوەڕێکردنە نەبڕاوەیە ڕزگـار دەکـەیت و هەم هێـڵـەکـانی سـنووری جـیـاکـەرەوەی خـۆت لە گـەمـژەکـانت دەدۆزیتـەوە. جاروبار لە کۆشکەوە بەدوویدا دەنێردرا، بەڵام هیچ پێشـهاتێکی ئومێدبەخش

بەدی نەدەکرا. لە پێشدا کەمێک نازی کرد، بەڵام کاتێک من پێم داگرت، ئەو بە پەرۆش و کەمێک شەرمەوە گوتی ئامادەیە نووسین تاقی بکاتەوە. لەبەر ئەوەی دەترسا ببێت بە مایەی پێکەنین، گاڵتەیەکیشی کرد: "وەک ئەوەی پێکەوە دەنووسین، دەتوانین پێکەوە سەیری ئاوێنەش بکەین؟"

کاتێک باسی پێکەوە نووسینی کرد، من هیچ خەیاڵم بۆ ئەوە نەچوو مەبەستی بێت هەردووکمان لە بەرامبەر هەمان مێز دابنیشین و بنووسین. من پێم وا بوو ئەگەر ئەو دەست بە نووسین بکات، من دیسان دەگەڕێمەوە بۆ ئازادیی خاڵیی کۆیلەیەکی تەمەڵ، بەڵام بە هەڵەدا چووبووم. ئەو گوتی پێویستە هەردووکمان لەمبەر و ئەوبەری مێز دابنیشن و ڕووبەڕووی یەکدی بنووسین: ئەو دەیگوت ئاوەزمان کە لەبەرامبەر ئەم بابەتە ترسناکانەدا مەیلی تەمەڵی و تەوەزەلی دەکات، تەنیا بەم شێوەیە دەتوانین بیخەینە کار و تەنیا بەمجۆرە دەتوانین هەست و نەزمی کار بە یەکدی ببەخشین. ئەمانە هەمووی بیانوو بوون. دەمزانی لە تەنیایی و لە هەستکردن بەوەی لە کاتی بیرکردنەوەدا تەنیایە، دەترسێت. ئەمەشم بەوەدا بۆ دەرکەوت سەیری کاغەزێکی هیچ لەسەر نەنووسراوی بەردەمی خۆی کرد و بە دەنگێکی بیستراو لەبەر خۆیەوە دەستی بە قسان کرد. سەرەتا، چاوەڕێی ڕەزامەندیی منی لەسەر ئەو شتانە دەکرد کە دەیویست بیاننووسێت. دوای نووسینی چەند ڕستەیەک، بە بێ فیزی و پەرۆشییەکی هاوشێوەی سادەیی منداڵانەوە، لەبەرەوە دەستی کرد بە پێشاندانی نووسینەکانی خۆی بە من. پرسی: "داخۆ ئەم شتانە شایەنی نووسینەوەن؟" هەڵبەتە منیش ستایشی نووسینەکانیم کرد.

بەمجۆرە، ئەوەی لە ماوەی یازدە ساڵدا لە بارەی ژیانی ئەوەوە بۆم دەرنەکەوتبوو، لە ماوەی دوو مانگدا بۆم ڕوون بووەوە. لە ئەدرنە کە دواتر لەگەڵ سوڵتاندا بۆی چووین، ژیابوون. باوکی زۆر زوو کۆچی دوایی کردبوو، شێوەی بیر دەکەوتەوە و نەدەکەوتەوە. دایکی ژنێکی تێکۆشەر بووە. دواتر، جارێکی تر شووی کردبووەوە. لە شووی یەکەمی، کچێک و کوڕێکی هەبوو. لە

شووی دووەمیشی چوار کوڕی هەبوو. پیاوەکەی لێفەدروو بووە. تامەزرۆترین براشیان بۆ خوێندن، بێگومان هەر خۆی بووە. زانیشم خۆی هۆشمەندترین، جەربەزەترین، لێوەشاوەترین و بەهێزترین برای ناو براکانی بووە و هەر خۆیشی سەرڕاسترینی هەموویان بووە. خوشکەکەی لێ دەربچێت، بە نەفرەتەوە باسی براکانی تری دەکرد، بەڵام دڵنیا نەبوو لەوەی هەموو ئەمانە شایەنی تۆمارکردنن یان نا. من هانم دا، لەوانەیە لە سۆنگەی پەی بردنمەوە بوویێت بەوەی ڕۆژێک منیش دەبم بە خاوەنی ئەو شێواز و چیرۆکی ژیانە. شتێک لە زمان و ڕەفتاریدا هەبوو حەزم پێ دەکرد و دەمویست فێری بم. مرۆڤ، ئەو ژیانەی بۆ خۆی هەڵی دەبژێرێت، پێویستە دواجار تا ڕادەی خوو پێوەگرتن خۆشی بوێت؛ خۆشیشم دەوێت. بێگومان، پێی وا بوو هەموو براکانی دەبەنگن، تەنیا بۆ پارە پێوەندییان بەمەوە کردووە، بەڵام ئەو کاتی خۆی بۆ خوێندن تەرخان کردووە. لە دەرزخانەی سەلیمیە وەرگیرابوو. لەگەڵ نیزیکبوونەوەی تەواوکردنی خوێندندا بووبووە قوربانیی ئاژاوەبازییەک. جارێکی تر نەگەڕایەوە سەر ئەو پرسە، بەهیچ جۆرێکیش باسی ژنانی نەکرد. سەرەتا نووسی جارێک خەریک بووە ژن بهێنێت، دواتر، هەرچی لەو بارەیەوە نووسیبوو، بە هەڵچوونەوە دڕاندی. ئەو شەوە لە دەرەوە بە لێزمە باران دەباری. سەرەتای ئەو شەوە ترسناکانە بوو کە ساڵانی دواتر زۆر لە ژیانمدا دووبارە بوونەوە. جنێوی زۆری پێم دا. گوتی گشت نووسینەکانی درۆیە. دواتر سەرلەنوێ دەستی کرد بە نووسینەوەی سەرلەبەریان. منیش دوو شەو خەو نەچووە چاوم، چونکە دەیویست بەرامبەری دابنیشم و بنووسم. ئیدی سەیری نووسینەکانی منی هەر نەدەکرد. لەوسەری مێزەوە دادەنیشتم، بێ ئەوەی زۆر لە خەیاڵی خۆم بکەم، هەمان شتەکانی پێشووترم دەنووسییەوە و بە تیلەی چاو بۆ ئەوم دەڕوانی.

دوای چەند ڕۆژێک و هەموو بەیانیانێک لەسەر ئەو پەڕە گرانبەها و سپییانەی لە ڕۆژهەڵاتەوە هێندرابوون، لە ژێر سەردێری "بۆچی من منم"دا دەستی بە نووسین دەکرد، بەڵام جگە لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی ئەوانی

دی هێندە نزم و بێ ناوەزن، هیـــچی تری لە ژێر ئەو ســـــەردێرەدا بۆ نەدەنووســرا. دیســان بۆم ڕوون بووەوە دوای مـردنی دایکی، ناهەقـیی لە بەرامـبەر کـراوە. بەو پوولەی دەسـتی کـەوتووە، هاتووە بۆ ئەسـتەنبـوڵ و ماوەیەک لە تەکیـەیەکدا سـەری خۆی کزکردووە. بەڵام پاش ئەوەی بۆ ئاشکرا بووە ئەوانەی ئەوێ تێکڕا نامەرد و ساختەکارن، شوێنەکەی بەجێ هێشـتووە. ویستم کەمێک زیاتر سەرکێشیی چوون بۆ ئەو تەکیەیەم بۆ بگێڕێتەوە. وای بۆچووم ڕزگاربوون لەوانە، سەرکەوتنێکی ڕاسـتەقینەی خۆجە بوو بێت. توانیبووی خۆی جیا بکاتەوە. کاتێک من ئەمەم پێی گوت، ئەو هەڵچوو. پێمی گوت گوایە پەرۆشـی ئەوەم ڕۆژێک لە ڕۆژان وردەکارییە دزێوەکانی ژیانی لە دژی خـۆی بەکار بهێنمـەوە. بەڕای ئەو، ئەوەی تا ئێسـتا زانیـومە، سـەر و زیادە. جگە لەوەش، -لێرەدا وشەیەکی زبری ڕەگەزبازیی بەکار هێنا- پێی وا بوو خـواستی من بۆ زانینی ئەو هەمـوو وردەکارییـە، ئەو دەخاتە گـومانەوە. دواتر بە تێروتەسـەلی باسی سەمرای خـوشکی بۆم گێڕایەوە، باسی چاکەی ئەو و خــراپەی مـێـردەکــەی. لە بارەی خـەمی چەندین ســاڵەی نەبینینی خوشکەکەیەوە قسەی کرد، بەڵام ئەگەر هەستی کرد بە پەرۆشەوە گوێم بۆی ڕاگـرتووە، ئەو گـومـانی کـرد و چووە سـەر بابەتێکی تر. بەو پوولەی بە دەستییەوە ماوە، کتێبی کڕیوە و ماوەیەکی درێژ، جگە لە خوێندنەوە، هیچ شـتێکی تری پێ نەکراوە. دواتر، لێرە و لەوێ کاری بچووکی نووسـیاریی دۆزیوەتەوە. لەوەدا بوو باسی بێ ئابڕوویی مرۆگەل بگێڕێتەوە، والی سادقی بیر کەوتەوە کە ماوەیەکی کورت لەوەوبەر لە ئەرزنجانەوە هەواڵی مردنیمان پێ گەیشتبوو. لەو کاتانەدا بووە خۆجە والیی ناسیوە. والی لە سۆنگەی بایەخدانییەوە بە زانست، دەستبەجێ ئەمی بە دڵدا چووە و هەر ئەویش لە فێرگەی سەربازی کاری مامۆستایی بۆی دۆزیوەتەوە. لێرەدا خۆجە گوتی بەڵام لە ڕاستیدا گەمژەی ڕاستەقینە والی خۆی بوو. کاری نووسینەوە ماوەی مـانگێکی خـایاند، دواجـار، شـەوێک پەشـیمـانی دای گـرت و هەمــوو نووسراوەکانی لەتوپەت کرد. بۆیە ئێسـتا کاتێک بە پشـتبەستن بەهێزی

خەیاڵی خۆم ئەو نووسراوانە و ڕابردووی خۆم دادەڕێژمەوە، هیچ ترسی ئەوەم نییە بکەومە ژێر کاریگەریی وردەکارییە شیرینەکانەوە. خۆجە بە دوایین خرۆشەوە کەوتە نووسینەوەی کۆمەڵە شتێک بە سەردێری "ئەو گەمژانەی لە نێزیکەوە دەیانناسم"، بەڵام هەڵچوو، پێی وا بوو ئەو جۆرە نووسینانە ئەوی بەهیچ جێیەک نەگەیاندووە و شتێکی نوێی لێوە فێر نەبووە، چونکە هێشتا نەیدەزانی بۆچی ئەو ئەوە. بە بۆچوونی ئەو، من ئەوم لە خشتە بردووە و وام لێ کردووە لە شوێنی ناپێویستدا بیر لە شتگەلێکی نابەدڵ بکاتەوە. پێمی گوت ڕۆژێک دێت سزام بدات.

نازانم بۆچی لەو ڕۆژانەدا کە سەرەتای ڕۆژانی هاوبەشی ڕابردوومانی بیرم دەخستەوە، ئەو بەڵێنی سزادانە لە کەللەی دابوو؟! هەندێک جار وای بۆ دەچووم لەبەر ئەوەی ترسنۆکێکی گوێڕایەڵ و ژیرم، خۆم زەمینەم بۆ هەڕەشەکەی خۆش کردووە. شەویش، لەگەڵ یەکەم قسەکردنیدا سەبارەت بە سزادان، بڕیارم دا بەرگری لە خۆم بکەم. خۆجە بەهۆی بێزاربوونی زۆرییەوە لە بیرکردنەوە، ماوەیەک بەمسەر و ئەوسەری ماڵەکەدا سووڕایەوە. دواتر، دیسان هاتەوە کنم و گوتی: "پێویستە کرۆکی بیرۆکەکە بنووسین: مرۆڤ وەک ئەوەی چۆن لە سەیرکردنی ئاوێنەدا دیمەنی خۆی دەبینێت، لە سەیرکردنی بیری خۆیدا، ناواخنی مێشکی خۆی دەبینێت."

ئەو شتە درەوشاوەیەی ئەو ئاماژەیەک بوو بۆ بەراوردکردن، منیشی خستە ماخۆلان و یەکسەر لەمسەر و ئەوسەری مێز دانیشتین. ئەمجار، ئەگەر بەنیوە گاڵتە پێداهاتنەوەش بێت، لای سەرەوەی پەڕە نووسیم "بۆچی من منم؟" دەستم کرد بە نووسینەوەی بیرەوەرییەکی سەردەمی منداڵیم سەبارەت بە شەرمنیم، چونکە لەو کاتەدا ئەوەم وەک نیشانەیەکی کەسایەتیی خۆم بیر کەوتەوە. دوای خوێندنەوەیەکی تری نووسینەکانی خۆجە کە تیایاندا گازندەی لە خراپیی ئەوانی تر دەکرد، بیرۆکەیەکم بۆ هات، لەو ساتەدا بڕوام کرد گرینگ بێت و گوتم: "پێویستە خۆجەش خراپەکارییەکانی خۆی بنووسێتەوە." لەبەر ئەوەی لەو ساتەدا سەرقاڵی خوێندەوەی نووسینەکانی من بوو،

سەیرێکی کردم و گوتی: من ترسنۆک نیم. بەرپەرچم دایەوە: "بەڵێ، ترسنۆک نیت، بەڵام تۆیش وەک هەموو مرۆڤێکی تر لە کەموکورتی بێ بەش نیت. ئەگەر بەدوایاندا بگەڕێیت، ئەوا کرۆکی خۆت دەدۆزێتەوە. من وام کردووە و تۆیش دەتەوێت وەک منت لێ بێت." کاتێک گوتم هەستم بەمە کردووە، هەڵچوونم بە ڕووخسارییەوە بینی، بەڵام خۆی ڕاگرت. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ ڕاگرتنی کێش و هاوسەنگیی خۆی گوتی: "خراپەکار، ئەوانی ترن. هەڵبەتە هەموو کەسێکیش نا، بەڵام هۆی چەوتیی شتەکان بۆ ناتەواوی و خراپیی ئەوانی تر دەگەڕێتەوە. بەدوای ئەوەدا من بەرەنگاری بوومەوە و گوتم: "خۆیشت لایەنی خراپ، زۆر خراپت هەیە و پێویستە ئاشکرایان بکەیت. بێ شەرمانە درێژەم دایێ و گوتم: "تۆ لە منیش خراپتریت.

بەو جۆرە، ڕۆژانی ئەو خراپەکارییە سەمەرە و ترسناکانە دەستیان پێ کرد! دوای ئەوەی منی بە کورسییەوە دەبەستەوە و لە بەردەم مێز دامی دەنا، لە بەرامبەرم دادەنیشت و دەستووری دەدامێ ئەو شتە بنووسم کە ئەو دەیویست، بەڵام ئیدی وای لێ هاتبوو خۆیشی نەیدەزانی ئەو شتە چییە. لەو چوواندنە بترازێت، هیچ شتێکی تری لە خەیاڵدا نەبوو: مرۆڤ چۆن سەیری ئاوێنە دەکات و ددانی خۆی دەبینێت، ئەگەر بیر بکاتەوە، دەتوانێت چاودێری ئاوەزی خۆیشی بکات. ئەو پێی وا بوو من ئەمە دەزانم، بەڵام ڕازەکە لەو دەشارمەوە. لە بەرامبەرم دادەنیشت و چاوەڕێی دەکرد ئەو ڕازەی بۆ بنووسمەوە، بەڵام من کاغەزەکانی بەردەمم بە خراپەکارییەکانی خۆم کە بە زیاد پێوەنانەوە دەمنووسینەوە، پڕ دەکردەوە. هێندەی ترم دەخستە سەر درزییە بچووکەکانی سەردەمی منداڵیم، ئەو درۆیانەی لە ئیرەیی پێبردندا دەمکردن، ئەو فێڵ و تەڵەکانەی بۆ ئەوەی خۆم زیاتر لای دایک و باوکم بەرمە پێشەوە و خۆم لە خوشک و براکانی ترم شیرینتر بکەم، دەمکردن، تاوانە زایەندییەکانی تافی لاوی خۆیشم بە خۆشحاڵییەوە تۆمار دەکرد. خۆجە، دوای ئەوەی نووسراوەکانی منی بە پەرۆش و چێژ و ترسێکی سەیری مایەی ترساندنی منەوە دەخوێندەوە، زیاتر تووڕە دەبوو، هاوسەنگی و لێبوردەیی

خۆی لە دەست دەدا و زیاتر سەرزەنشتمی دەکرد. لە ناخی خۆیدا گەیشتبووە ئەو باوەڕەی ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبێت بە خاوەنی ڕابردووی من، بۆیە لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی خۆی بخاتە ژێر باری خراپەکارییەکانی ڕابردوومەوە، یاخی دەبوو. ڕاست و ڕەوان دەستی کردبوو بە دارکاریکردنم. دوای خوێندنەوەی هەر گوناهێکم، دەیگوت "هەی بێ نامووس" و بە تووڕەبوونێکی تێکەڵ بە گاڵتە بەناولەپی دەست دەیکێشا بە پشتمدا. جاری وا هەبووە خۆی بۆ ڕام نەکراوە و زللەی لە بناگوێم سرەواندووە. پێ دەچێت تەنیا لە ڕووی بێزارییەوە ئەم ڕەفتارانەی لێ وەشابێتەوە، چونکە ئیدی خۆیشی هاتبووە سەر ئەو باوەڕەی لە کۆشکەوە کەمتر بەدواییدا دەنێردرێت و لە من و خۆی زیاتر، هیچ شتێکی تر نییە خۆی پێوە سەرگەرم بکات. تا ئەو زیاتر خراپەکارییەکانی منی بخوێندباوە و لەسەر شێوە سزادانی منداڵانەی خۆی بەردەوام بوایە، متمانە و باوەڕ بەخۆبوونێکی سەیر منی دادەگرت: یەکەمجارم بوو هاتبوومە سەر باوەڕێک کە خۆجەم لە مستی خۆم ناوە.

جارێکیان، پاش ئەوەی زۆر سەری خستە سەرم و ئازارێکی زۆری دام، سەرنجم دا بەزەیی پێمدا دێتەوە. ئەمە هەستێکی خراپی تێکەڵ بە ڕق و نەفرەت بوو بەرامبەر بە کەسێک کە مرۆڤ هیچ کات لە ئاستی خۆیدا نایبینێت. ئەمەم لەوەوە بۆ دەرکەوتبوو کە ئیدی دەیتوانی بێ نەفرەت لێکردنم بۆم بڕوانێت. گوتی: "ئیدی با هیچ نەنووسین." دوایی قسەکەی ڕاست کردەوە و گوتی: "ناخوازم تۆ هیچ بنووسیت"، چونکە ماوەی چەندین هەفتە بوو من خراپەکارییەکانی خۆم دەنووسییەوە و ئەویش تەنیا تەماشای دەکرد. خۆجە گوتی: "ماڵ تا دێت قەبزتر دەبێت، بۆیە باش وایە دەربچین و گەشتێک بکەین. لەوانەیشە بچین بۆ گەبزە." دەیویست بچێتەوە سەر کاری گەردوونناسی و بیری دەکردەوە کتێبێکی بەهەندتر لە بارەی ژیانی مێرووڵەوە بنووسێت. هەستم کرد خەریکە بەیەکجاری ڕێزی بۆم نامێنێت و بەمەش ترسم لێ نیشت. بۆ ئەوەی سەرنجی ئەو بەرامبەر بەخۆم بە زیندوویی ڕابگرم، چیرۆکێکی ترم هەڵبەست کە تا چوونە خوارەوە بە ناخی زەویدا خۆمی

بچووک دەکردەوە. خۆجە دوای ئەوەی نووسراوەکەمی بە چێژ و کەیفەوە خوێندەوە، تەنانەت هەڵیش نەچوو، بەڵام هەستم دەکرد پەرۆشی زانینی ئەوەیە من چۆن توانیومە شان بدەمە بەر ئەو هەموو خراپەکارییە. لەوانەیە لەو کاتەدا بەوە ڕازی بووبێت تا کۆتایی وەک خۆی بمێنێتەوە. بێگومان زۆر باش دەیزانی ئەم ماستە موویەکی تێدایە. ئەو ڕۆژە، وەک لێبووکێکی کۆشک و سەرای خۆ بە مرۆڤ نەزان قسەم لەگەڵیدا کرد. پەرۆشبوونی ئەو تا دەهات پەرەی دەسەند، منیش هەوڵم دا زیاتر هانی بدەم: چی لە دەست دەدات ئەگەر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی ئەو کەسێکی وایە، بۆ دوایین جار و پێش چوونمان بۆ گەبزە، چەند شتێک سەبارەت بە خراپەکارییەکانی خۆی بنووسێت؟ هیچیش پێویست نەبوو نووسینەکانی ڕاست بن، یان کەس باوەڕیان پێ بکات. ئەگەر ئەمە بکات، تێ دەگات کەسانی هاوشێوەی من چۆنن و ڕۆژێکیش دێت ئەم زانیارییانە فریای بکەون! دواجار لە بەرامبەر پەرۆشیی خۆی و چەنەبازیی مندا خۆی پێ ڕانەگیرا و بەڵێنی دا ڕۆژی دواتر نووسینەوەی خراپەکارییەکانی خۆی تاقی بکاتەوە. بێگومان لە بیری نەچوو درێژەی بداتێ و بڵێت: " لەبەر ئەوەم نییە گوایە کەوتبێتمە داوی گەمەی گەمژانەی تۆوە. لەبەر ئەوەی خۆم دەمەوێت، دەیکەم."

ڕۆژی دواتر، شادمانترین ڕۆژی کۆیلایەتی من بوو. ئیدی منی بە کورسییەوە نەدەبەستەوە، بەڵام بۆ بە چێژەوە چاودێریکردنی دروستبوونی لەسەرخۆی مرۆڤێکی نوێ، تەواوی ڕۆژم بە دانیشتن لە بەرامبەری بەسەر برد. سەرەتا هێندە متمانەی بە کارەکەی خۆی هەبوو، تەنانەت لە سەرەوەی پەڕەکەدا خۆی لە قەرەی قسەی سەمەرەی "بۆچی من منم" نەدا. پاشان، متمانەی منداڵێکی قۆشمەی بەدوای درۆیەکی سەفابەخشدا گەڕاو کەوتە سەر ڕووخساری. بە تیلەی چاو دەمبینی هێشتا لە دنیا ساغڵەمەکەی خۆیدایە، بەڵام ئەم متمانە خاڵییە هێندە درێژەی نەخایەند. هەستی خۆکردی خۆ بەتاوانبارزانینیشی بەلای منەوە لە خۆ نواندن دەچوو، زۆری نەبرد ئەویش خامۆش بوو. لە ماوەیەکی کورتدا گاڵتەجاڕی وەرگەڕایە سەر

نیگەرانی و گەمە بوو بە ڕاستی. خۆ تاوانبارکردن، ئەگەرچی بەدرۆش بێت، تا ڕادەی سەرسووڕمان خۆجەی دەترساند. ئەو شتەی نووسیبووی، بێ ئەوەی پێشانی منی بدات، یەکسەر ڕەشی کردەوە! بەڵام خولیا و پەرۆشی بە ناخیدا چووبووە خوارێ و پێم وا بێت شەرمی لە منیش دەکرد، بۆیە درێژەی بە نووسینەوە دا. خۆ ئەگەر ئەو شتەی بکردایە کە لە سەرەتاوە بەخەیاڵیدا هات و یەکسەر لە بەردەم مێزەکە هەڵسابایە، لەوانەبوو بێ ئەوەی ئارامیی خۆی بشێوێنێت، ڕزگاری بوایە.

ساتەکانی دواتر سەیری داڕووخاندنی لەسەرخۆیم کرد. هەندێک شتی بۆ تاوانبارکردنی خۆی دەنووسی. دوایی نووسراوەکانی، بێ ئەوەی پێشانی من بدات، دەدڕاند. هەر جارێک زیاتر متمانە بەخۆبوون و ڕێزی لە دەست دەدا، بەڵام دیسانەوە بە ئومێدی دۆزینەوەی شتە لە دەستدراوەکانەوە تێ هەڵدەچووەوە. بە قسەی خۆی دەبوایە ددانپیانانی خراپەکارییەکانی خۆی پێشانی من بدایە، بەڵام لەگەڵ داهاتنی تاریکیدا، ئەگەرچی تامەزرۆی خوێندنەوەشیان بووم، تەنانەت یەک وشەی ئەو نووسراوانەشم نەدەبینی، چونکە تا ئەو کاتە سەرلەبەری دڕاندبوون و توڕی هەڵدابوون. ئیدی بڕستی لێ بڕابوو. بەدەم هاوار و قیڕاندنەوە بە منی گوت ئەمە گەمەیەکی دزێوی گاوڕ و ناموسڵمانانە. متمانەشی بە خۆی بەڕادەیەک لاواز بوو، تەنانەت من بێ ئابڕووانە وەڵامم دایەوە و گوتم: "هێندە مەکرووزێوە. لەسەر خراپەکاری ڕادێیت." لەوانەیە لە بەرامبەر نیگاکانی مندا خۆی پێ ڕانەگیرابێت، بۆیە ڕۆیشت و لە ماڵ دەرچوو. درەنگانێکی شەو گەڕایەوە، بۆنی گوڵاوی لێ دەهات، وەک بۆی چووم، لەو ماڵە، لەگەڵ ژناندا نووستبوو.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، بۆ ئەوەی هانی بدەم لەسەر کارەکەی بەردەوام بێت، گوتم خۆجە لەوە گەورەترە ئەو گەمە بچووکانە بریندازی بکەن. گوتم: "ئەم کارە بۆ کات بەسەربردن نا، بگرە لە پێناوی فێربوونی شتێکدا دەکەین و هۆی گەمژەیی ئەوانەی بە گەمژە ناویان دەبەیت، لە ئەنجامی کارەکەماندایە. ئایا ئەمە بەلای تۆوە کارێکی وەک پێویست سەرنجڕاکێش نییە بۆ ئەوەی

یەکتری بەتەواوی بناسین؟" دریژەم دایێ و گوتم: "مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی کەسێکەوە کە تا سەر کرۆک دەیناسێت، ڕێک وەک ئەوەی خەونێکی ترسناکی خۆش بوێت.

بەهۆی کاریگەریی قسەکانی منەوە نا، چونکە هەر هێندەی گەمە و قۆشمەکانی گرگنێکی کۆشک و سەراکان بەهەندی وەرگرت، بگرە بە متمانەیەکەوە کە تیشکی خۆر دەیبەخشی، دیسان لە بەردەم مێز دانیشتەوە. ئێوارە، دوای ئەوەی لەسەر مێزەکە هەڵسا، لە ڕۆژی پێشووتر کەمتر متمانەی بەهۆی مابوو. دیتم بەو شەوە دیسان بۆ لای ژنان دەڕوات. بەزەییم پیایدا هاتەوە.

بەو جۆرە، هەموو سبەینانێک وای بۆ دەچوو ئەو ڕۆژە لە نووسینەوەی خراپەکارییەکانی دەبێتەوە. بەهیوای بەدەستهێنانەوەی ئەوەی لە ڕۆژی ڕابردوودا لە دەستی دابوو، لە بەردەم مێز دادەنیشت و ئێواران دوای هەڵسانی، شتێک زیاتر لەوانەی بەردەستی لەسەر مێزەکە دەمایەوە. لەبەر ئەوەی خۆی بە سووک و چرووکی دەهاتە بەرچاو، ئیدی بە چاوی سووک بۆ منی نەدەڕوانی. وا بیرم دەکردەوە دواجار ئەو هەستی یەکسانییەم دۆزیوەتەوە کە لە ڕۆژانی سەرەتای مانەوەمدا لەکن وی تەنیا بەخەیاڵ پەیم بەهەبوونی بردبوو. زۆر لە خۆم ڕازی بووم. لەبەر ئەوەی لێم بێزار دەبوو، کار گەیشتە ئەوەی پێم بڵێت پێویست نییە لە بەردەم مێز دابنیشیت. ئەمەش ئاماژەیەکی باش بوو، بەڵام جڵەوی ڕق و کینەی کەڵەکەبووی چەندین ساڵەی خۆم پێ قایم نەدەکرا. دەمویست تۆڵە بکەمەوە و بچمە دۆخی هێرشبردنەوە. منیش وەک ئەو تیرم ئاڕاستەی نیشان کردبوو. ئەگەر بتوانم وا لە خۆجە بکەم کەمێکی تر لە خۆی بکەوێتە گومانەوە، کەمۆکەیەک لەو ددانپیانانەم بخوێندایەتەوە کە بەوردی لە منی دەشاردەوە و بە جوانی ڕەزیلم بکردایە، وام دەهاتە پێش چاو ئیدی ئەو کۆیلە بێت نەک من، ئەو مرۆڤی خراپی ئەو ماڵە بێت، نەک من. نیشانەکانی ئەمەش دیار بوون: ناوبەناو هەستم دەکرد دەیەوێت دڵنیا بێت لەوەی داخۆ پێم ڕابواردووە، یاخۆ نا؟ وەک هەرکەسێکی

لاواز و پشت بەخۆ نەبەستوو کاری گەیاندبووە ئەوەی چاوەڕێی لەقاندنی سەری ڕەزامەندی من بکات. ئیدی زیاتر ڕای منی لەسەر شتە بچووکەکانی ڕۆژانە دەپرسی: لە بارەی ڕێکوپێکی جلوبەرگەکانییەوە پرسیاری دەکرد؛ ئەگەر وەڵامی کەسێکی بدایەتەوە، لە منی دەپرسی داخۆ باش وەڵامی داوەتەوە، یاخۆ نا؛ دەیپرسی داخۆ دەستنووسەکانیم پێ جوانە و بیر لە چی دەکەمەوە؟ منیش، بەمەبەستی ئەوەی ئەو بێ ئومێد نەبێت، دەست لە گەمەکە هەڵنەگرێت و ئاسوودە بێت، جاروبار خۆم لە پێش چاوی سووک و ڕیسوا دەکرد. زمانی نیگاکانی دەیگوت: "تۆ، قوڕت بەسەر!"، بەڵام هیچی تر نەیدەتوانی زللەم تێ بسرەوێنێت. دڵنیاش بووم بیری لەوە دەکردەوە خۆیشی شایەنی ئەوەیە زللەیەکی تێ بسرەوێندرێت.

زۆر بەپەرۆش بووم بزانم ئەو ددانپیانانە چین وایان لێ کردووە خۆی هێندە بە سووک بێتە پێش چاو. لەو ڕۆژانەدا لەبەر ئەوەی لەسەر سووکایەتی پێکردنی ڕاهاتبووم، لای خۆمەوە بیرم دەکردەوە ددانپیانانەکانی زنجیرەیەک خراپەکاریی پڕوپووچ بن. ئێستا، بۆ ڕاستگۆیی بەخشین بە ڕابردووم، بەخۆم گوت با یەک دوو وردەکاریی ئەو ددانپیانانەی تەنانەت دێڕێکیشیم نەخوێندبووەوە، دابڕێژمەوە، بەڵام هەرچەندی دەکەم ناتوانم هیچ خراپەکارییەک بدۆزمەوە شایەن بە خۆجە بێت و هاوسەنگیی بەسەرهاتم و ژیانی خەیاڵکردم تێک نەدات. وەلێ دەمتوانی پێشبینی بکەم هەرکەسێکی تر بوایە لە جێی من، متمانەی بە خۆی پەیدا دەکردەوە. پێویستە بڵێم، یارمەتی خۆجەم دابوو، بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات، داهێنانێک بکات و ئەگەر یەکجارەکی و ئاشکراش نەبێت، پەردەم لەسەر خاڵی لاوازی خۆی و هاوشێوەکانی هەڵدابووەوە! ئەو کاتە وا بیرم دەکردەوە ئەو ڕۆژە نێزیک بووەتەوە بتوانم نەک هەر ماڵی ئەو، بگرە ماڵی ئەوانی تریش وێران بکەم. خراپ بوونیانم دەسەلماند و دەمشۆردنەوە: پێم وا بێت خوێنەرانی بەسەرهاتم ئیدی تێ دەگەن خۆجە چەند لە منەوە فێر بووە، منیش هێندە لەوەوە فێر بووم! لەوانەیە ئێستا بۆیە وا بیر بکەمەوە، چونکە مرۆڤ لە تەمەنی پیریدا، لە

بەسەرهاتەکانیدا زیاتر بەدوای شتە هاوشێوەکاندا دەگەڕێت و هەموو شتێک بەیەکدی بەراورد دەکات. لەوانەیە ئەو کاتانە قینی کەڵەکەبووی چەندین ساڵەم گوڕ و تینی پێم بەخشیبێت و پێم وا بووبێت دوای بەباشی ڕیسواکردنی خۆجە، بە کەڵکوەرگرتن لە سەردەستیی خۆم، هیچ نەبێت، سەربەستیی خۆم پێی دەسەلماند و بێ شەرمانە داوای بەڵگەنامەی ئازادبوونم لێی دەکرد. خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو بێ نازونووز ئازادم دەکات و بیرم لە وردەکارییەکانی ئەو کتێبانە دەکردەوە کە دەمویست دوای گەڕانەوەم بۆ وڵاتەکەم، لە بارەی بەسەرهاتەکانی خۆم و تورکەکانەوە بیاننووسم! دەمەوبەیانییەک هەواڵێکی بۆم هێنا و گشت شتێکی سەروبن کرد.

پەتا بە شاردا بڵاو بووبووەوە! سەرەتا بڕوام نەکرد، چونکە ئەمەی بەجۆرێک گێڕایەوە وەک ئەوەی باسی ئەستەنبوڵ نا، بگرە شارێکی تری دوور بکات. لێم پرسی هەواڵەکەی چۆن بیستوە، چونکە دەمویست وردەکارییەکان بزانم. گوتی: "خەڵکی سەیریان کردووە ژمارەی ئەوانەی لەپڕ دەمردن ڕوو لە زیادبوونە!" بیرم کردەوە لەوانەیە ئەمە پەتا نەبێت. لە بارەی نیشانەکانی نەخۆشییەکەوە پرسیارم لێی کرد. خۆجە پێکەنینی پێم هات، گوتی: "پێویست ناکات خۆت نیگەران بکەیت. هەر کاتێک تووش بوویت، ئەوا بێ هیچ گومانێک بە تووشبوونی خۆت دەزانیت. بۆ تێگەیشتنی ئەمە، مرۆڤ ئەوەندەی بەسە سێ ڕۆژ بە ئاگری نەخۆشییەکە بسووتێت. هەندێک کەس لە ژێر گوێ و بن باڵ و سەر سکیان دوومەڵ و قنچکە دەردێت و دواتریش لەرزوتا تاویان بۆ دەهێنێت. هەندێک جار برینەکان دەتەقنەوە و جاروباریش خوێن لە جگەریان دێتە دەرەوە. کەسانێکیش هەبوون وەک تووشبووانی ژانی زراو بەدەم کۆکینەوە مردوون." درێژەی دایێ و گوتی: "لە هەر گەڕەکێک چوار پێنج کەسێک تێداچوون." بەپەرۆشەوە پرسیاری گەڕەکی خۆمانم کرد. گوتی: "مەگەر نەتبیستوە ئەو وەستای دیوارەی بەهۆی ئەوەی منداڵان سێوی باخچەکەیان دەخوارد و مریشک بەسەر دیوارەکانیدا دەچوونە حەوشەیەوە، بەردەوام لەگەڵ خەڵکی گەڕەکدا لە شەڕدابوو، هەفتەیەک لەمەوبەر بەدەم تاوە

هاواری لێ هەڵساوە و مردووە؟ ئێستا هەموو کەسێک دەزانێت بە پەتا مردووە." هێشتا نەمدەویست بڕوا بکەم. هەموو شتێک لە دەرەوە ئاسایی بوو، ئەو کەسانەی بە بەردەم پەنجەرەکەدا تێ دەپەڕین، هێمن و لەسەر خۆبوون، پێم وا بوو پێویستە کەسێک بدۆزمەوە بۆ ئەوەی شپرزەیی و پەرۆشیی خۆمی لەگەڵدا بەش بکەم. سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی، پاش ئەوەی خۆجە چوو بۆ دەرزخانە، من دەرپەڕیمە دەرەوە. بەدوای ئەو خێزانە ئیتاڵییە لە ئاین وەرگەڕاوانەدا گەڕام کە توانیبووم لە ماوەی یازدە ساڵ مانەوەمدا لەوێ بیانناسم. یەکێکیان، بە ناوە تازەکەی، مستەفا ڕەیس، چووبوو بۆ کارخانەی دروستکردنی کەشتی. ئەوی تریان، عوسمان ئەفەندی، سەرباری ئەوەی شێتانە بە دەرگای ماڵیمدا کێشا، لە پێشدا دەرگای لێم نەکردووە. بە غوڵامەکەی گوت پێم بڵێت لە ماڵ نییە، بەڵام دواتر خۆی پێ ڕانەگیرا، لە دواوە بانگی کرد و گوتی: "چۆن وا دەبێت؟ تازە بەتازە دەپرسیت داخۆ نەخۆشییەکە ڕاستە! مەگەر ئەو دارەبازانە نابینیت بەسەر شانی خەڵکەوە؟" پاشان گوتی: "بە ڕووخسارتدا تێ گەیشتووم دەترسیت. بۆیە دەترسیت، چونکە هێشتا پێ لەسەر کرستیانبوونی خۆت دادەگریت!" لۆمەی کردم: "مرۆڤ ئەگەر بخوازێت لێرە کامەران بێت، پێویستە بچێتە سەر ئاینی ئیسلام." بێ ئەوەی تەوقەم لەگەڵ بکات و دەستم پێوە بدات، چووە ماڵە تاریک و شێدارەکەی خۆیەوە. کاتی نوێژ بوو. بە بینینی ئاپۆڕەی حەوشەی مزگەوتەکان، ترسم لێ نیشت و بەپەلە گەڕامەوە بۆ ماڵ. گەمژەیی و سەرسووڕمانی ساتەکانی کارەساتم تێدا بەدی دەکرا. دەتگوت ڕابردووی خۆم لە بیر کردووە، ڕەنگی بیرەوەرییەکانم کاڵ بووەتەوە و هەستم دەکرد لە دەست و پێ کەوتووم. دەستەیەک خەڵکم بینی لە کۆڵاندا دارەبازێکیان هەڵگرتبوو، بەجارێک قەڵەمی ئەژنۆم شکا.

خۆجە لە دەرزخانە گەڕایەوە، هەستم کرد دڵخۆشە بە بینینیم لەم بارەدا. دەمبینی لەبەر ئەوەی من بەترسنۆک دەزانێت، متمانەی بە خۆی زیاتر دەبێت و ئەمەش منی پەست دەکرد. ویستم هەرچۆنێک بووە لە چاوقایمی و نەترسیی

لووتبەرزانەی خۆی ڕزگاری بێت. بەدەم هەوڵدانەوە بۆ جلەوکردنی هەڵچوون و خرۆشی خۆم، هەرچی زانستی پزیشکی و ئەدەبیم هەبوو، هەمووم خستە ڕوو. هەرچی دیمەنێکی پەتا لەوانەی لە هیپۆکرات و توکیدیدەس و بۆکاچیۆوە لە بیرەوەریمدا مابووەوە، هەمووم گێڕایەوە و گوتم ئەم نەخۆشییە پەتایە، بەڵام قسەکانم جگە لەوەی منیان سووک و ڕیسواتر هێنایە پێش چاوان، بەکەڵکی هیچی تر نەهاتن. خۆجە گوتی: "لەم پەتایە ناترسم، چونکە نەخۆشی بە دەستی خوایە، مرۆڤ ئەگەر ساتی مردنی نێزیک بێتەوە، دەمرێت. بۆیە ترسی پڕوپووچت، خۆخزاندنە کونی ماڵەوە، پێوەندیبڕین لەگەڵ دەرەوە و تەنانەت هەوڵدان بۆ ڕاکردنیش لە ئەستەنبوڵ بێ سوودە. مردن لە چارەی هەمووومان نووسراوە و لە هەر شوێنێک بین، دەماندۆزێتەوە و دەمانگاتێ. بۆچی دەترسیت؟ لەبەر ئەو خراپەکارییانەی چەندین ڕۆژە لەسەر کاغەز تۆماریان دەکەیت؟" ئەمەی دواییانی بەدەم زەردەخەنەوە گوت. چاوەکانی بە ئومێدەوە دەدرەوشانەوە.

تا ئەو ڕۆژەی لە یەکدیش جیانەبووینەوە، نەمتوانی تێ بگەم داخۆ باوەڕی بەم گوتانەی خۆی هەیە، یاخۆ نا؟ بۆ ساتێک لە بێ پەروابوونی ترسام. دواتر، هەر کاتێک وتوێژی دەوری مێزەکەمان و ئەو گەمە ترسناکانەم بیر دەکەوتەوە، گومانیشم پەیدا کرد. گرگر قسەی دەهێنایەوە سەر ئەو خراپەکارییانەی لە دانیشتنی بەرامبەر بەیەکترماندا دەمانووسین و بە لە خۆبایبوونەوە هەمان پاساوی دەهێنایەوە، ئەمەش وای لە من دەکرد لە پێستی خۆم بێمە دەرەوە: "بەپێی ئەوەی هێندە لە مردن دەترسیت، هیچ نەتتوانیوە بەسەر ئەو خراپەکارییانەتدا زاڵ بیت کە بە ڕواڵەت وا دیارە زۆر بوێرانە تۆماریان دەکەیت. ئەو بوێرییەی بۆ خستنەڕووی گوناهەکانت پێشانت داوە، لە سنووری بێ ئابڕووییەکی سادە زیاتر تێ ناپەڕێت!" ئەمە بەمەرجێک خۆجە لەو ڕۆژانەدا تووشی دوودڵی بووبوو، پێویست بوو زۆر بەوردی لە بچووکترین خراپەکاریی خۆی بکۆڵیبایەوە. کەچی دەروونی ئاسوودە بوو، ئەو چاوقایمییە بەهێزەی لە بەرامبەر پەتاکەدا نواندی، باوەڕی ئەوەی لە ناخیدا دروست

کردبوو کە ئەو مرۆیەکی بێ تاوانە.

نەفرەتم لەو قسانەی کرد کە بەدبەنگیی خۆم باوەڕم پێیان هێنابوو، بۆیە بڕیارم دا بەرەنگاری ببمەوە. ڕێک و ڕەوان پێم گوت نەترسانی ئەو لە ئاسوودەیی دەروونییەوە سەرچاوە ناگرێت، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ بێ ئاگابوونی لە ڕادەی نێزیکبوونی مردن لێیەوە. باسی ئەوەم بۆی کرد مرۆڤ چۆن دەتوانێت خۆی لە مردن بپارێزێت. گوتم پێویستە دەست نەدرێتە کەسانی تووشبوو بە پەتاکەوە. مردووەکان لە چاڵی گەچیندا بنێژرێن. پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان بۆ نزمترین ئاست دابگیرێت و خۆجەش نەچێتە ئەو دەرزخانە جەنجاڵە.

ئەم قسەیەی دواییم شتی خراپتر لە پەتاکەی بەخەیاڵیدا هێنابوو! پاشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتر گوتی دەستی داوەتە یەک بەیەکی منداڵەکانەوە و دەستی بۆ لای من درێژ کرد. کاتێک بینی ترسام و نامەوێت دەستی پێوە بدەم، بە کەیفەوە لێم نێزیک کەوتەوە و لە ئامێزی گرتم. ویستم هاوار بکەم، بەڵام وەک چۆن کەسێک لە خەوندا دەنگی دەرناچێت، نەمدەتوانی هاوار بکەم. خۆجەش بە قەشمەری پێکردنێکەوە کە زۆر دواتر بۆم ئاشکرا بوو، دەیگوت فێری نەترسیت دەکەم.

## ٦

پەتاکە زۆر بەخێرایی تەشنەی دەکرد، بەڵام من چەندی کردم و کۆشام نەمتوانی لەو شتە بگەم کە خۆجە بە چاوقایمی و ئازایەتی ناوی دەبرد. وەک چەند ڕۆژی ڕابردووش خۆم نەدەشاردەوە. خۆ خزاندنە کونی ژوورەوە وەک ژنی نەخۆشی ناو جێگە و چەندین ڕۆژ لە پەنجەرەوە سەیرکردنی دەرەوە ئۆقرەی لەبەر بڕیبووم. جاروبار لە ماڵ دەردەپەڕیم و وەک سەرخۆش دەچوومە کۆڵان. سەیری ژنانی کڕیاری بازاڕ، کاسب و ئەربابی سەرقاڵی کار لە دووکانەکانیاندا و ئەو کەسانەم دەکرد کە دوای بەخاک سپاردنی کەسوکاریان لە چایخانەکان کۆ دەبوونەوە و هەوڵم دەدا خۆم لەگەڵ پەتاکەدا ڕابهێنم. ئەگەر خۆجە ئەوەندە تەنگاوی نەکردمایە، لەوانە بوو بتوانم خۆمی لەگەڵ ڕابهێنم.

شەوانە دەستەکانی خۆی کە دەیگوت بەدرێژایی ڕۆژ بە دەستی خەڵکی ترییەوە داوە، بۆ من درێژ دەکرد. بێ ئەوەی جووڵەم لێوە بێت، لە چاوەڕوانیدا دەمامەوە: کتومت وەک ئەوەی لە خەو ڕابیت و ببینیت وا دووپشکێک بەسەر لەشتدا دەگەڕێت و تۆیش وەک بەرد لە شوێنی خۆتدا وشک بیت! پەنجەکانی لەوانەی من نەدەچوون، بە سارد و سڕی بەسەر جەستەمدا دەیگێڕان و دەیپرسی: "دەترسیت؟" من جووڵەم لە خۆم دەبڕی. "دەترسیت، بۆچی دەترسیت؟" جاری وا هەبوو بەخەیاڵمدا دەهات دەستی بگیرمە دواوە و بیانکێشم بەیەکدا، بەڵام سوور دەمزانی ڕەفتارێکی لەو جۆرە دەهری تری دەکات. "با من پێت بڵێم بۆچی دەترسیت. بۆیە دەترسیت، چونکە تا بیناقاقات نوقمی تاوانیت. بۆیە دەترسیت، چونکە تۆ زیاتر بڕوات بە منە وەک لەوەی من بە تۆم بێت."

هەر خۆیشی گوتی پێویستە لە بەردەم مێز دانیشین و چەند شتێک بنووسینەوە. پێی وا بوو ئێستا باشترین کاتە بۆ نووسینەوەی ئەوەی "بۆچی من منم." کەچی دواجار جگە لەوەی بۆچی ئەوانی تر ئاوان، شتێکی تری تۆمار نەکرد. یەکەم جاری بوو بە لووتبەرزییەوە نووسینەکانی خۆی پێشانی من دەدا. لەبەر هەر هۆیەک بێت، بیرم کردەوە لەوانەیە چاوەڕێ بکات دوای خوێندنەوەی نووسینەکانی، من شەرم دامبگرێت. بەڵام نەفرەتی خۆم پێ نەشاردرایەوە و بە خۆجەم گوت لەگەڵ کەمژەکانی لەمەڕ خۆیدا دەیخەمە تای هەمان تەرازووەوە. نامە چنگیشی ئەو بەر لە من دەمرێت.

لەو کاتەدا هاتبوومە سەر باوەڕێک ئەو وشانە کاریگەرترین چەکی دەستی من بوون. بەدوای ئەوەدا کاری دە ساڵی ڕابردووم هێنایەوە بیری: لەمەڕ ئەو ساڵانەی بۆ دانانی بیردۆزەی کۆسمۆگرافی بە خەرجی دابوون، ڕامانی چەندین سەعاتە لە ئاسمان و تێکچوونی چاوەکانی و سەبارەت بەو ڕۆژانە قسەم بۆ کرد کە ئامادە نەبوو سەر لەسەر کتێبەکانی هەڵبگرێت. ئەمجارەیان من بەسەر ئەودا چووم، گوتم: "ئەگەر بکرێت خۆمان لە پەتاکە بپارێزین و بتوانین بژین، بێ ئەقڵییە بەلاش و حەلاش خۆمان بدەینە دەم مردنەوە." پەیڤەکانم، هاوکات لەگەڵ بەرزبوونەوەی ڕادەی گومان تیایاندا، سزادانی ئەویان لەلایەن منەوە زیاتر دەکرد. لەو ساتەدا هەستم کرد لەگەڵ خوێندنەوەی نووسراوەکانی مندا، خەریک بوو بێ ویستی خۆی ئەو ڕێزەی دەدیتەوە کە پێشتر بۆ من هەیبوو، بەڵام دواتر لە دەستی دابوو.

بەمەبەستی لە بیرکردنی بەدبەختی و کلۆڵیی خۆم، لەو ڕۆژانەدا چەندین پەڕەم بەو خەونە بەختەوەرانە پڕ کردەوە کە نەک بەتەنیا لە شەودا، بگرە لە ساتەکانی نیوەڕۆخەویشدا چەندین جار دەمبینین. لە دوای هۆشیاربوونەوەم و بۆ لە بیرکردنی هەموو شتێکی تر، بە زمانێکی شیعر ئامێز و بەوپەڕی وردەکارییەوە دەستم دەکرد بە نووسینەوەی خەونەکانم، سەرلەبەریشیان لە واتا و ڕەوتدا لە یەک دەچوون: لە ناو دارەکانی دارستانی پشت ماڵمان مرۆگەلێکی ڕازدار دەژیان، ساڵانێکی درێژ بوو ئێمە پەرۆشی زانینی

ڕازەکانیان بووین و ئەگەر مرۆڤ بیوێرایە بچێتە تاریکاییی بەرایی دارستانەکەوە، لەگەڵیاندا دەبوو بە دۆست؛ لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا سێبەرەکانمان لە ناو نەدەچوون، بگرە دەستاودەستیان بە هەزاران شتی بچووکی پێویست بۆ فێربوون دەکرد و ئێمە بێ ماندووبوون لە کاتی ڕاکشان لە ناو پێخەوە فێنک و خاوێنەکانماندا هەستمان پێ دەکرد؛ مرۆڤەکانی ناو ئەو وێنانەی لە خەونەکانمدا دەمکێشان، وەک مرۆڤی جوانی سێ ڕەهەندی نەدەمانەوە، بگرە لە چوارچێوەی خۆیان دەهاتنە دەرێ و تێکەڵ بەخۆمان دەبوون؛ دایکم، باوکم و من لە باخچەی پشتەوەی ماڵمان خەریکی دانانی ئامێرگەلی پۆلاین بووین بۆ ئەوەی لەجێی ئێمە کارەکان لە ئەستۆ بگرن...

خۆجە بێ ئاگا نەبوو لەوەی ئەم خەونانە تەڵە و داوی ئیبلیسین بۆ بەکێشکردنی ئەو بۆ ناو تاریکاییی زانیاریی نەمر. بەڵام سەرەڕای ئەوەش، هەرچەندە سوور دەیزانی لە هەر پرسیارکردنێکدا کەمێک زیاتر لە متمانەی خۆی دەدۆڕێنێت، لە منی دەپرسی: "ئەو خەونە تەوش و تووڕەهاتانە واتای چ دەگەیەنن؟ بەڕاستی ئەو خەونانە دەبینیت؟" بەو جۆرە، ئەو شتەی دوای چەندین ساڵ پێکەوە بە سوڵتانمان کرد، من بەوم کرد؛ لە خەونەکانمانەوە بەرئەنجامم بۆ داهاتووی هەردووکمان دەردەهێنا: ئاشکرایە لە کاتی تەشەنەکردنی نەخۆشیدا، مرۆڤ هەروەک چۆن ناتوانێت لە دەستی ڕابکات، بەهەمان شێوە ناتوانێت دەستبەرداری زانستیش بێت. هێندە چەتوونیش نەبوو بە خۆجە بڵێم نەخۆشیی پەی بەویش بردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەرۆشی زانینی خەونەکانی خۆجە بووم! بەئاشکرا بەدەم پێ ڕابواردنەوە گوێی بۆم ڕاگرتبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بە پرسیارکردن پۆتی خۆی شکاندبوو، نەیدەتوانی هێندە پێم لێ بکات بە کەوشدا، لە کاتی گێڕانەوەشدا دەمبینی قسەکانم لە ڕادەی پەرۆشیی ئەو دەبەنە سەرێ. ئەگەر هەستم کرد ئەو دڵنیاییەی لە سەرەتای تەشەنەکردنی پەتاکەوە هەستی پێی کردبوو، خەریکە شلۆق دەبێت، گەرچی ترسم لە مردن کەم نەدەبووەوە، بەڵام پێم وا بوو هەر هیچ نەبێت لە بەتەنیایی ترسان ڕزگارم دەبێت. بێگومان نرخی ئەمەم لە

ئەشکەنجەدانی شەوان دەدا، بەڵام ئیدی گەیشتبوومە ئەو ئاکامەی تێکۆشانەکەم لە خۆڕایی نەبووە: هەر کاتێک خۆجە دەستی لێم بەرز دەکردەوە، بیرم دەخستەوە ئەو پێش من دەمرێت. نەزانیی ئەوانەی ناترسن و نووسینە نیوەناچڵەکانی خۆی و خەونە کامەرانەکانی خۆم دەخستەوە بیری، ئەو خەونانەی کە بەدرێژاییی ئەو ڕۆژە خوێندبوونییەوە.

بەڵام جامی ئەو بە قسەکانی من نا، بە شتێکی تر پڕ بوو. ڕۆژێک باوکی یەکێک لە قوتابییەکان هات بۆ ماڵ. بە ڕووخساریدا پیاوێکی جوامێر دیار بوو، لە گەڕەکی خۆمان دادەنیشت. من وەک پشیلەی تەمبەڵی ماڵەوە خۆم خزاندبووە گۆشەیەکەوە و گوێم ڕاگرتبوو. بە دوور و درێژی دەربارەی چەند بابەتێک قسەیان کرد. دواتر مێوانەکەمان هاتە سەر کرۆکی مەبەست: کچی پوورەکەی، پاش ئەوەی هاوینی ڕابردوو مێردەکەی لە کاتی سواغدانی سەربانێدا کەوتووەتە خوارێ و مردووە، بە بێوەژنی ماوەتەوە. ئێستا داخوازیکاری زۆری هەیە، بەڵام ئەو خۆجەی بەخەیاڵدا هاتووە، چونکە لە دانیشتووانی گەڕەکی بیستووە خۆجە پێشوازیی لە هەندێک کەس کردووە لەوانەی بەنیاز بوون ژنی بۆ بدۆزنەوە. خۆجە کاردانەوەیەکی هێندە توندی پیشان دا کە من هەرگیز چاوەڕێم نەدەکرد: بە کابرای گوت نایەوێت ژن بهێنێت، خۆ ئەگەر ژنیش بخوازێت، بێوەژن ناهێنێت. یارۆی مێوان بیری خۆجەی خستەوە حەزرەتی موحەمەد بێ ئەوەی گوێ بە بێوەژنیی حەزرەتی خەدیجە بدات، خواستوویەتی و کردوویەتی بە ژنی یەکەمی خۆی. خۆجەش گوتی ناوی بێوەژنەکەی بیستووە و باوەڕی وا بوو بە نینۆکی پەنجەی حەزرەتی خەدیجەشدا ناگات. پاشان مێوانە لووت سەیرەکەمان ویستی لە خۆجە بگەیەنێت خۆیشی کابرایەکی هێندە دانسقە نییە و گوتی: "من خۆم بڕوا ناکەم، بەڵام خەڵکی گەڕەک دەڵێن خۆجە ڕەپ و ڕاست هۆشی لە دەست داوە. کەسیش نییە سەیرکردنی ئاسمانت و گەمە کردنت بە زەڕەبین و دروستکردنی سەعاتی سەیر و سەمەرەت بە باشە لێک بداتەوە."

مێوانەکەمان، وەک ئەو بازرگانە چاوچنۆکانەی کە هەوڵ دەدەن لە کاتی

کریندا بەهای شتومەک و کاڵا بشکێنن، درێژەی دایێ و گوتی: "خۆجە بۆ نان خواردن چۆک دانادات و چوارمشتەقی دانانیشێت، بگرە گاور ئاسا لەسەر مێز نان دەخوات. دوای ئەوەی بە توورەکە پارە بە کتێب دەدات، کتێبەکان لەسەر زەوی فڕێ دەدات و پێ بەو پەڕانەدا دەنێت کە ناوی پەیامبەریان تێدایە. لەبەر ئەوەی دوای چەندین سەعات سەیرکردنی ئاسمان ناتوانێت ئیبلیسی ناو هەناوی خۆی هێور بکاتەوە، لەبەر تیشکی خۆر لەسەر پێخەو ڕادەکێشێت و سەیری بنمیچی قرێژی ماڵەوە دەکات. دەرودراوسێ دەڵێن: خۆجە تەنیا خۆشیی بەچارەی کوڕاندا دێت، نەک ژنان. دەڵێن ئەو پیاوەی ماڵ هاوجمکێتی و چەند ڕۆژێکیشی لە ڕۆژووی ڕەمەزان خواردووە، بۆیە ئەم پەتایە بڵاوبووەتەوە."

دوای ئەوەی میوانەکەمان دەرکرایە دەرەوە، خۆجە تووشی تەنگژەی هەڵچوون بوو. دڵنیا بووم ئەو ئارامییەی لە ئەنجامی هاوسۆزی پێشاندان لەگەڵ ئەوانی تردا هەستی پێی دەکرد، بەکۆتا هاتووە. بۆ ئەوەی دوایین جەزرەبەی لێ هەڵسێنم، گوتم ئەوانەی لە پەتاکە ناترسن، وەک ئەو کابرایە دەبەنگن. شڵەژا، بەڵام ڕوونی کردەوە خۆیشی لە پەتاکە ناترسێت. لەبەر هەر هۆیەک بێت خۆم قایل کرد بەوەی ئەم قسەیەی لە ناخەوە کردبێت. زۆر توورە بوو، جێیەکی نەدەدۆزییەوە دەست و قۆڵی خۆی بۆ ببات. دیسانەوە بالۆرەی "گەمژەکان" کە ماوەیەک بوو لە بیری کردبوو، کەوتەوە سەر زمانی و دووبارەی دەکردەوە. دوای داهاتنی تاریکی، چرای داگیرساند، لە ناوەڕاستی مێزەکەدا دای نا و داوای کرد هەردووکمان لە بەردەمیدا دابنشین. پێویست بوو چەند شتێک بنووسین.

وەک دوو کوڕی زگورتی کاتێک بۆ بەسەربردنی شەوە درێژ و نەبڕاوەکانی زستان گەمەی کاغەز دەکەن، لە بەرامبەر یەکتر لەمبەر و ئەوبەری مێز دانیشتبووین و لە سەر کاغەزە خاڵییەکانی بەردەممان شتمان دەنووسییەوە. خۆمانم زۆر سەیر دەهاتە پێش چاو! لەوەش سەیرتر، نووسینەکانی خۆجە بوون کە بەیانیی ڕۆژی دواتر خوێندییەوە و خۆی بە خەون ناوی بردن. بە

لاساییکردنەوەی خەونەکانی من، ئەویش خەونێکی گێڕایەوە، بەڵام بەهەموو شتێکیدا دیاربوو ئەوە خەونێکی نەبیندراوە: لە خەونی ئەودا ئێمە برا بووین! خۆی ڕۆڵی براگەورەی منی بە خۆی ڕەوا دیبوو، منیش ئاقڵ ئاقڵ گوێم بۆ قسە زانستییەکانی ڕاگرتووە. سەرلەبەیانیی ڕۆژی دواتر لە کاتی ناشتی خواردندا لە منی پرسی داخۆ چۆن بۆ واتەواتی خەڵکی گەڕەک سەبارەت بەوەی ئێـمـە دووانەین، دەڕوانم؟ ئەم پرسـیـارەم پێ خـۆش بوو، بەڵام ختـووکـەیەکی ئەوتۆی شکۆشـمی نەدا. دوو ڕۆژ دواتر لە نیـوەی شـەودا هۆشیـاری کردمـەوە و گوتی بەڕاستی خەونێکی دیوە. لەوانەیە ڕاستـیـشی گوتبێت، بەڵام من، لەبەر هەر هۆیەک بێت، گوێم نەدایێ. شەوی دواتر گوتی لەوە دەترسێت بە پەتاکە بمرێت.

بەهۆی بێزاربوونمەوە لە مانەوەی زۆر لە ماڵ، لای ئێوارە چوومە کـوچە و کۆڵانان. لە باخچەیەکدا، منداڵان چووبوونە سەر دار و پێڵاوە ڕەنگینەکانیان لە خوارەوە بەجێ هێشتبوو. دەستـەیەک ژنی چەنەباز بەدەوری کانییەکەوە ریزیان بەستـبـوو، تەنانەت بە تێپەڕبوونی منیش بەلایاندا بێدەنگ نەبوون. بازاڕ پڕ بوو لە کـڕیار. هەندێک بە لەزەتەوە سـەیری شـەڕکـەران و ناوبژیوانانیان دەکرد. هەوڵم دەدا باوەڕ بەخۆم بهێنم پەتاکە تەوژمی خۆی لە دەست داوە، بەڵام بەبینینی ئەو دارەبازانەی یەک لە دوای یەک لە مـزگـەوتی بایەزیدەوە دەهێندرانە دەرێ، دەمـارەکـانی مـێـشکم گـرژ بوونەوە و بەلەز گەڕامەوە بۆ ماڵ. لەوەدا بووم بچمە ژوورەکەی خۆم، خۆجە بانگی کرد: "ئا وەرە سەیرێکی ئەمە بکە." قژیچەی کورتەکەکەی کردبووەوە و ئاماژەی دەکرد بۆ دوومەڵێکی بچـووک و قنچکەیەکی ژێر سکی. گـوتی: "مـەگـەز هـەمـوو شـوێنێکی تەنیـوە." لێی نێـزیک بوومـەوە و بەوردی سـەرنجم دا، پەڵەیەکی سووری بچووک بوو، دوومەڵێکی سووکەڵە، وەک جێی گەستنی مەگەزێک. بەڵام بۆچی پێشانی منی دەدا؟ ترسـام ڕووی خۆم زیاتر نێـزیک بخـەمـەوە. خۆجە گوتی: جێی گازی مەگەزە، وا نییە؟" نووکی پەنجەی خستە سەر دوومەڵەکە: "یان کێچە؟" بێدەنگ بووم. نەمگوت هەرگیز جێگازی لەو جۆرەی کێچم نەدیوە.

بیانوویەکم دۆزییەوە و تا خۆر ئاوابوون لە باخچە مامەوە. هەستم دەکرد دەبێت ئیدی لە ماڵ نەمێنم، بەڵام شوێنێکم لە خەیاڵدا نەبوو بۆی بچم. ئەگەرچی پەڵەکەی ژێر سکی خۆجە لە جێی گەستنی مەگەز دەچوو، بەڵام بەقەد برینی پەتایەک گەورە و بەرین نەبوو. پاشان شتێکی ترم بەخەیاڵدا هات و پێم وا بێت هۆیەکەی بۆ پیاسەکردنم بەناو گیای خێرا گەشەکردووی باخچەکەدا دەگەڕێتەوە: بیرم دەکردەوە پەڵە سوورەکەی لە ماوەی دوو ڕۆژدا دەئاوسێت، وەک گوڵێک دەم دەکاتەوە، دەتەقێتەوە و خۆجە بەدەم ئازارەوە گیان دەسپێرێت. دەمویست پێی بڵێم ئەوە جێی گەستنی مەگەزی زەبەلاح و شەوگەڕی وڵاتێکی زۆر گەرمە، بەڵام هەرچەندی کۆشام ناوی ئەو مەگەزەی خەیاڵم لێی دابوو، نەدەهاتە سەر زمانم.

ئێوارە، کاتی دانیشتنمان بۆ خواردن، خۆجە دەکۆشا خۆی کەیفساز پیشان بدات. گەمەی کرد، سەری نایە سەرم، بەڵام ئەمە زۆری نەخایەند. پاش هەڵسانی بێدەنگمان لەسەر خواردنەکە و ساتێکی درێژ دوای سنگدادانی تاریکییەکی بێ هەوا و ئارام، خۆجە گوتی: "هەست بە بێزاری دەکەم، بیرۆکەیەکم بۆ هاتووە، با بچینە بەردەم مێز و شتگەلێک بنووسین." دەمگوت تەنیا بەو جۆرە دەتوانێت دڵی خۆی بداتەوە.

بەڵام نەیتوانی بنووسێت. من بەوپەڕی ئاسوودەییەوە دەمنووسی و ئەویش بێ کاروبار دانیشتبوو، بە تیلەی چاو سەیری منی دەکرد. گوتی: "چی دەنووسیت؟" نووسیبووم چۆن دوای کۆتاییی ساڵی یەکەمی دەرزخانەی ئەندازیاری لە سەرەتای پشوودا بیری ماڵەوەم دەکرد و بە گالیسکەیەکی تاک ئەسپ گەڕامەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا قوتابخانە و هاوڕێکانیشم زۆر خۆش دەویست. نووسیبووم زۆر بیری ئەو کتێبانەم کردووە کە لە پشووی هاویندا لەگەڵ خۆم دەمهێنانەوە و بەتەنیا لە قەراغی سەرچاوەیەکی ئاو دەمخوێندنەوە. وای بێدەنگییەکی کورت، خۆجە، وەک ئەوەی ڕازێک بدرکێنێت، بەچرپە پرسی: "ئەوانەی ئەوێ بەردەوام بەو شێوەیە بە کامەرانی دەژین؟" وام زانی دوای لێبوونەوە لە پرسیارەکەی، یەکسەر پەشیمان

دەبێتەوە، بەڵام هێشتا وەک منداڵێکی بەپەرۆش سەیری دەکرد. منیش بەچرپە گوتم: "من کامەران بووم!" هێمای سووکە ئیرەیی پێبردنێک کەوتە سەر ڕووخساری، بەڵام ترسناک نەبوو. بە شەرم و دوودڵییەوە دەستی بە گێڕانەوە کرد:

ئەو سەردەمەی لە ئەدرنە بووە و دوازدە ساڵان بووە، ماوەیەک لەتەک دایک و خوشکیدا هاتوچۆی تیمارخانەی مزگەوتی بایەزیدی کردووە، چونکە باپیری (باوکی دایکی) نەخۆشیی گەدەی هەبووە. بەیانیان بەرلەوەی بەڕێ بکەون، دایکی، براکەی تری لای هاوسێکان بەجێ هێشتووە. خۆجە و خوشکەکەی و قاپی موحەلەبیی پێشتر ئامادەکراوی هەڵگرتووە و پێکەوە کەوتوونەتە ڕێ. هەموو جارێک بە ڕێگەیەکی کورت، بەڵام زۆر دڵگیری ژێر سێبەری ڕیزە داری سپینداردا تێ پەڕیون. باپیریان بەسەرهاتی بۆیان گێڕاوەتەوە. خۆجە حەزی لەو بەسەرهاتانە نەبووە، زیاتر ئارەزووی بینینی ناو تیمارخانەی کردووە، بۆیە هەموو جارێک ئەوانی تری بەجێ هێشتووە و سەیری دەوروبەری کردووە. جارێک لە ژێر قوبەیەکی زۆر گەورەدا کە تیشکی ڕۆژی دزەکردوو لە کلاوڕۆژنەکانەوە ڕووناکی کردووەتەوە، گوێی لە موزیکێک بووە بۆ کەسانی تووشبوو بە نەخۆشیی دەروونی ژەندراوە. دەنگی ئاویش هاتووە، ئاوی زێ. دواتر بە چەند ژوورێکی پڕ لە شووشە و قاپی درەوشاوەی دەگمەن و ڕەنگیندا گەڕاوە. جارێک ڕێی لێ ون بووە و دەستی بەگریان کردووە. ژوور بە ژووری تیمارخانە گەڕاندوویانە تا عەبدوڵا ئەفەندیان دۆزیوەتەوە. دایکی جاروبار گریاوە، ناوبەناویش لەگەڵ کچەکەیدا گوێیان بۆ چیرۆکەکانی باپیرە ڕاگرتووە. دواتر، قاپە بەتاڵەکەیان لە باپیرە وەرگرتووەتەوە و گەڕاونەتەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگەنەوە ماڵ، دایکی حەلوای بۆیان کڕیوە، گوتوویەتی با بێ ئەوەی کەس بمانبینێت، بیخۆین. لە ناو سپیندارەکانی قەراغ ئاو شوێنێکیان هەبووە، هەرسێکیان دانیشتوون، لاقیان بۆ ناو ئاو درێژ کردووە و بێ ئەوەی کەس چاوی پێیانەوە بێت، حەلوایان خواردووە.

پاش ئەوەی خۆجە کۆتایی بە قسەکانی هێنا، بێدەنگییەک باڵی بەسەرماندا کێشا و ئەمەش ئێمەی لە یەکتر نزیک دەخستەوە. ئەم لێک نزیکبوونەوەیەش هەستێکی سەیری برایەتی لامان دروست کرد کە هەردووکمانی نیگەران کرد. خۆجە ساتێکی درێژ بەرگەی ئەم نیگەرانییەی گرت. دواتر، کاتێک دەرگای گەورەی ماڵێکی نزیکمان بێ بیرکردنەوە و بەدەم زرمەیەکی گەورەوە پێوە درا، خۆجە گوتی: "یەکەمجار لەو سەروبەندەدا بەهۆی نەخۆشەکان و شووشە و قاپی ڕەنگاوڕەنگ و پێوانەی هۆکاری چاکبوونەوەی نەخۆشانەوە خووم دایە زانست." بەڵام دوای مردنی باپیری، بۆیان نەلواوە جارێکی تر بچنەوە ئەوێ. ئیدی خۆجە بەردەوام لە خەیاڵی خۆیدا بیر دەکاتەوە هەر کاتێک پێ گەیشت و گەورە بوو، بەتەنیا بۆ ئەوێ بچێت، بەڵام ساڵێک ئاوی ڕووباری تونجا سەر دەکات، نەخۆشەکان لە جێگە دەردەهێندرێن و دوور دەخرێنەوە و ئاوی قرێژ و بۆگەنی ناو ژوورەکانی تیمارخانە تا ماوەیەکی درێژ ناکشێتەوە. دوای کشانەوەش، تیمارخانەی جوان و دڵگیر لە قوڕ و لیتەیەکی بۆگەن و بە نەفرەتکراودا دەمێنێتەوە و تا ساڵانێکی درێژ خاوێن ناکرێتەوە.

ئەمجارەیان دوای بێدەنگبوونی خۆجە، ئیدی هەستمان بە نزیکیی نێوانمان نەکرد. لە بەردەم مێزەکە هەڵسابوو، بە تیلەی چاو سێبەرەکەیم دەبینی بە ژوورەکەدا دەگەڕا. پاشان چرای سەر ناوەڕاستی مێزەکەی هەڵگرت و چووە پشتمەوە، ئیدی نە سێبەرەکەیم دەبینی و نە خۆی. ویستم خۆم بسووڕێنم و سەیری بکەم، بەڵام نەمتوانی، هەستم دەکرد چاوەڕێی خراپەیەک دەکەم و نیگەران بووم. دوای کەمێک گوێم لە خشەی داکەندنی جلێک بوو، بەترسەوە ئاوڕێکم دایەوە. لە ناوقەد بەرەو سەرەوەی ڕووت کردبوو. چووە بەردەم ئاوێنەکە، لەبەر تیشکی چراکە بە سەرنجەوە لە سنگ و سکی خۆی ورد بووەوە و گوتی: "ئەی خوا، ئەمە چ دوومەڵێکە؟" بێدەنگ بووم. گوتی: "ئا وەرە سەیرێکی ئەمە بکە." نەمدەتوانی لە شوێنی خۆم بجووڵێم. هاواری کرد: "گوتم ئا وەرە!" وەک یەکێک لە قوتابییەکانی خۆی لە کاتی سزادانیاندا، بە ترسەوە لێی نزیک بوومەوە.

هەرگیز ئەوەندە لە جەستەی ڕووتی نێزیک نەکەوتبوومەوە و حەزم بەو نێزیکبوونەوەیە نەدەکرد. سەرەتا ویستم باوەڕ بەخۆم بهێنم تەنیا لەبەر ئەوەمە کە نامەوێت لێی نێزیک بکەومەوە، بەڵام دەمزانی لەبەر ترسمە لە دوومەڵەکە. ئەویش لەمە حاڵی بوو. بۆ ئەوەی وا تێ نەگات، سەرم لێی نێزیک کردبووەوە و وەک پزیشک چاوم لە دوومەڵ و پەڵەکانی بڕیبوو. پاشان لە ژێر لێوەوە بڵمەبڵمێکم کرد. خۆجە لە ئاکامدا گوتی: "دەترسیت، وا نییە؟" بۆ سەلماندنی نەترسانم، هێندەی دی سەرم لێی نێزیک خستەوە. گوتی: "ترسی ئەوەت هەیە دوومەڵی پەتا بێت؟" وا ڕەفتارم کرد وەک ئەوەی ئەو وشەیەم نەبیستبێت. دەمویست بڵێم جێگازی مەگەزە، مەگەزێکی دەگمەن کە جارێک دابووی بە شوێنێکی لەشی منیشەوە، بەڵام هێشتا ناوی ئەو بوونەوەرەم بەخەیاڵدا نەهاتبوو. خۆجە گوتی: "ئا دەستێکی لێ بدە! چۆن تێ دەگەیت ئەگەر دەستی لێ نەدەیت؟ سا دەی دەستێکم لێ بدە!"

کاتێک بینی دەستی لێ نادەم، خۆشحاڵی گرتی. پەنجەکانی بەسەر دوومەڵەکەدا هێنا و پاشان لە ڕووی منی نێزیک خستنەوە. کاتێک سەیری کرد بە ڕق و نەفرەتەوە چارەی خۆمم گرژ کردووە، قاقایەکی بەرزی لێ دا. لەبەر ئەوەی لە جێگازی بچووکی مەگەزێک دەترسم، کەوتە شۆخیکردن پێم، بەڵام ئەم شاگەشگەبوونەی زۆری نەخایەند. لەپڕ گوتی: "لە مردن دەترسم." وەک ئەوە وا بوو لە بارەی شتێکی ترەوە بدوێت، لە شەرم زیاتر، تووڕەیی پێوە دیاربوو، تووڕەیی کەسێکی زۆرلێکراو. گوتی: "دڵنیایت تۆ ئەم دوومەڵەت لێ نەهاتووە؟ ئادەی خۆت ڕووت بکەرەوە!" ئەو زیاتر پێی داگرت، بۆیە من وەک منداڵێک چۆن ڕقی لە خۆشوشتن دەبێتەوە، کراسم داکەند. ژوورەوە گەرم و پەنجەرە داخرابوو، بەڵام لە شوێنێکەوە شنەیەکی فێنک هات، نازانم، لەوانەیە ساردیی ئاوێنەکە بووبێت مچوڕکەی پێمدا هێنابێت. لەبەر ئەوەی شەرمم بە دیمەنی خۆمدا دەهاتەوە، شەقاوێکم نا و لە چوارچێوەی ئاوێنەکە چوومە دەرەوە. ئەمجارەیان لەلایەکی ئاوێنەکەدا ڕووی خۆجەم بینی، سەری لە جەستەی من نێزیک دەخستەوە. ئەو سەرە زلەی هەمووان پێیان وا

بوو له سەری من دەچێت، بەلای جەستەمدا لار بووەوە. لەپڕ بەخەیاڵمدا هات ئەم ڕەفتارەی بۆ ژەهراویکردنی ڕۆحی منە. ئەمە له کاتێکدا من تەواو بە پێچەوانەوە ڕەفتارم دەکرد و ساڵانێک بوو شانازیم بەوەوە دەکرد من ئەو فێر دەکەم. ئەگەرچی ئەوەی بەخەیاڵمدا هات مایەی پێکەنین بوو، بەڵام بۆ ساتێک وای بۆچووم ئەو سەرە بژەی کە لەبەر تیشکی چراکەدا شەرمی لەبەر هەڵگیراوە، خەریکە خوێنم دەمژێت! لەو ساتەدا هەستم بە تام و چێژی بەسەرهاتە ترسناکەکانی سەردەمی منداڵیم دەکرد. کاتێک نوقمی ئەو بیرکردنەوانە بووم، لە سەر سکم هەستم بە پەنجەکانی کرد. دەمویست هەڵبێم و شتێک بکێشم بە سەریدا. گوتی: "تۆ نیتە." چووە پشتمەوە، بن قۆڵ و مل و پشت گوێیەکانیشمی پشکنی. گوتی: "ئێرەشت هیچی پێوە نییە، مەگەز بە تۆوەی نەداوە."

دەستی خستە سەر شانم و هاتە تەنیشتمەوە. وەک ئەوەی برادەرێکی سەردەمی منداڵیی ئەو بم و گرێی دڵی خۆیم بۆ بکاتەوە. بە پەنجەکانی پشتی ملمی گوشی و بەرەو لای خۆی بەکێشی کردم. گوتی: "وەرە با پێکەوە سەیری ئاوێنە بکەین. سەیرێکم کرد، لەبەر تیشکی درەوشاوەی چراکەدا جارێکی تریش لەیەکچوونی لە ڕادەبەدەری نێوان خۆمانم بینی. بیرم کەوتەوە، ئەو دەمەی لە بەردەم دەرگای والی سادق پاشا چاوەڕێم دەکرد و یەکەمین جار خۆجەم بینی، هەمان ئەم هەستەی ئێستام لەکن دروست بووبوو. ئەو کاتە کەسێکم بینی بوو کە دەبوو خۆم بوومایە. ئێستاش بیر دەکەمەوە دەبێت ئەویش کەسێک بێت وەک من. هەردووکمان یەکێک بووین! ئێستا ئەمەم جۆری ڕاستییەکی ڕوون دەهاتە بەرچاو. وەک ئەوەی دەست و پێم لە کۆت و زنجیردا بێت، بە گۆجی هەڵسامە سەر پێ. بۆ خۆدەربازکردن جووڵەیەکم کرد. وەک ئەوەی بمەوێت بۆم دەربکەوێت داخۆ من خۆمم، بەپەلە دەستم بە قژمدا هێنا. ئەویش زۆر شارەزایانە و بێ ئەوەی هاوشێوەی ناو ئاوێنەکە تێک بدات، هەمان شتی کرد. لاسایی نیگاکانیشمی دەکردەوە. ئەو، شێوەی ڕاوەستانی سەرم و سەرسووڕمانی منی دووبارە کردەوە، کەچی من خۆم توانای

سەیرکردنیم لە ئاوێنەکەدا نەبوو، لە تاو ترسیش نەمدەتوانی نیگای لەسەر هەڵبگرم. وەک منداڵێک چۆن لاسایی قسە و جووڵەکانی هاوڕێیەکی دەکاتەوە و تووڕەی دەکات، شاگەشگە بووبوو. نەڕاندی: پێکەوە دەمرین! لە خەیاڵی خۆمدا گوتم چ تووڕەهاتێکە. بەڵام ترساشم. ئەو شەوە، یەکێک بوو لە ترسناکترین ئەو شەوانەی لەگەڵ ئەودا بەسەرم برد.

پاشان گوتی هەر لە سەرەتاوە لە پەتاکە ترساوە و هەموو شتێکیشی بۆ تاقیکردنەوەی من کردووە؛ چ ئەو کاتەی جەلادەکانی والی سادق پاشا منیان بۆ کوشتن داوەتە پێش خۆیان، یان وەک ئێستا ئەگەر خەڵکانی تر ئێمە بە هاوجەمک دەزانن، هەمووی بۆ تاقیکردنەوەی منە. پاشان گوتی: ڕۆحت لە لەپی دەستمدایە. کتومت وەک چۆن کەمێک لەمەوپێش لاسایی جووڵەکانتم کردەوە، لەمەودوا بیر لە هەرچییەک بکەیتەوە، من پێی دەزانم. هەرچیش بزانیت، من بیری لێ دەکەمەوە!" دوایی لێمی پرسی داخۆ لەو ساتەدا بیر لە چی دەکەمەوە. منیش، جگە لەو، هیچ شتێکی تر لە خەیاڵمدا نەبوو. گوتم بیر لە هیچ ناکەمەوە. بەڵام گوێی لێم نەدەگرت، چونکە بۆ تێگەیشتن نا، تەنیا بۆ ترساندنی من دەدوا، گەمەی لەتەک ترسی خۆیدا دەکرد و مەبەستی بوو منیش بەشی خۆم لەو ترسە بەربکەوێت. سەرنجم دابوو تا زیاتر هەستی بەتەنیایی بکردایە، ڕادەی مەیلی شەڕانگێزیی دەچووە سەرێ. ئەگەر دەستی بەسەر ڕووی هەردووکماندا دەگێڕا و دەیویست بە ئەفسوونی ئەو لەیەکچوونە سەیرەمان سەرسامم بکات و لە من زیاتر دەهاتە جۆش، من وای بۆ دەچووم دەخوازێت ڕەفتاری خراپ بنوێنێت. بەخۆم گوت لەبەر ئەوەی لە دڵەوە ڕازی نییە یەکسەر دەست بە شەڕانگێزی بکات، منی لە بەردەم ئاوێنەدا ڕاگرتووە و پشتی ملم دەگوشێت، بەڵام هێندە تووڕەهات و بێچارەش نەدەهاتە پێش چاوم. هەقی خۆی بوو، منیش دەمویست قسە و ڕەفتارەکانی ئەو بکەم. لە پای ئەوەی بە دەسپێشخەریکردن توانیبووی گەمە بە پەتاکە و ترسی ناو ئاوێنەکە بکات، ئیرەییم پێی دەبرد.

بەڵام سەرباری ئەو هەموو ترسە و بیرکردنەوەم لە پەی بردن بەو شتانەی

تایبەت بەخۆم بوون و پێشتر بیرم لێیان نەکردبووەوە، کردم و کۆشام نەمتوانی خۆم لەو هەستە ڕزگار بکەم کە هەموو ئەم شتانە گەمەن. پەنجەکانی شل کردبوو، ئیدی پشتەملمی نەدەگوشی، بەڵام من لە بەردەم ئاوێنەکە نەدەکشامەوە. خۆجە دواتر گوتی: "من وەک تۆم لێ هاتووە. ئیدی دەزانم چۆن دەترسیت. من بووم بە تۆ. حاڵی بووم دەڵێت چی، بەڵام هەوڵم دا ئەو فاڵگرتنەوەیە کە ئەمڕۆ گومانم لە ڕاستبوونی نیوەی نییە، بە تووڕەهات و منداڵانە دابنێم. لافی ئەوەی لێ دا دنیا وەک من دەبینێت. دیسان دەیگوت: "ئێستا بەتەواوی تێ دەگەم (ئەوان) چۆن بیر دەکەنەوە و چۆن دەبیستن." نیگای لە ئاوێنەکە دوور خستەوە، تیشکی چرا نیوەی مێزەکەی ڕووناک کردبووە، سەیرێکی مێزەکە و پەرداخ و کورسی و شتەکانی تری کرد و کەمێک قسەی کرد. دواتر گوتی گوایە ئەو شتانەی پێشتر لەبەر نەبینینیان نەیدەتوانی گوزارەیان لێ بکات، ئێستا دەتوانێت دەریان ببڕێت. بەڵام من پێم وا بوو خۆی لە خشتە دەبرد، چونکە وشەکان و شتومەکانیش هەمان ئەوانەی پێشوو بوون. تاکە شتێکی نوێ لەودا، ترسەکەی بوو. ئەوەش نا، بگرە شێوازی هەڵکردن لەگەڵ ترسەکەیدا. بەڵام من پێم وا بوو ئەو شێوازی هەڵکردنە کە ئێستاش بەلامەوە ڕوون نییە، شتێکی نوێ، یان گەمەیەکی تری ئەو بوو لە بەردەم ئاوێنەدا. پێ دەچوو بێ ویستی خۆی بوو بێت، گەمەکەی لادەدایە لاوە، گرگر دەگەڕایەوە سەر دوومەڵەکە و دەیپرسی داخۆ جێگازی مەگەزە، یاخۆ پەتایە؟

پاشان گوتی دەیەوێت من هەموو شتێک لەو شوێنەوەی تیایدا ڕاوەستابووم، دەست پێ بکەمەوە. هێشتا نیوە ڕووت بووین و لە بەردەم ئاوێنەکە نەکشابووینەوە. پێشنیازی وا بوو ئەو بێتە جێی من و منیش بچمە جێی ئەو. بۆ ئەمەش، ئەوەندەمان بەس بوو جلوبەرگی خۆمان بگۆڕینەوە، ئەو ڕدێن بتاشێت و منیش ڕیشی خۆم بهێڵمەوە. ئەم بیرۆکەیە، لەیەکچوونی ئێمەی لە ئاوێنەکەدا ترسناکتر نواند، دەمارەکانی مێشکم بەتەواوی ئاوسان، گوێم ڕاگرت: ئەگەر وا بوایە، دەبوو من ئەوم ئازاد بکردایە. زۆر بە

شادمانییەوە باسی ئەو شتانەی دەکرد کە دوای ئەوەی لە جێی من دەچێتەوە وڵاتەکەم، لەوێ دەیانکات. هەرچییەکم لە بارەی منداڵی و گەنجایەتیی خۆمەوە بۆی گێڕابووەوە، هەر هەمووی بە بچووکترین وردەکارییەوە لە هۆشی خۆیدا پاراستبوو. زۆریش سەرم سووڕما ئەگەر سەیرم کرد بە پشتبەستن بەو وردەکارییانە و بەپێی بۆچوونی خۆی، لە خەیاڵی خۆیدا جیهانێکی ناجۆر و دوور لە ڕاستیی خوڵقاندووە. وەک ئەوە وا بوو ژیانم لە ژێر دەستی خۆم دەرچووبێت و لە دەستی ئەودا ئاڕاستەی شوێنی تر بکرێت، منیش، هیچی ترم لە دەست نەیەت، تەنیا ئەوە نەبێت وەک ئەوەی خەون ببینم، لە دوورەوە سەیری ئەو شتانە بکەم کە بەسەرم دێن. گەڕانەوەی ئەو لەبری من بۆ وڵاتەکەم و ئەو ژیانەی لەوێ بەسەری دەبات، ڕەهەندێکی گاڵتەجاڕانەی هێندە نامۆ و سادەی تێدا بوو، بەجۆرێک منی بەتەواوی لە باوەڕ پێهێنانی دوور دەخستەوە. لە سەرێکی ترەوە سەرم لە لۆجیک و گونجانی وردەکارییەکانی ناو خەیاڵی ئەو سووڕمابوو: لە ناخەوە دەمویست بڵێم کەواتە بۆی هەیە شتی واش بقەومێت و منیش بتوانم وا بژیم. لەو ساتەدا تێ گەیشتم بۆ یەکەمجار پەیم بە شتێکی قووڵی تایبەت بە ژیانی خۆجە بردووە، بەڵام لە ڕەوشێکدا نەبووم بتوانم بڵێم ئەو شتە چییە. بە سەرسووڕمانەوە گوێم بۆ ڕەفتار و کردەوەکانی دنیای کۆنم ڕاگرتبوو، ساڵانێکیش بوو بە تاسەوە بیرم لێ دەکردنەوە و ترسی پەتاکەم لە بیر چووبووەوە.

بەڵام ئەمە زۆری نەخایەند. ئەمجار خۆجە داوای لێم کرد پێی بڵێم ئەگەر بچمە بەرگی ئەوەوە، چی دەکەم. لەیەکچوونمان و ڕاوەستانی سەیری من لەو بارەدا بەدەم هەوڵدانمەوە بۆ ئەوەی بڕوا بەخۆم بهێنم دوومەڵەکە جێگازی مەگەز نەبێت هیچی تر نییە، منی بەڕادەیەک تووڕە کردبوو، بەجۆرێک هیچ شتێکی ترم بەخەیاڵدا نەهات. دوای ئەوەی زۆری بۆم هێنا، بیرم کەوتەوە گوتم ماوەیەک لەمەوبەر ئەوەم لە خەیاڵدا بووە دوای گەڕانەوەم بۆ وڵات بیرەوەرییەکانم بنووسمەوە. هەر ئەوەندەی گوتیشم لەوانەیە ڕۆژێک لە ڕۆژان چیرۆکێک لە بەسەرهاتەکانم پێک بهێنم و بینووسمەوە، ئەو بە نەفرەت و بە

چاوی سـووک بۆمـی ڕوانـی. ئەو ڕای وا بـوو هێنـدەی ئەو من دەناسـێت، من هیچ کاتێک ناتوانم بەو ڕادەیە ئەو بناسم! پاڵێکی پێمەوە نا و خۆی بەتەنیا چووە بەردەم ئاوێنە: ئێسـتـا پێم دەڵێت چیم بەسـەردێت ئەگـەر ئەو بچێتـە پێستی منەوە! دەسپێک گوتی: "دوومەڵەکە برینی پەتایە و دەمریت." پاشان باسی ئەوەی کـرد چۆن بەر لە مـردنم بە دەست ئازارەوە دەناڵێنم. "لە مـردن خراپتر، ترسانتە لە مردن، چونکە تا ئێستا خۆت بۆی ئامادە نەکردووە. ئەو ساتەی خۆجە باسی چۆنیەتیی نوقمبوونی منی لە ئازارەکانی نەخۆشیدا دەکرد، لە ئاوێنە دوور کەوتبووەوە. پاش کەمێک بینیم لەسەر پێخەوە پەرت و بڵاوەکەی سەرزەوی ڕاکشاوە و باسی ئێش و ئازارە چاوەڕوانکراوەکانی من دەکات. دەستێکی نابووە سەر سکی، وەک بڵێیت خستبێتیە سەر شوێنی ئەو ئازارانەی کە باسی دەکردن. ڕێک لەو کاتەدا بانگی کردم، بەترسەوە چوومە تەنیشتییەوە، بەڵام دەستبەجێ پەشیمان بوومەوە، چونکە دیسان هەوڵی دا دەستم پێدا بهێنێت. هەرچۆنێک بێت ئیدی بڕوام بەخۆم هێنا ئەوە تەنیا جێگازی مەگەز بێت، بەڵام سەرباری ئەوەش هەر دەترسام.

تەواوی شـەو بـەو جـۆرە بەسـەرچوو. بەمـەبەسـتی ئەوەی نەخـۆشـیی و ترسـەکـەی تووشـی من بکـات، لێکداکێکدا دووبارەی دەکـردەوە من ئەوم و ئەویش منە. لە دڵی خـۆمـدا گـوتم ڕەنگە لەبەر چێـژوەرگـرتنی بێت لەوەی لە پێستی خۆی دەرچووە و سـەیری خـۆی دەکات. وەک کەسێک بیەوێت لە خـەو هۆشیار بێتەوە، بەخۆم دەگوت: "گەمـە دەکات، چـونکە خۆیشی ئەو وشـەی – گەمـە–یەی دەگوتەوە." لە سـەرێکی تریشەوە چین چین ئارەقەی دەردەدا، بەڵام نەک وەک کەسێک لە ژوورێکی گەرمدا بە دەست وشە خنکێنەرەکانەوە تەنگاو بووبێت، بگرە وەک نەخۆشێکی کەمئەندام.

لەگـەڵ تـاریک و ڕوونـی بەیاندا، ئەو سـەبارەت بـە ئەسـتێـرەکـان و مـردن، فاڵگرتنەوەی درۆ و بێ بنەمـا، گەمژەیی سـوڵتـان، بەواتەیەکی تر بێ وەفـایی سـوڵتـان، گەمژە خـۆشـەویسـتـەکانـی خۆی، "ئێمـە" و "ئەوان" و لەمـەڕ ویسـتی خۆی بۆ بوون بە کەسێکی تر دوا! چی دی گوێم لێی نەگرت و چوومە باخچە.

نازانم لەبەر چی بوو چەند بیرۆکەیەکی تایبەت بە نەمری کە لە کتێبێکی کۆندا خوێندبوومەوە، هاتەوە بیرم. جگە لە پۆلێک چۆلەکە کە بەسەر دار مازووەکانەوە دەیانخوێند و لەم چڵەوە بۆ ئەو چڵ دەفڕین، لە دەرەوە هەست بەهیچ چرپە و جووڵەیەکی تر نەدەکرا. کشوماتییەکی سەرسوورهێنەر! بیرم لە ژوورەکانی تری ئەستەنبوڵ و تووشبووانی پەتاکە کردەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر ئەوەی خۆجە پەتا بێت، ئەوا تا مردن درێژە دەخایەنێت. ئەگەر نا، هەر هیچ نەبێت تا ونبوونی ئەو دوومەڵە سوورە. ئیدی هەستم دەکرد ناتوانم لەوە زیاتر لەم ماڵەدا بمێنمەوە. پاش ئەوەی چوومەوە ژوورەوە، بەهیچ شێوەیەک بەخەیاڵمدا نەهات بۆ کوێ هەڵبێم و لە کوێ خۆم بشارمەوە. ئەوەندە نەبێت پێم وا بوو پێویستە شوێنێکی دوور لە خۆجە و لە پەتاکە بێت. چەند پارچە جلوبەرگێکی خۆمم خزاندە توورەکەیەوە. تەنیا ئەوەندەم دەزانی ئەو شوێنە دەبێت هێندە نێزیک بێت، بێ ئەوەی دەستگیر بکرێم، بتوانم بۆی هەڵبێم. هەر ئەوەندە و بەس.

٧

کەمۆکەیەک پوولم پێکەوە نابوو کە پێشتر کەموکورت بەدزیی خۆجەوە پاشەکەوتم کردبوو. لێرە و لەوێش برێکی ترم پەیدا کردبوو. پێش ئەوەی لە ماڵ دەربچم، پوولەکانم لە شوێنی شاردنەوەیان، لە گۆرەوییەکی ناو سندووقی ئەو کتێبانەی چی دی نەدەخوێندرانەوە، دەرهێنا. لەبەر ئەوەی خولیای زانینی ڕەوشی دابووی لە کەللەم، سەرێکم کرد بە ژووری خۆجەدا. چراکەی داگیرسابوو، پرخەی دەهات و نوقمی ئارەقە بوو. سەرم لە بچووکیی ئاوێنەکە سوورما، چونکە بەدرێژاییی شەوی ڕابردوو منی بە وێکچوونی ئەفسووناویمان ترساندبوو، ئەو وێکچوونەی هەرگیز نەمتوانی بەتەواوی باوەڕی پێ بهێنم. بێ ئەوەی دەست بەهیچ شتێکەوە بدەم، بەپەلەپڕووزێ لە ماڵ دەرچووم. لە کاتی ڕۆیشتنم بە کۆڵانەکاندا، بایەکی سووک هەڵی کرد. لە ناخەوە دەمویست دەستەکانم بشۆم. دەمزانی ڕوو لە کوێ دەکەم و لە خۆم ڕازی بووم. ڕۆیشتنم بە کۆڵانەکاندا لە کشوماتیی بەربەیاندا، دابەزین لە هەورازەکانەوە بەرەو دەریا، شۆرینی دەستەکانم لە کانیاوەکان و سەیرکردنی کەنداوی زێڕین، شادمانی خستە دەروونمەوە.

یەکەمجار باسی دوورگەی هەیبەلیم لە قەشەکەیەکی گەنج کە لەوێوە بۆ ئەستەنبوڵ دابەزیبوو، بیستبوو. ئەو دەمەی لە گالاتا یەکمان بینی، بەجۆشەوە باسی جوانی و دڵگیریی دوورگەکانی بۆم گێڕایەوە. بێگومان پێشتر لە خەیاڵمدا چەسپیبوو، بۆیە هەر ئەوەندەی لە گەڕەک دوور کەوتمەوە، دەمزانی ڕوو لەوێندەرێ دەکەم. لەگەڵ خاوەن بەلەم و ماسیگرەکاندا قسەم کرد، بەڵام داوای پارەیەکی خەیاڵییان دەکرد بۆ گەیاندنم بۆ دوورگەی هەیبەلی. هەستم بە بێزاری کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بزانن قاچاخم،

شوێنەکەم بۆ ئەو پیاوانە دەستنیشـان دەکەن کە خۆجە بەدوامـدا دەیاننێرێت!
دواتر هـاتمە سـەر ئەو باوەڕەی ئـەمـە چاو سـوورکـردنەوەیەک بێت لە دژی فـەلەکـان، چونکە لە ترسی پەتاکە بە چاوی سووک سـەیر دەکـران. بۆ ئەوەی سەرنجی زۆر بۆ سـەر خۆم ڕانەکێشم، خاوەن بەلەمـی دووەمم دواند و لەگەڵی ڕێک کەوتم. پیاوێکی هێندە بەهێز و بەگوڕ نەبوو. لەبری ئەوەی هەمـوو هێزی خـۆی بخـاتە سـەر سـەوڵ لێـدان، چەنەی دەدا و باسـی ئەوەی دەکـرد پەتاکـە سزای کـام گوناهـانەیە. ئەوەشی بۆ قسەکانی زیاد کرد گوایە هەڵـهاتن لێی و خۆشـاردنەوە لە دووڕگـە پووڵێک ناکات. بە قسـەکـانیـدا بۆم دەرکـەوت ئەویش بارتەقای من ترسی لێ نیشتووە. ڕێگە شەش سەعات درێژەی خایەند.

سـالآنێکی دواتر هاتمە سـەر ئـەو باوەڕەی ڕۆژانێکی شـادم لەو دووڕگـەیە بەسـەر بردووە. بە پارەیەکی کـەم لە مـاڵی ڕۆمـێکی مـاسیگری بێ کەسـوکـار دەمـامەوە و هەوڵم دەدا لەو ناوە نەبیندرێم. ئۆقرەم لەبەر بڕابوو. جـاروبار وام دەمـهـێنـایە بەرچاوی خـۆم خـۆجـە مـردووە. ناوبەنـاویش بیـرم لەو پیـاوانە دەکـردەوە کـە دەبوو بەدوای منـدا بیـاننێـرێت. فـەلـەیەکی زۆر لە دووڕگـەکـە هەبوون وەک مـن لە دەست پەتـا ڕایان کـردبـوو، بەڵام نەمـدەویست خـۆمـیـان پێشان بدەم.

بەیانیـان لەتەک یارۆی مـاسـیگردا دەچـوومـە دەریا و دەمـەو ئێـواران دەگەڕامـەوە. ماوەیەک خووم دابووە ڕاوکردنی قرژانگ و پاقوریا بە ڕم. ئەگەر هـەواش خـراپ بوایە و دەسـتی نەدایە بۆ دەرچوون بۆ دەریـا، بەدەوری دووڕگـەدا دەخولامـەوە. جاروبار دەچوومـە بـاخی خـەڵوەتخـانـەی دووڕگـە و لە ژێر دارمێوەکاندا سـەرخەوێکی شیرینم بۆی دەشکاند. ڕەزێکیش لەوێ هەبوو، سـەبەتەیەک بـە دار هـەنجیـری ناو ڕەزەکـەوە هەڵواسـرابوو. ئەو ڕۆژانەی هەوا سـاف بوایە، دەچوومـە ئـەوێ و لەوێوە تا ئەیاسـۆفـیـام لێـوە دیار بـوو. لە ژێر سـەبەتەکەدا دادەنیشـتم و بەدەم سـەیرکردنی ئەسـتـەنبوڵـەوە چەندین سەعـات خـەیـاڵم دەکردەوە. جـارێکیان لە خـەونمدا خۆجـە بە خۆی و چەند دولفـینێکەوە بە بەلەم هـاتبوو بۆ دووڕگـە. دۆستـانە لەگەڵ دۆلفینەکاندا هەڵسوکـەوتی دەکرد

و هەواڵی منی دەپرسی. کەواتە کەوتبووە گەڕان بەدوامدا. جارێکیش لەگەڵ دایکمدا بوو، لۆمەیان کردم و لە هۆی دواکەوتنمیان پرسی. دوای ئەوەی تیشکی خۆر لە ڕوومی دەدا و بەدەم ئارەقە دەردانەوە هۆشیار دەبوومەوە، دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ناو خەونەکانم، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەمەم بۆ نەدەلوا، خۆم ناچاری بیرکردنەوە دەکرد. هەندێک جار پێشبینیم دەکرد خۆجە مردووە. بیرم لە تەرمەکەی دەکردەوە لەو ماڵە چۆڵەدا کە من بەجێم هێشتبوو. بیرم لەوانەی بۆ هەڵگرتنی تەرمەکەی دەهاتن و لە بێدەنگیی بەخاکسپاردنی بێ کەسانەی دەکردەوە. پاشان فاڵگرتنەوەکانیم بیر دەکەوتەوە. ئەو شتە بەزمبەخشانەیم دەهاتەوە یاد کە بە نەفرەت و ڕقەوە لەبەرخۆیەوە دەیگوتنەوە. سوڵتان و ئاژەڵەکانیم بیر دەکەوتەوە. من نووکی ڕمم بەپشتی قرژاڵ و پاڤوریاکاندا دەکرد و لە سکیانەوە دەرم دەهێنا، ئەوانیش بە جوولاندنی هێمنانەی پەل و پۆیان، هاوڕێیەتیی خەیاڵەکانی ڕۆژی منیان دەکرد.

خەریک بووم هێدی هێدی باوەڕ بەخۆم بهێنم دەتوانم بۆ وڵاتی خۆم هەڵبێم. بۆ ئەمەش، هێندەم بەس بوو کەمێک پارە لەو ماڵانەی دووڕگە بدزم کە لە هەموو لایەکەوە دەرگاکانیان لەسەر پشت بوون، بەڵام پێویست بوو پێش هەموو شتێک خۆجە لە بیر خۆم ببەمەوە، چونکە کەوتبوومە ژێر کاریگەریی ئەفسوونی بەسەرهاتەکانم و هێزی ڕاکێشانی بیرەوەرییەکانم. بەخۆم دەگوت کەسێکی هاوشێوەی خۆم بۆ مردن بەجێ هێشتووە و خەریک بوو خۆم تاوانبار دەکرد. ئەو کاتەش، وەک ئێستا، لە دڵەوە تاسەی بینینیم دەکرد. لە خۆمم دەپرسی ئایا بەڕاستی هێندەی ئەوەی لە بیرەوەریمدا هەیە لە من دەچوو، یان خۆم لە خشتە دەبرد؟ پاشان هاتمە سەر ئەو باوەڕەی لە ماوەی یازدە ساڵی ڕابردوودا تەنانەت جارێکیش تێر و پڕ سەیری ڕووخساریم نەکردووە، بەمەرجێک، زۆر جاران ئەوەشم کردبوو. تەنانەت بەخەیاڵمدا هات خۆم بگەیەنمەوە ئەستەنبوڵ و بۆ دواجار چاوێک بە تەرمەکەیدا بگێڕم. بۆ ئەوەی ئازاد بم، بڕیارم دا باوەڕ بەخۆم بهێنم وێکچوونمان یادگارییەکی چەوت و هەڵەیەکی بێ تامە و پێویستە لە بیر بکرێت.

باش بوو خۆم لەسەر ئەو بیرکردنەوەیە ڕانەهێنا، چونکە ڕۆژێک خۆجەم لە بەردەم خۆمدا بینی! لە باخچەی پشتەوەی ماڵی کابرای ماسیگر ڕاکشابووم، بیرم دەکردەوە و ڕووی چاوە داخراوەکانم لە خۆر کردبوو. هەستم بە سێبەرەکەی کرد، لە بەردەممدا بوو، پێ دەکەنی، بەڵام نەک وەک کەسێک گەمەکەی بردبێتەوە، بگرە وەک ئەوەی خۆشەویستیی خۆیم بۆ دەربڕێت! متمانە بەخۆبوونێکی بەهێز، بەڕادەیەک کە خۆشمی دەترساند، سەرتاپای جەستەمی داگرتبوو. پێ دەچوو بەنهێنی چاوەڕێی هاتنی ئەو ساتەم کردبێت، چونکە دەستبەجێ هەستی کۆیلەی تەمبەڵ و غوڵامی تاوانبار باڵی بەسەرمدا کێشا. بەدەم پێچانەوەی بوخچەکەمەوە، لەبری نەفرەت لە خۆجە بکەم، کەچی خۆم بە سووک دەهاتە بەرچاو. هەر ئەویش لەجێی من قەرزەکانی کابرای ماسیگری دایەوە. دوو کەسی دابووە تەک خۆی و بە بەلەمی جووتسەوڵ هاتبوون، بەخێرایی گەڕاینەوە. بەرلەوەی تاریکی دابێت، گەیشتینەوە ماڵ. تاسەی بۆنی ماڵەوەم کردبوو. ئاوێنەکەش لە دیوار هێندرابووە خوارێ.

بەیانیی ڕۆژی دواتر، خۆجە منی لە بەردەم خۆی دانا و گوتی: "تاوانەکەت زۆر قورسە، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی هەڵهاتوویت، بگرە بەهۆی ئەوەی جێگازی مەگەزت لێ بووە بە برینی پەتا و منت بەتەنیا لە پێخەوی مردندا بەجێ هێشتووە. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە نییە. گێڕایەوە: سوڵتان هەفتەیەک لەمەوبەر لە ئاکامدا ناردوویەتی بەدوایدا و لێی پرسیوە ئەم پەتایە کەی دەبڕێتەوە، چەند کەسی تر ڕاپێچی مەرگ دەکات و ئایا ژیانی خۆی لە مەترسیدایە، یاخۆ نا؟ خۆجە زۆر دەپەشۆکێت و لەبەر ئەوەی پێشوەخت خۆی ئامادە نەکردووە، وەڵامی ناڕوونی داوەتەوە، داوای مۆڵەتی کردووە بۆ ئەوەی لە ئەستێرەکان بپرسێت. بەدڵی خۆشەوە گەڕاوەتەوە بۆ ماڵ. نەیتوانیوە بگاتە ئەنجامێک بۆ ئاڕاستەکردنی خەمەکانی سوڵتان. بۆیە بڕیاری دابوو من بگێڕێتەوە.

هەر زوو بە گیرسانەوەی منی لە دوورگەکە زانیبوو. پاش هەڵهاتنم تووشی لەرز و تا بووە. دوای سێ ڕۆژ کەوتبووە منەکردنم، لە ڕێی ماسیگرەکانەوە

شـوێن پێـمی هـەڵگرتبـوو. لەگـەڵ شلـکردنەوەی دەمی کـیسـەی پارەکـانیـدا، ماسیگرەکە پێی گوتبوو منی بۆ دوورگەی هەیبەلی بردووە. خۆجە زانیبووی جگە لە دوورگەکـان، ناتوانم بۆ هیچ شوێنێکی تر هەڵبێم، بۆیە لە سەرەتاوە نەکەوتبووە دوام. گوتی ئەو پێوەندییەی لەگەڵ سوڵتاندا دای ناوە، گرینگترین هەلی ژیانیـەتی و منیش هاوڕای بووم. ڕاشکاوانەش گـوتی پێـویسـتی بە زانیارییەکانی من هەیە.

بێ دواکەوتن دەستمان کرد بە کار. خۆجەش سووربوونی کەسانێکی پێوە دیار بوو کە دەیانزانی چییان دەوێت. پێشتـر ئەم سووربوونەم لێی نەدیبوو، بۆیە مایەی خۆشحاڵیم بوو. پاش ئەوەی زانیمان ڕۆژی داهاتوو جارێکی تر بانگ دەکـرێتـەوە، بڕیارمـان دا کـات بەفـیـڕۆ نەدەین. دەسـتـبـەجێ لەسـەر بنەمایەک ڕێک کەوتین: زیاد لە پێویست زانیاری نادەین، بەڵام ئەوەی دەدەین، پێویستە یەکسەر بیسەلمێنین. ئەو ڕژدبوونەی من پێم خـۆش بوو، دەستبەجێ خۆجەی هێنابووە سەر ئەو باوەڕەی "فاڵگرتنەوە جۆرێکە لە لێبووکی، بەڵام دەکرێت بە جوانی بەکار بهێندرێت بۆ کاریگەری دانان لەسەر گەمژەکان." بە خۆجەم گوت ئەم پەتایە کارەساتێکە تەنیا دەکرێت بەگرتنەبەری ڕێوشوێنی تەندروستی پێشی لێ بگیرێت. دیاربوو ئەویش بەدەم گوێگرتنەوە لە قسەکانم ڕاستی بۆچوونەکەی منی سەلماند. ئەویش وەک من، نکۆڵی نەکرد لە پێوەندیی خوا بە پەتاکەوە، بەڵام ئەم پێوەندییە ناڕاستەوخۆ بوو، بۆیە ئێمە دەمانتوانی قۆڵی لێ هەڵماڵین، شتێک لە دژی کارەساتەکە بکەین و ئەمەش هیچی لە شکۆی خـوا کـەم نەدەکـردەوە. ئەی مـەگـەر حـەزرەتی عـومـەر لە پێناوی پاراستنی سوپاکەیدا ئەبو عوبەیدەی لە سووریاوە بۆ مەدینە بانگ نەکردەوە؟ خۆجە داوای لە سـوڵتـان کرد بەمـەبەسـتی خۆپاراستن لە پەتاکـە، پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەوانی تردا بۆ نزمـترین ئاست دابەزێنێت. ئەوەشـمان بەخـەیاڵدا هات ترسی مـردن بخـەینە دڵی سـوڵتـانەوە بـۆ ئەوەی ناچاری بکەین بڕیار لەسـەر وەرگـرتنی ڕێوشـوێنەکـان بدات. بەڵام ئەمـە جێی مـەترسی بوو، چونکە سـوڵتـان ئەوەندە بەتـەنیـا نەدەمـایەوە بتـوانرێت بە پیـاهـەڵدانێکی شـاعیـرانەی

مردن بترسێندرێت. خۆ ئەگەر تەنانەت بکەوتایەتە ژێر کاریگەریی ڕەوانبێژیی خۆجەشەوە، ئەوا ئاپۆڕەیەکی لەبلەبان و زمانلوسی بەدەورەوە بوو دەیانتوانی ترسەکەی گەورە بکەنەوە و بەسەریدا زاڵ بن. دواتر، ئەو گەمژە بێچاو و ڕووانە هەموو کاتێک دەیانتوانی تۆمەتی بێ ئاینی بدەنە پاڵ خۆجە. بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو کۆسپەدا، بە پشتبەستن بە زانیارییە ئەدەبییەکانی من، چیرۆکێکمان هۆندەوە.

ئەو شتەی خۆجەی چاوترسێن کردبوو، یەکلاییکردنەوەی زانینی کاتی بەسەرچوونی پەتاکە بوو. من هەستم دەکرد پێویستە کار لەسەر ژمارەی ڕۆژانەی مردووان بکەین. کاتێک ئەمەم بە خۆجە گوت، زۆر کاری تێ نەکرد، بڕیاری دا بۆ بە دەستهێنانی ژمارەی مردووان داوای کۆمەک لە سوڵتان بکات، بەڵام پێویست بوو ڕووی ئەم داوایە بە دەمامکی چیرۆکێکی تر پەردەپۆش بکرێت. هێندە بڕوام بە بیرکاری نەبوو، بەڵام چ بکەین، دەست و قۆڵمان بەسترابوو.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی ئەو چوو بۆ کۆشک، منیش ڕووم لە شار کرد بۆ ناو جەرگەی پەتا. دیسان وەک پێشوو لێی دەترسام، بەڵام تەوژمی جووڵە و ژیان و ویستی بە دەستخستنی جیهان، ئەگەر بۆ تاوێکیش بێت، دابووی لە کەللەم. ڕۆژێکی فێنکی هاوین بوو. بەناو مردوواندا دەسووڕامەوە. بیرم کەوتەوە ساڵانێکی درێژە هێندەی ئێستا تامەزرۆی ژیان نەبووم. خۆم دەکرد بە حەوشەی مزگەوتەکاندا، ژمارەی دارەبازەکانم لەسەر کاغەزێک تۆمار دەکرد. پاشان، بە کۆڵاندا دەگەڕام و دەکۆشام ڕایەڵەی پێوەندی لە نێوان بیندراوەکانم و ژمارەی مردوواندا دابنێم: هێندە ئاسان نەبوو بتوانرێت واتەیەک بە گشت ماڵ، مرۆڤ، ئاپۆڕەی خەڵک، دڵخۆشی و خەم و شادییەکان بدرێت. سەرباری ئەوەش، نیگام بە ئاشکرا دەکەوتە سەر وردەکارییەکان، ژیانی خەڵکانی تر، بەختەوەریی، بێچارەیی و بێ خەمیی ئەو مرۆڤانەی وەک خزم و کەسوکار لە ماڵەکانی خۆیاندا دەژیان.

لە ناو ئاپۆڕەی مردووان و زیندوواندا سڕ بووبووم. دانی نیوەڕۆ ڕووم لە

گالاتا کرد لەوبەری ئاو، بەناو قاوەخانەی کرێکارانی دەوروبەری کارخانەی دروستکردنی کەشتیدا سووڕامەوە. بەدزییەوە سەبیلێکم کێشا. هەر بەمەبەستی تاقیکردنەوە لە خواردنگەیەک شۆربایەکم خوارد. چوومە بازاڕ و دووکانەکان. دەمویست هەموو شتەکان لە مێشکمدا تۆمار بکەم تا بتوانم بە ئەنجامێک بگەم. لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا، شەکەت و ماندوو گەڕامەوە بۆ ماڵ. خۆجە لە کۆشک گەڕابووەوە. گوێم بۆی ڕاگرت.

کارەکان، وەک نەخشەمان بۆ کێشابوون، چووبوونە پێش. ئەو چیرۆکەی خۆمان هۆندبوومانەوە، کاری لە ناخی سوڵتان کردبوو. باوەڕی هێنابوو پەتاکە وەک ئیبلیس شێوەی مرۆڤ وەردەگرێت و لە خشتەی دەبات. دەستووری دابوو مۆڵەت بەهەموو نامۆیەک نەدرێت سەر بە کۆشکدا بکات، دەروازەکانیش خرابوونە ژێر چاودێریی توندەوە. کاتێک پرسیاری کات و چۆنیەتی بەسەرچوونی پەتاکەی کردبوو، خۆجە زمانێکی ئەوتۆی بەکار هێنابوو، بەجۆرێک سوڵتان بەترسەوە گوتبووی توانیویەتی پێشبینی بکات ئیزرائیل بەسەرخۆشی بەشاردا دەسووڕێتەوە، هەرکەسێک دەبینێت، قۆڵی دەگرێت و بەرەو خۆی بەکێشی دەکات. خۆجە دەستبەجێ و بە پەشۆکانەوە هەڵەکەی ڕاست کردبووەوە: "ئەوە ئیزرائیل نییە، بگرە ئیبلیسە مرۆڤ دەخاتە سەر ڕێی مردن. سەرخۆشیش نییە، زۆر فێڵبازە. وەک پێشتر نەخشەمان بۆ کێشابوو، خۆجە پێویستبوونی شەڕی لە دژی ئیبلیس ڕوون کردبووەوە. بە سوڵتانی گوتبوو بۆ ئەوەی تێ بگەین پەتاکە کەی لە کۆڵی شار دەبێتەوە، پێویستە بزانین بەکوێدا دەسووڕێتەوە. هەرچەندە هەندێک لە دەست و پێوەندەکانی سوڵتان بەرەنگاربوونەوەی پەتاکەیان بەواتەی دەستخستنە کاری خوا دانابوو، بەڵام ئەو گوێی پێیان نەدابوو. پاشان لە بارەی ئاژەڵەکانییەوە پرسیاری کردبوو. پرسیبووی داخۆ ئیبلیس دەتوانێت باز، هەڵۆ، شێر و مەیموونەکانی تووشی پەتا بکات؟ خۆجەش دەمودەست گوتبووی: "ئیبلیس لە بەرگی مرۆڤدا بۆ مرۆڤ و لە بەرگی مشکیشدا بۆ ئاژەڵان دێت. سوڵتان دەستووری دابوو لە شارێکی دوورەوە کە پەتا

نەیگرتبێتەوە، پێنج سەت پشیلە بهێنن و خۆجەش چەند پیاوی دەوێت، بیدرێتێ.

ئەو دوازدە پیاوەی خرابوونە ژێر فەرمانی ئێمەوە، دەستبەجێ بەهەر چوار گۆشەی ئەستەنبوڵدا دابەشمان کردن. کۆڵان بەکۆڵان و گەڕەک بەگەڕەک دەسووڕانەوە و ئەوەی دەیانبینی لەگەڵ ژمارەی مردووواندا بە ئێمەیان ڕادەگەیاند. من نەخشەیەکی گەورەی ئەستەنبوڵم بە دەستکاریکردنەوە لە کتێبێکی تر وەرگرت و لەسەر مێز ڕامانخست. شەوانە، بەترس و شادمانییەوە شوێنی بڵاوبوونەوەی پەتاکەمان لەسەر نەخشە دیاری دەکرد و ئەو قسانەمان دادەڕشت کە پێویست بۆ سوڵتانیان بکەین.

دەسپێک زۆر گەشبین نەبووین. پەتاکە وەک ئیبلیسێکی تەڵەکەباز نا، بگرە چەشنی سەرسەرییەکی بێ ئامانج بەشاردا دەسووڕایەوە. ڕۆژێک لە ئاکسەرای گیانی چل کەسی دەکێشا، پاشان ئەوێی بەجێ دەهێشت و ڕۆژێکی تر دەگەیشتە فاتیح. بۆمان ڕوون دەبووەوە لە کەناری ئەوبەری ئاو بە تۆپخانە و جیهانگیردا دەسووڕێتەوە. ڕۆژی دواتر سەیرمان دەکرد زۆر بەکەمی لەو ناوەی داوە و ڕووی لە زەیرەک کردووە، گەیشتۆتە گەڕەکی ئێمە لەسەر کەنداوی زێڕین و ژیانی لە بیست کەس سەندووەتەوە. نەماندەتوانی هیچ ئەنجامێک لە ژمارەی مردووانەوە بە دەست بخەین. ڕۆژێک پێنج سەت کەس دەمردن، ڕۆژی دواتر سەت. کاتێکی زۆر تێ پەڕی تا تێ گەیشتین پێویستە بزانین پەتاکە سەرەتا کوێ دەگرێتەوە و ڕوو لە کام لا دەکات، نەک لە کوێ قوربانییەکانی دەکوژێت. سوڵتان دیسان دەیناردەوە بەدوای خۆجەدا. دوای بیرکردنەوە و ڕامان، گوتمان دەبێت بە سوڵتان بگوترێت پەتاکە لە فرۆشگا جەنجاڵەکان، لەو بازاڕانەی خەڵکی قۆڵی یەکتری تێدا دەبڕن و لەو چایخانانەی لەپەنای یەکترەوە تیایاندا دادەنیشن، تەشەنە دەکات. خۆجە ڕۆیشت و ئێوارە گەڕایەوە.

شتەکانی بۆ سوڵتان گێڕابووەوە. ئەویش گوتبووی "چ بکەین؟" خۆجە گوتبووی با بەخورتی هاتوچۆی بازاڕەکان و ناو شار سنووردار بکرێت.

بێگومـان لـەوچە و زمـاندرێژەکـانی دەوروبەری سـوڵتـان هەمـوویـان لە دژی وەسـتابوونـەوە: "شـار چۆن بەخێـو دەکرێت؟ ئەگەر بازرگانی ڕابگیـرێت، ژیان ڕادەوەسـتێت، ئەگـەر بەر گـوێی خەڵکی بکەوێت پەتاکـە لە شێـوەی مرۆڤـدا دەسـوورێتـەوە، زراویـان دەتۆقـێت، وا دەزانن قـیـامـەت ڕابـووە و لغـاو تـوند دەکـەنەوە؛ پاشـانیش، هیـچ کـەسـێک نـاخـوازێت بخـرێندرێتـە گـەڕەکـێکەوە ئیبلیسی پەتای تێدا بگەڕێت. یاخیبوون دەقەومێت. خۆجـە گوتی: "مـافی خۆیـانە وا بیر بکەنەوە." لەو سـاتەدا گەمژەیەک پرسیبووی جا لە کوێ پیاوی پێـویسـت بۆ چاودێریکردنی ئـەو هەمـوو خـەڵکە پەیدا دەبێت؟ سـوڵتـان بەم قسـەیە تووڕە بووبوو، هەمووانی بەوە ترساندبوو ئەگەر هەرکەسێک گومان لە هێـزی سـوڵتـان بـکات، سـزا دەدرێت. بەو تووڕەبوونەشـەوە دەسـتـووری دابوو پێشنیـازەکانی خۆجە جێبەجێ بکرێن، بەڵام لە بیریشـی نەچووبوو ڕاوێژ بە دەوروبەرەکەی بکـات. گەورەی ئەسـتێـرەناسـان سـدقی ئەفـەندی لەبەر ئەوەی ددانی لە خۆجە جیڕ دەکردەوە، دابووی بە بار گوێی سـوڵتاندا خۆجە هێشـتا ڕای نەگـەیاندووە پەتاکـە کـەی ئەسـتـەنبـوڵ جێ دەهێـڵێت. خـۆجـە لە ترسـی ئەوەی نەبادا سـوڵتان هەق بدات بە سـدقی ئەفەندی، گوتبووی جـاری داهاتوو خشتەی کات لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

نەخشـەی سـەر مێـزەکـەمـان پڕ کردبوو لە نیشـانە و ژمـارە، بەڵام چەندی دەمـانکرد و دەکـۆشـاین نەدەگـەیشـتـینە ئەو ئەنجـامـەی داخـۆ پەتاکـە بە چ لۆجیکێک بەشـاردا دەسووڕێتەوە. لە هەمان کاتدا سوڵتان قەدەخەی سەپاند و لە سێ ڕۆژ زیـاتریش درێژەی کـێشـا. یەنیـچـەرەکـان دەروازەی بازاڕەکـان و شەقامـە سەرەکییـەکانی شـار و لەنگەرگەکانی بەلەمیان خسـتە ژێر چاودێری، دەسـتیـان بە لێپرسـینەوە کرد و دەیانپرسی: "کێیت! بۆ کوێ دەچیت؟ بۆچی دەڕۆیت؟" ڕێبـوارە ترسـاو و سـەرسـوڕمـاوەکـان و ئەوانـەی بێ ئامـانج دەسووڕانەوە، دەنێردرانەوە مـاڵ تا پەتا فریویان نەدات. ئەو کاتەی زانیـمـان ڕەوتی ژیان لە قـەپاڵی چـارشی و ئونکاپانـی سـست بووە، ئێمـە ژمـارەی ئەو مردووانەی لە مـانگێکدا کۆمان کردبووەوە، خسـتمانە سەر کـاغەز، بە دیواردا

هەڵمانواسی و بیرمان لێ دەکردەوە. بە بۆچوونی خۆجە، چاوەڕێکردنمان بۆ ئەوەی بزانین پەتاکە بە چ لۆجیکێک دەسووڕێتەوە، کات بەفیڕۆدان بوو. ئەو پێی وا بوو پێویستە بۆ پاراستنی کەللەی سەرمان چەند شتێک بهۆنینەوە و دڵی سوڵتانی پێ خۆش بکەین.

شێوازی مۆڵەتی نووسراویش لەو سەروبەندەدا هاتە ئاراوە. سەرگەورەی یەنیچەرەکان بەمەبەستی ڕانەگرتنی بازرگانی و دابینکردنی خۆراکی پێویست بۆ شار، بەپێویستی زانیبوو مۆڵەتی نووسراو دابەش بکرێت. ئەو کاتە بیستمان کابرا لەو ڕێیەوە دراوێکی زۆری دەستکەوتووە و وردە بازرگانەکانیش بۆ خۆدزینەوە لە بەخشینی باج و سەرانە خەریکی خۆسازدانن بۆ یاخیبوون. هەمان کات من بۆ یەکەمجار هەستم بەهەبوونی جۆرێک لە لۆجیک لە ژمارەی مردوواندا کرد. لە کاتێکدا خۆجە باسی دەست تێکەڵکردنی باشوەزیر کۆپرولوی لەگەڵ بازرگاناندا دەگێڕایەوە، من بۆچوونی خۆم پێی گوت و هەوڵم دا بیهێنمە سەر ئەو باوەڕەی پەتاکە هێدی هێدی خۆی لە گەڕەکەکانی قەراغ شار و کۆڵانە هەژارنشینەکان دەکێشێتەوە.

قسەکانم زۆر نەچوونە ئەقڵییەوە، بەڵام کاری ئامادەکردنی خشتەی کاتی بە من سپارد. خۆجە گوتی چیرۆکێکی نووسیوە جگە لە دڵخۆشکردنی سوڵتان، دوای خوێندنەوەی، کەس ناتوانێت هیچ ئەنجامێکی لێوە دەربهێنێت. لە کاتێکی تردا پرسی: "ئایا مرۆڤ دەتوانێت بەسەرهاتێک بهۆنێتەوە جگە لە چێژی خوێندنەوە یان گوێگرتن، هیچ ئەنجام و واتەیەکی تری نەبێت؟" منیش لە وەڵامدا گوتم: "شتێکی وەک موزیک؟" خۆجە سەری سووڕما. پاشان بیرمان کردەوە باشترین چیرۆک ئەوەیە سەرەتاکەی وەک ئەفسانە سادە و منداڵانە، ناوەڕاستەکەی وەک خەونی ترسناک تۆقێنەر و کۆتاییەکەشی وەک چیرۆکی ئەڤین و دڵداری تاڵ و پڕ لە ئازار بێت. شەوی پێش چوونی خۆجە بۆ کۆشکی سوڵتان، شادمانانە چەنەمان لێ دەدا و بەوپەڕی تواناوە کارمان دەکرد. لە ژوورەکەی ئەولاوە خۆشنووسی چەپەوانەی دۆستمان دانیشتبوو، خەریکی نووسینەوەی بەشەکانی سەرەتای چیرۆکێک بوو کە هێشتا خۆجە بە

ئەنجامی نەگەیاندبوو. من، دەمەوبەیان لە میانەی ژمارە سنووردارەکانی بەردەستم و ئەو هاوکێشانەوە کە چەند ڕۆژێک بوو سەرقاڵی دانانیان بووم، گەیشتمە ئەو ئەنجامەی پەتاکە دوایین قوربانییەکانی خۆی لە بازاڕەکان هەڵدەگرێت و دوای بیست ڕۆژی تر شار بەجێ دەهێڵێت. خۆجە نەیپرسی بۆ گەیشتن بەم ئەنجامە پشتم بەچ بەستووە، ئەوەندە نەبێت گوتی ڕۆژنەی هیوا و ڕێگەی ڕزگاربوونمان دوورە. داوای کرد جارێکی تر خشتەی کات بەگوێرەی دوو هەفتە دابڕێژمەوە و ماوەکەش بە ژمارەی تر بشارمەوە. هێندە گەشبین نەبووم، بەڵام داخوازەکەیم بەجێ هێنا. خۆجە هەر لەوێدا چەند ڕستەیەکی خشتەی کاتی ڕاستکردەوە و دایە دەستی خۆشنووس، ئەویش کاری خۆی تەواو کردبوو. داوای لە منیش کرد وێنەی هەندێک لە بەیتەکان بکێشم. بەپەلە بەرگێکی شین و بەنەخش و نیگاری بۆ لێکۆڵینەوەکە دابوو بە دروستکردندا. کاتێک دانی نیوەڕۆ هەڵی گرت و ڕۆیشت، بێ کەیف و بێزار دەهاتە بەرچاو، ترس و خەم لە ڕووی نیشتبوو. گوتی ئەوەندەی متمانەی بە ماسیگرە دەنووک درێژەکان، گا باڵدارەکان، مێرووله سوورەکان و مەیموونە قسەکەرەکانی ناو لێکۆڵینەوەکە هەیە، هێندە باوەڕی بە خشتەی کاتەکە نییە.

ئێوارە دوای گەڕانەوە زۆر خرۆشابوو. خرۆشانەکەی، بەدرێژاییی ئەو سێ هەفتەیەی توانی لە میانەیاندا ڕاستیی فاڵەکانی بە سوڵتان بداتە قبوڵکردن، بەردەوام بوو. دەسپێک دەیگوت: "هەموو شتێک شیاوە." ڕۆژی یەکەم هیچ ئومێدێکی نەبوو، چونکە کاتێک سوڵتان چیرۆکەکەی بە غولامێکی لاو و دەنگخۆش دابوو بە خوێندنەوە، بزە کەوتبووە سەر لێوی چەند کەسێکی ناو ئاپۆڕەی دەوروبەری. بەڵام دیار بوو بەزۆر لە خۆکردنەوە ئەو ڕەفتارەیان نواندبوو تا خۆجە ڕیسوا بکەن و لەبەرچاوی سوڵتانی بخەن. بەڵام سوڵتان بێدەنگ و سەرزەنشتی کردبوون. لە خۆجەشی پرسیبوو پشتی بە چ بەڵگەیەک بەستووە بۆ بەکۆتاهاتنی پەتاکە لە ماوەی دوو هەفتەدا. خۆجەش گوتبووی سەرجەمی شتەکان لەو چیرۆکەدایە و هەموو کەسێک لێی تێ ناگات. پاشان بۆ ئەوەی خۆی لەکن سوڵتان شیرین بکات، خۆشەویستیی خۆی بۆ ئەو

پشیلە ڕەنگاوڕەنگانە پێشان دابوو کە بە کەشتی لە ترابزۆنەوە هێندرابوون و نەک تەنیا حەوشەکانی ناوەوە، بگرە بە سەرجەم کون و کەلەبەری ژوورەکانی کۆشکدا بڵاو کرابوونەوە.

ڕۆژی دووەم، پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵ گوتی کۆشک بەسەر دوو بەرەدا دابەش بووە: دەستەیەک، گەورەی ئەستێرەناسان سدقی ئەفەندیشیان لەگەڵدایە، داوای هەڵگرتنی هەموو ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکانی ناو شاریان کردووە. ئەوانی تریش لەگەڵ خۆجەدا گوتبوویان: "با شار هەناسە وەرنەگرێت، بۆ ئەوەی ئەو ئیبلیسی پەتایەی بە شاردا دەسووڕێتەوە، نەتوانێت هەناسە بدات. من ڕۆژ بەڕۆژ سەیری دابەزینی ژمارەی مردووانم دەکرد و ئومێدم لەکن پەیدا دەبوو، بەڵام خۆجە هێشتا لە جۆشی خۆی نەکەوتبوو. دەگوترا دەستەی یەکەم لەگەڵ کۆپرولودا ڕێک کەوتوون و دەستیان کردووە بە خۆسازدان بۆ ڕاپەڕین. ئامانجیشیان ڕێگرتن لە پەتاکە نەبوو، بگرە لەکۆڵکردنەوەی دوژمنانیان بوو.

لە کۆتایی هەفتەی یەکەمدا ژمارەی مردووان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمی کرد، بەڵام هەمان کات لێکدانەوەکانی من دەریانخستبوو پەتاکە دوای هەفتەیەکی تر نابڕێتەوە. داوام لە خۆجە کرد بەپێی ئەو گۆڕانکاریانە ڕەفتار بکات کە من لە خشتەی کاتدا دەیانکەم، بەڵام ئەو ئیدی ئومێدی پەیدا کردبوو. بەجۆشەوە باسی ئەوەی گێڕایەوە چۆن قسە و قسەڵۆک لە بارەی باشوەزیرەوە بەکۆتا نایەت، بۆیە دژبەران وایان بڵاو کردووەتەوە گوایە کۆپرولو لەگەڵ ئەواندایە. سوڵتانیش بەتەواوی لە بەرامبەر تەپکە و داو دەستەوستان بوو، بۆیە لەکن پشیلەکان بەدوای ئاسوودەیی دەروونیدا دەگەڕا.

دوای تێپەڕینی دوو هەفتە، شار، لە پەتاکە زیاتر نوقمی ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان بوو. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کەمتر مرۆڤ دەمردن، بەڵام تەنیا ئەوانەی وەک ئێمە لە کارەکە ئاگادار بوون، بەمەیان دەزانی، واتەوات سەبارەت بە سەرهەڵدانی برسیەتی پەیدا بوو. ئەستەنبوڵ لە شارێکی

چۆڵکراوی ترسناک دەچوو. من لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی لە گەڕەکی خۆمان بچمە دەرەوە، خۆجە بۆمی دەگێڕایەوە: مرۆڤ هەست بە بێچارەیی خەڵکانی پشت پەنجەرە و دەرگای داخراوی حەوشەکان و زۆرانی ئەوان لەگەڵ پەتا و چاوەڕوانیان بۆ شتێکی تری دوور لە پەتا و مردن دەکات. لە کۆشکیشدا هەست بەم چاوەڕوانییە دەکرا، هەر کاتێک فنجانێک بکەوتبایە خوارەوە، یان کەسێک بە دەنگێکی بەرز بکۆکیبایە، ئاپۆڕەی لەوچە و زماندرێژان زراویان دەتۆقی، بە فسکەفسک لە نێوان خۆیاندا دەدوان و دەیانگوت با بزانین سوڵتان ئەمڕۆ چ دەستوورێک دەدات. بەڵام ئەوانیش وەک کەسانی بێچارە دەیانگوت با شتێک بقەومێت، سا هەر شتێک بێت و ئیدی دەپەشۆکان. خۆجەش دەکەوتە ژێر کاریگەریی شڵەژانی ئەوانەوە. هەوڵی دابوو لە سوڵتان بگەیەنێت پێشبینییەکەی ڕاست دەرچووە و پەتاکە لەبەرەوە پاشەکشە دەکات، بەڵام نەیتوانیبوو زۆر کاری تێ بکات. دواجار ناچار بووە جارێکی تر باسی ئاژەڵەکانی بۆ بکات.

دوای دوو ڕۆژ، لە ئاکامی ئامارێکی ئەنجامدراو لە مزگەتەکان، بۆی دەرکەوت پەتاکە بەڕاستی پاشەکشەی کردووە، بەڵام ئەو هەواڵە تاکە سەرچاوەی شادمانیی خۆجە نەبوو لەو ڕۆژەی هەینییەدا: دەستەیەکی بچووکی بازرگانانی ئومێد لێ بڕاو، ڕێگەکانیان گرتووە و لەگەڵ یەنیچەرەکاندا کەوتوونەتە شەڕەوە. دەستەیەکی تر لە یەنیچەرەکانی بێزار لە ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان و یەک دوو پێشنوێژی دەبەنگی مزگەوتەکانی کۆڵان، کۆمەڵێک سەرسەریی سەوداسەری دزی و تاڵان و بڕێک بێکار و نەداریان بەلای خۆیاندا ڕاکێشابوو، بردبوویانە دەماغیانەوە پەتا کاری خوایە و نابێت دەستی تێ وەربدرێت، بەڵام ئاژاوەکە پێش ئەوەی پەرە بسێنێت، لەجێدا دەستی بەسەردا گیرابوو. پاش وەرگرتنی فەتوای شێخول ئیسلامیش، بیست کەس بەداردا کرابوون. لەوانەیشە بۆ ئەوە بووبێت ڕووداوەکان لە خۆیان گەورەتر پیشان بدرێن. خۆجە زۆر لە خۆی ڕازی بوو.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر خۆجە سەرکەوتنی خۆی ڕاگەیاند. ئیدی کەس لە

کۆشک نەیدەوێرا خۆی لە قەرەی باسی هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان بدات. سەرگەورەی یەنیچەرە بۆ کۆشک بانگ کراوە، ئەویش قامکی خستووەتە سەر کەسانی پشت و پەنای یاخیبووان لە ناو کۆشکدا. سوڵتان بەمە زۆر تووڕە بووە، ئەو دەستەیەی بە دوژمنایەتیکردنی خۆیان چەندین ڕۆژ تاڵاویان بە قورگی خۆجەدا کردبوو، وەک بەچکە سوێسکە بڵاوەیان کردبوو. کۆپرولویش، ئەگەرچی ناوبەناو دەگوترا لەگەڵ یاخیبوواندایە، بڕیار بوو بەتوندی بەرەنگاریان ببێتەوە. خۆجە بە دڵخۆشییەوە گوتی خۆیشی لەم لایەنەوە کاریگەریی بەسەر سوڵتانەوە هەبووە. ئەوانەی بەرپەرچی یاخیبووانیان دەدایەوە، بۆ قایلکردنی سوڵتان، باسی پاشەکشەکردنی پەتاکەیان بۆی دەکرد. ئەم قسەیەش ڕاست بوو. سوڵتان بە چەند وشەیەک کە پێشتر هەرگیز بە زاریدا نەهاتبوون، پەسنی خۆجەی دابوو. بەمەبەستی ئەوەی برێک مەیموونی لە ئەفریکاوە هێندراوی پێشان بدات، خۆجەی بردبووە دیار قەفەسەکان. بەدەم سەیرکردنی مەیموونەکانەوە کە بە قرێژی و بێ ئابڕوویی خۆیان هێڵنجیان بە خۆجە دابوو، سوڵتان پرسیبووی داخۆ دەکرێت وەک تووتی فێری قسە بکرێن، یاخۆ نا؟ پاشان ڕووی کردووبووە دەوروبەرەکەی و ئارەزووی دەربڕیبوو لەمەودوا خۆجە زیاتر لەپەنای خۆیدا ببینێت و گوتبووی ئەو خشتەی کاتەی ئەو ئامادەی کردووە، ڕاست دەرچووە.

دوای مانگێک، لە ڕۆژی هەینیدا خۆجە بوو بە گەورەی ئەستێرەناسان. بگرە لەوەش زیاتر: هەر کاتێک سوڵتان بەنیازی بەشداربوون لە نوێژی هەینیدا بۆ مزگەوتی ئەیاسۆفیا دەچوو، خۆجە چەند هەنگاوێک لە دوای ئەوەوە ڕێی دەکرد. نوێژی ئەو ڕۆژە، بەمەبەستی سوپاس و دەربڕینی پێزانین لە پای بڕانەوەی پەتاکە بەبەشداریی هەموو خەڵکی شار دەخوێندرا. ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکان هەڵگیرابوون. منیش لە ناو ئەو ئاپۆڕە پڕ لە ژاوەژاوەدا بووم کە سوپاسی خوا و سوڵتانیان دەکرد. ئەو ساتەی سوڵتان بەسواری ئەسپەکەیەوە بەلاماندا تێ پەڕی، هەموو ئەوانەی دەوروبەرم بەدەم

قیڕە و هاوارەوە لە هۆشی خۆیان چوون و پاڵنان بۆ پێش و پاشەوە دەستی پێ کرد. ئاپۆڕەکە شەپۆلی دەدا، یەنیچەرەکان پاڵیان پێمانەوە نا بۆ دواوە. کەوتمە ناو کۆمەڵێک خەڵکەوە کە پێش من خۆیان بە دارێکەوە گرتبووەوە. پاش ئەوەی ئاپۆڕەکەم دایە بەر ئەنیشک و خۆم هاویشتەوە پێشەوە، نیگام لەگەڵ نیگای خۆجەدا یەکانگیر بوو. چوار پێنج شەقاو لەولای منەوە بە دڵخۆشی و لە خۆباییبوونەوە ڕێی دەکرد. وەک ئەوەی نەمناسێت، نیگای لەسەرم هەڵگرت. لەو هەرا ترسناکەدا لەپڕ کەوتمە بەر شەپۆلی جۆشێکی بودەلانە و باوەڕم کرد خۆجە لەو ساتەدا منی نەدیوە، بۆیە بەتەواوی هێزەوە قیڕاندم و بانگم کرد، دەمویست لە ئامادەبوونم لەم شوێنە ئاگادار بێت. وام دەزانی ئەگەر بمبینێت، لە ناو ئەم ئاپۆڕەیە ڕزگارم دەکات و منیش دەتوانم لە کەژاوەی کامەرانی خاوەن هێز و سەرکەوتوواندا بەشداری بکەم! بەلام ئەمەم بەمەبەستی وەرگرتنی بەشی خۆم لە سەرکەوتن، یان بۆ وەرگرتنی نرخی کارەکانم نەبوو، بگرە هەستێکی تەواو جیاواز لە هەناومدا بوو. دەبوایە من لەوێ بوومایە، چونکە من خۆجە خۆی بووم! کتومت وەک ئەوەی لە خەونە ترسناکەکانمدا دەمبینی، لە خۆم جیا بووبوومەوە و خۆم لە دەرەوەی خۆم دەمبینی. لەو سۆنگەیەوە کە دەمتوانی خۆم لە دەرەوە ببینم، کەواتە من کەسێکی تر بووم. زۆر مەبەستم نەبوو بزانم ئەو کەسە کێیە وا من چوومەتە پێستییەوە، دەمویست خۆم بەو کەسە بگەیەنم کە بە بەردەممدا تێ پەڕی، نەیناسیمەوە و بەترسەوە بۆمی ڕوانی. بەلام سەربازێک وەک ئاژەڵ بەوپەڕی هێزی خۆیەوە پاڵێکی پێمەوە نا و گەڕاندمیەوە دواوە بۆ ناو ئاپۆڕەکە.

## ٨

خۆجە، لە هەفتەکانی پاش برانەوەی پەتاکەدا هەر بەوەندەوە نەوەستا بکرێت بە گەورەی ئەستێرەناسان، بگرە پێوەندییەکی توندوتۆڵی زیاتر لەوەی ئێمە چەند ساڵێک بە ئومێدەوە چاوەڕوانی بووین، لەگەڵ سوڵتان بنیات نابوو. دوای سەرهەڵدانی سنووردار و بەئاکام نەگەیشتوو، باشوەزیر لە دایکی سوڵتانی گەیاندبوو کاتی ئەوە هاتووە کوڕەکەی لە دەمامکدارانی دەوروبەری ڕزگار بکرێت. بازرگانان و یەنیچەرەکانیش، ئاپۆڕەی لەوچە و چەنەبازانی دەوری سوڵتانیان بە لێپرسراوی کارەساتەکان دەزانی و دەیانگوت ئەوانە بە قسەی قۆڕ و پڕوپووچ سوڵتانیان بەڕێی خراپدا بردووە. بەو جۆرە، دەستە و تاقمی سدقی ئەفەندیی گەورەی ئەستێرەناسانی پێشوو کە دەگوترا دەستیان لە پیلانەکەدا هەبووە، بە دوورخستنەوە و گواستنەوەیان بۆ کاری تر سزا دران، لە کۆشک دەرکران و کارەکانیان کەوتە ئەستۆی خۆجە.

ئیدی خۆجە هەر ڕۆژەی دەچووە یەکێک لە کۆشکەکانی شوێنی وچاندانی سوڵتان، ئەویش کاتێکی بۆ دەستنیشان کردبوو لەتەکیدا دەدوا. دوای گەڕانەوەی بۆ ماڵ، بەجۆش و لە خۆباییبوونی ئەنجامی سەرکەوتنەوە بۆ منی دەگێڕایەوە: هەموو بەیانیانێک، خەونی شەوی ڕابردووی بۆ سوڵتان لێک دەدایەوە. ئەم ئەرکەی لە هەموو کارە پێ ڕاسپێردراوەکانی دی پێ خۆشتر بوو. بەیانیانێک، پاش ئەوەی سوڵتان بەخەمگینی ددانی پێدا دەنێت شەوی ڕابردوو خەونی نەدیوە، خۆجە پێشنیاز دەکات خەونی کەسێکی تر لێک بداتەوە. سوڵتانیش بەپەرۆشەوە پێشوازی لەم بیرۆکەیە دەکات. پاسەوانەکان دەمودەست دەکەونە گەڕان بەدوای کەسێکدا خەونێکی باشی دیبێت، کەسێک دەدۆزنەوە و دەیهێننە بەردەم سوڵتان. بەو جۆرە لێکدانەوەی خەون لە

بەیانیاندا، بوو بە خوویەک نەدەکرا دەستی لێ هەڵبگیرێت. کاتەکانی تریش لە حەوشـە و لە ژێر سێبـەری دار چنار و دار ئەرخـەوانی نـاو باخـچـەکـاندا پیاسـەیان دەکرد. ناوەناوەش بە بەلەم دەچوونە تەنگەی بوسفـۆر و لە بارەی ئاژەڵە خۆشـەویستەکانی سـوڵتـان و ئاژەڵە خـەیاڵکردەکانی ئێمەوە قسـەیان دەکـرد. بەڵام خـۆجـە جـاروبار چەند بابەتێکی تریشی دەدا بـە بەر گـوێی سـوڵتـاندا و دواتر بەجـۆشـەوە بۆ منیـشـی دەگـێـڕایەوە: هۆی ڕێژگـە و ئاوەڕۆکـانی بـوسـفـۆر چین؟ چ شـتـێک لە ژیانی ڕێکوپێکی مـێـرووڵەدا هەیە شـایەنی لێوە فـێربوون و تێگەیشتن بێت؟ موگناتیس، دوای خـوا، هێزی خـۆی لە چ شـتێکی تر وەردەگرێت؟ گرینگی سـووڕانەوەی ئەستێرەکان بەمـجـۆرە، یان بەو شـێـوەیە لە چیدایە؟ ئایا دەکرێت لە ژیانـی نـامـوسـڵـمـاندا شـتـێکی جیـاوازتر لە گاوربوونیـان بدۆزرێتەوە؟ ئایـا دەتوانین چەکێک دروست بکەین ئەوانی پـێ ڕابماڵین و قـاویان بدەین؟ خـۆجـە دەیگوت سـوڵتـان بـەسـەرنجـەوە گـوێ بـۆ ئەم بابەتـانە ڕادەگـرێت. پاشـان بەجـۆشـەوە دەچووە بەردەم مـێـز، بەمـەبەسـتی داڕشـتنی نەخـشـەی ئەو چەکـە، لەسـەر کـاغـەزی ئەسـتـوور و گرانبـەها وێنەی تۆپی لوولەدرێژ، میکانیـزمی تەقـاندنی خۆبەخۆ و شـێوەی چەکی نامۆی دەکێشـا و وەک ئاژەڵ و ئیبلیس دەهاتنە پێش چاو. منیشـی بۆ بەردەم مێز بانگ دەکرد و داوای لێم دەکرد ببم بە گەواهـیدەری تەوژمی ئەو خەیاڵانەی کە دەیگوت کاتی بەدیهاتنیان زۆر نێزیک بووەتەوە.

منیش لە خـۆمـەوە دەمـویست هـاوبەشـی خـەیاڵەکـانـی خـۆجـە بم. لەوانەیشـە لەو سـۆنگەیەوە بوو‌بێت هێـشـتـا هۆشم لای ڕۆژانی پەتاکە بوو، ئەو پەتایەی ڕۆژانی تـرسنـاکی بـرایەتیی بۆمـــان ڕەخـــســـاندبوو. ئەگـــەرچی هـەمـــووان بەبیـانـووی بەسـەرچوونـی پەتا پێکەوە دەچوونە مـزگـەوتی ئەیاسـۆفـیـا سوپاسـبێژێری و نـوێژیان دەکرد، بەڵام نەخۆشی هێشتا بەتەواوی دەستی لە یەخـەی شـار بەرنـەدابوو. بەیانیـان، دوای ئەوەی خـۆجـە بـە هەڵەداوان خـۆی دەگـەیانـدە کـۆشکی سـوڵتـان، من بەپەرۆشـەوە بەشـاردا دەسـووڕامـەوە، لە مزگـەوتی منارە کـورتی گـەڕەکـەکان و لەو هۆڵـی نوێژی دیوار قـەوزەگـرتووی

مزگەوتەکانەوە تەرم دەهێندرایە دەرێ و من ژمارەی مردووانم تۆمار دەکرد. بە ویستێک کە زۆر لە هۆکارەکەی نەدەگەیشتم، نەمدەویست نەخۆشییەکە بڕوات و شار و ئێمە بەجێ بهێڵێت.

ئەو دەمەی خۆجە لەمەڕ دانانی کاریگەری لەسەر سوڵتان و سەرکەوتنی خۆی دەدوا، من بۆم باس کرد نەخۆشییەکە هێشتا شاری بەجێ نەهێشتووە و بەهۆی هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکانەوە خەریکە دیسانەوە تاو دەسێنێت. ئەو بەدەم هەڵچوونەوە بێدەنگی دەکردم و دەیگوت گوایە ئیرەیی بە سەرکەوتنی ئەو دەبەم. مافی خۆی بوو، چونکە وەرگرتنی پلەی گەورەی ئەستێرەناسان و بوونی بە کەسێک کە سوڵتان هەموو بەیانیانێک خەونەکانی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە و گەیاندنی دەنگی بە سوڵتان دوور لە چاوی ئاپۆڕەی کەللەپووتی دەوروبەری، سەرکەوتنێکی گەورە بوو، شتگەلێک بوون پازدە ساڵ بوو چاوەڕێی بەدیهاتنیان بووین. بەڵام بۆچی خۆجە بەشێوەیەک باسی ئەو شتانەی دەکرد وەک ئەوەی بەتەنیا سەرکەوتنی خۆی بێت؟ وا دیاربوو لە بیری چووبوو لەبەرچاوگرتنی ڕێوشوێنی دژ بە پەتاکە پێشنیازی من بووە، یان لە بیری نەمابوو من نەخشەی کاتم دارشت کە سەرەڕای زۆر ڕاست دەرنەچوونیشی، وەک خۆی پەسەند کرا. ئەوەی منی زیاتر بریندار دەکرد، تەنیا بیرهێنانەوەی چۆنیەتیی ڕۆیشتنی من بوو بۆ دوورگە، نەک هاتنی پڕ لە پەشۆکانی خۆی و بردنەوەی بە دەستوبردی من بۆ ماڵ.

لەوانەیشە لەسەر هەق بووبێت. ئەوەی من هەستم پێ دەکرد، دەشێت ناوی ئیرەیی لێ بنرێت، بەڵام ئەمە هەستێکی برایانە بوو ئەو پەی پێی نەدەبرد. بۆ ئەوەی لەمە تێ بگات، بیرم هێنایەوە چۆن لە ڕۆژانی پێش پەتاکەدا، وەک دوو پیاوی زگوڕتی بۆ لە بیرکردنی شەوانی تەنیایی لەمبەر و ئەوبەری مێز دادەنیشتین؛ چۆن هەندێک جار ترس لە خۆجە و ناوبەناو لە منیش دەنیشت، بەڵام زۆر شتیش لەو ترسە فێر بووین و تەنانەت ئەو ڕۆژانەی لە دوورگەش بووم، تاسەی ئەو شەوانەم دەکرد. وەلێ ئەو، وەک کەسێکی بەشدارنەبوو لە گەمەیەکدا فرت و فێڵەکانی منی بە چاوی خۆی دیبێت، بە سووک تێڕوانینەوە

گوێی بۆ قسەکانم ڕادەگرت و هیچ ئومێد و بەڵێنێکی پێم نەدەدا بۆ گەڕانەوە بۆ ڕۆژانی برایەتیمان.

لە گەڕانمدا کۆڵان بەکۆڵان ئیدی دەمبینی: سەرباری هەڵگرتنی ڕێوشوێنە لەبەرچاو گیراوەکانیش، وەک ئەوەی بمەوێت ئەوەی خۆجە ناوی لێ ناوە سەرکەوتن، نەخەمە سێبەرەوە، دەمبینی پەتاکە لەسەرخۆ لە شار دەکشایەوە. جاروبار لە خۆم دەپرسی وا خەریکە ترسی ڕەشی مردن لە ناومان دەردەچێت و دەڕوات، ئەدی ئەم هەستکردنە بەتەنیاییە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ جاروبار دەمویست لەگەڵ خۆجە ئەو بابەتانە بخەینە بەر باس، نەک خەونەکانی سوڵتان، یان ئەو ڕاوێژ و پێشنیازانەی خۆجە بۆی ئەوی دەکردن. لە مێژ بوو ئامادە بووم شان بەشانی ئەو و بە لەبەرچاوگرتنی ترسی مردنیشەوە بچمە بەردەم ئاوێنەی ترسناکی لەو کاتەدا لە دیوار داگیراو! بەڵام ماوەیەکی زۆر بوو خۆجە بە چاوی سووک سەیری منی دەکرد، یان وا خۆی پێشان دەدا. لەوەش خراپتر، هەندێک جار پێم وا بوو تەنانەت لەوەشدا تەمبەڵی دەنوێنێت.

جاروبار بەمەبەستی ئەوەی سەرلەنوێ بەکێشی بکەمەوە بۆ ناو ژیانی کامەرانی ڕابردوومان، دەمگوت پێویستە ئیدی بچینەوە بەردەم مێزەکەمان. بەمەبەستی دەسپێشخەریکردن و بۆ ئەوەی ئەویش چاوم لێ بکات، دوو سێ جار پڕ کردنەوەی کاغەزیشم تاقی کردەوە. بە زیاد پێوەنانەوە چەندین پەڕەم سەبارەت بە ترسی پەتاکە، خواستی ئەنجامدانی خراپەکاریی دەستچێنی پەتا و خراپەکاریی نیوەناچڵم نووسی و بۆم خوێندەوە، بەڵام ئەو تەنانەت گوێیشی لێم ڕانەگرت. بەهێزێکەوە کە پێ دەچوو لە بێچارەیی منەوە، نەک لە سەرکەوتنی خۆیەوە وەری گرتبێت، بێ ئابڕووانە گوتی: "ئەو ڕۆژانەش دەمزانی سەرتاپای نووسینەکانت توورەهات نەبێت، هیچ شتێکی تر نییە. کاتی خۆی لە بێزاری خۆمەوە ئەو کەمانەم دەکرد، دەمویست بزانم ئاکام بەچی دەگات. کەمێکیش بۆ تاقیکردنەوەی تۆم بوو. هەر ئەو ڕۆژەی واتزانی من پەتام گرتووە و هەڵهاتیت، تێ گەیشتم چ ماڵێکیت. تۆ تاوانباریت! مرۆکەل

دەبن بەدوو بەشـــەوە؛ ئەوانەی وەک مـن، مـــافـــدارن، ئەوانەی وەک تۆن، تاوانبارن.

وەڵامم نەدایەوە و هەوڵم دا قــســەکــانی وەک کـەسـێکی لە خــۆبایی لە سـەرکـەوتندا لێک بدەمــەوە. ئەگـەرچی بیـرەوەریم وەک جـاران تیـژ بوو، و دەمزانی ئەگەر بەوردە ڕووداوەکانی ڕۆژ تووڕە بکرێم، ئامادەم وەک پێویست تووڕەیی پێـشـــان بدەم، بەڵام وەک بلـێـیت نەمـدەزانی بە بەرپەرچدانەوەی قسەکانی کە لە ڕاستیدا مرۆڤی بۆ هێرشی پێچەوانە هان دەدا، ئاڕاستەی خـۆجـە بەرەو کـوێ وەردەگـێـڕم و تا چ ڕادەیەک تەنگاوی دەکـەم. هـەر ئەو ڕۆژانەی لە دەستی ئەو هەڵهاتبووم و چووبوومە دوورگەی هەیبەلی، هەستم کردبوو ئامانجم ڕوون نییە. چ دەبوو ئەگەر بگەڕامایەوە بۆ ڤینیسیا؟ زۆر لە مـێژ بوو بڕوام بەخـۆم هێنابوو لەو پازدە ساڵەدا دایکم مـردووە، دەزگـیـرانم شـووی کـردووە و کـۆشـێک منداڵی خـسـتـووەتـەوە. نەمـدەویست بیـریان لێ بکەمـەوە، بە تێپەڕبوونـی کاتیش، دەگـمـەنتر دەهاتنە خەونم. لـەوەش خراپتر، ئیـدی وەک سـاڵانی دەسـپـێک لە خـەونـەکـانمدا خـۆم لە ڤـینیـسـیـا لە ناو کەسـوکارمـدا نەدەبینـی، بگرە ئەوانم لێرە، لە ئەستەنبوڵ، لە نێوان خـۆمـاندا دەبینی. دەمـزانی ئەگـەر بگەڕێمـەوە ڤـینیسـیـا، ناتوانم سـەرلـەنوێ دەست بە ژیانێک بکەمـەوە کە لە نیوەدا دەسـتم لێ هـەڵگرتبوو. بەخـۆم دەگوت خـۆ ئەگەر هەر پێـویست بێت، ئەوا لێـرە لە نووکـەوە دەست بە ژیانێکی تر دەکـەم. جگە لەوەی سـەردەمانێک بیرم دەکردەوە یەک دوو کتێب دەربارەی تورک و سـاڵانی کـۆیلایەتیم بنووسـم، ئیـدی هـیچ شــتــێکی تر لـەو ژیانەی ئەوێمـــدا نـەبوو بمجووڵێنێت.

جاروبار بیرم دەکردەوە خۆجە پەی بەم بێ نیشتمانی و بێ ئامانجییەی من بردبێت و هـەسـتی بە لاوازیم کـردبێت، بۆیە بە چـاوی سـووک سـەیرم دەکات. هەندێک جاریش گومـانم هەبوو تەنانەت هەسـتـیـشی بەو شـتـانە کـردبێت. هەمـوو ڕۆژێک، بەو چیرۆکانەی بۆ سوڵتـانی دەگێڕایەوە، بەخەیاڵی ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەی کە دەیگوت دڵنیایە دەتوانێت کاریگەریی لەسەر دابنێت و بە

سەرکەوتنی خۆیشی، هێندە مەست بوو، بەڕادەیەک دەتوانم بڵێم تەنانەت بەشێوازی بیرکردنەوەی منی هەر نەدەزانی. هەستم دەکرد بەئیرەییی پێبردنەوە سەیری ئەو بەخۆشادبوونەی خۆجەم دەکرد. خۆشم دەویست، ئەو جۆشە دەستکردەی لە سەرکەوتنی زیاد پێوەنراوی خۆی وەری دەگرت و پرۆژە لەبن نەهاتووەکانیم خۆش دەویست. کاتێک دەیگوت سوڵتان دەخاتە لەپی دەستی، من شەیدای ئەو نیگایەی دەبووم کە لە ناولەپی دەستی دەبڕی. ئەگەرچی خۆشم ئامادە نەبووم دادن بەمجۆرە بیرکردنەوانەدا بنێم، بەڵام ئەگەر چاودێریی هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی ئەوم دەکرد، وام هەست دەکرد چاودێریی خۆم دەکەم. مرۆڤ جاروبار لە هەڵسوکەوتی منداڵێک، یان گەنجێکدا، منداڵی یان لاویەتیی خۆی دەبینێت و بە خۆشەویستی و پەرۆشەوە چاودێری دەکات. ئەوەی ترساندبوومی و پەرۆشی کردبووم، بەردەوام بەخەیاڵدا دەهات مەچەکم بگرێت و پێم بڵێت "من بووم بە تۆ." هەر جارێک ڕۆژانی ڕابردووم دەخستەوە بیری، ئەو بێدەنگمی دەکرد. یان باسی ئەوەی دەکرد ئەو ڕۆژە چی بە سوڵتان گوتووە تا بیخاتە سەر کەڵکەڵەی چەکی لە ئەقڵ بەدەر، یان بەوردی باسی ئەوەی دەگێڕایەوە سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە بەدەم لێکدانەوەی خەونەوە، چۆن کاریگەریی لەسەر سوڵتان داناوە.

ئارەزووم بوو منیش بڕوا بە تیشکی ئەو سەرکەوتنانەی بکەم کە ئەو لە گێڕانەوەیاندا هەنگوینی بەسەریاندا دەڕژاند. جاری وا هەبوو جڵەوی خەیاڵم لە دەست دەدا و بە شادمانییەوە بڕوام بەخۆم دەهێنا چووبێتمە جێی ئەو. لەو ساتانەدا، ئەویش و خۆیشم زیاتر خۆش دەویست، گێژ و وێژ و بەدەمی داچەقاوەوە لە قسەکانیدا ون دەبووم و وام دەزانی بەجۆرێک باس لە ڕۆژانی جوانی داهاتوو دەکات، وەک ئەوەی ئامانجی هاوبەشی هەردووکمان بێت.

بەو جۆرە، هەر جارێک ئەو خەونەکانی سوڵتانی لێک دەدایەوە، منیش بەشدار دەبووم! خۆجە بڕیاری دابوو سوڵتانی بیست و یەک ساڵە هان بدات جڵەوی دەسەڵاتی خۆی قایمتر بکات. بەو جۆرە کەوتە لێکدانەوەی خەونەکانی: بەدبەختیی ئەو ئەسپە تەنیایانەی بەردەوام لە خەونی سوڵتاندا

چوارناڵە ڕایان دەکرد، لەبەر بێ خاوەنییان بوو؛ ئەو گورگانەی بە کەڵبەی تیژیان پەلاماری قوڕگی دوژمنانی خۆیان دەدا، شادمان بوون بەوەی خۆبەخۆ بەکاری خۆیان ڕادەگەن؛ پیرەژنانی زار و بەگریان، کچانی کوێر و ئەو دارانەی لە بارانی تاریکیدا بەخێرایی گەلایان دەوەری، هانایان بۆ سوڵتان دەهێنا؛ جاڵجاڵۆکەی پیرۆز و بازە بەخۆنازەکانیش نیشانەی بەخشندەیی تەنیایین. ئێمە دەمانویست سوڵتان، دوای گرتنە دەستی دەسەڵاتی تەواو، ئاوڕێک لە زانستەکەمان بداتەوە. بۆ ئەو مەبەستە، تەنانەت پەنامان بۆ مێردەزمە و خەونی ترسناکیش برد. وەک زۆربەی سەوداسەرانی ڕاو، لە شەوانی درێژ و وەڕسکەری ڕاودا، سوڵتان بەخەیاڵ خۆی نێچیر بوو ڕاو دەکرا. بەترسی لە دەستدانی تەختەوە، لە خەونیدا خۆی بە منداڵی دەبینی لەسەر تەخت دانیشتووە. لە لێکدانەوەی ئەو خەونەیدا، خۆجە دەیگوت بەردەوام بەلاوی دەمێنێتەوە، بەڵام بۆ ڕزگاربوون لە داوی دوژمنانی هەردەم بێدارمان، پێویستە چەکێکی بەهێزتر لە چەکەکانی ئەوان دروست بکەین. ئەگەر سوڵتان لە خەونیدا دەیبینی وا دوو لەتی کەرێک کە سوڵتان مورادی باپیری بۆ پێشاندانی هێزی بازوو، بە شمشێر کردوویەتی بە دوو لەتەوە، بەدەم ڕاکردنەوە لە یەکتر دوور دەکەونەوە؛ یان دایکی باوکی دەبینی، ئەو پیرەژنەی سوڵتان کۆسەمی پێ دەڵێن، وا ڕاست بووەتەوە و ڕووتوقوت هاتووە بۆ خنکاندنی ئەم و دایکی؛ یان لە شوێن چنارەکانی مەیدانی ڕمبازی، داری هەنجیر ڕوواوە و دارەکان لەبری هەنجیر تەرمی خوێنینیان گرتووە؛ یان دەستەیەک پیاو خراپ ڕووخساریان لە ڕووخساری ئەم دەچێت، بەدوایەوەن بۆ ئەوەی بیگرن و توورەکەی دەستیان بکەنە سەری و بیخنکێنن؛ یان سوپایەکی کیسەڵ لە ئۆیسکودارەوە دەچووە دەریاوە، بای بەتینیش مۆمەکانی سەر پشتیانی نەدەکوژاندەوە و بە ئاگرەوە ڕوویان لە کۆشک دەکرد، ئێمە هەستمان دەکرد ئەو کەسانەی دەیانگوت سوڵتان کارەکانی دەوڵەتی فەرامۆش کردووە و جگە لە ڕاو و ئاژەڵ، هیچ شتێکی تری لەسەردا نییە، زۆر ناهەقن. من ئەم خەونانەم بە پشوودرێژی و کەیفەوە دەمپۆلاند و لە

دەفتەرێکدا تۆمارم دەکردن، هەوڵمان دەدا لە بەرژەوەندی زانست و ئەو چەکە لە ئەقڵ بەدەرەی پێویست بوو دروستی بکەین، لێکی بدەینەوە.

بە بۆچوونی خۆجە، هێدی هێدی کاریگەریمان لەسەر سوڵتان دادەنا، بەڵام من هیچی تر باوەڕم بە سەرکەوتن نەمابوو. دوای ئەو شەوانەی بەخەیاڵی خۆی بەڵێنی لە سوڵتان وەردەگرت بۆ بنیاتنانی ڕوانگەخانە، یان خانەی زانست، یان بۆ دروستکردنی چەکێکی نوێ، چەندین مانگ تێ دەپەڕی، بێ ئەوەی بتوانێت تەنانەت بۆ جارێکیش پەیگیرانە لەسەر ئەو بابەتانە لەگەڵ سوڵتان بدوێت. پاش ئەوەی کۆپرولو ساڵێک دوای پەتاکە کۆچی دوایی کرد، خۆجە دیسان بیانووی کەوتەوە دەست بۆ ئەوەی ئومێدی لەکن زیندوو بێتەوە. سوڵتان لەبەر سڵکردنەوەی لە هێز و کەسایەتیی کۆپرولو، خۆی لە جێبەجێکردنی نەخشەکانی ناو سەری خۆی دەدزییەوە. باشوەزیر مردبوو، بەو پێیەی کوڕەکەی جێی دەگرتەوە و لە بەهێزیدا شانی لە شانی باوکی نەدا، نۆرە هاتبووە سەر چاوەڕێکردنی بڕیاری بوێرانەی سوڵتان.

سێ ساڵی دواترمان لە چاوەڕوانی ئەو بڕیارە بوێرانەیەدا بەسەر برد. بێدەنگیی سوڵتانی تیاماو لە نێوان خەون و ڕاودا، چی دی بۆ من مایەی سەرسووڕمان نەبوو. ئەوەی بەلای منەوە سەیر بوو، خۆجە هێشتا ئومێدی خۆی بە سوڵتان نەبڕیبوو. من بەدرێژاییی ئەو ساڵانە چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم دەکرد ئومێدی لێ ببڕێت و وەک منی لێ بێت! ئیدی وەک جاران باسی ئەو شتەی نەدەکرد کە خۆی ناوی لێ نابوو سەرکەوتن. ئەگەرچی جۆشی چەند مانگێکی دوای پەتاکەی نەمابوو، بەڵام هێشتا ئەو خەیاڵەی لە سەردا بوو ڕۆژێک سوڵتان بەو شتە قایل بکات کە پرۆژەی گەورەی پێ دەگوت. هەرجارە بیانوویەکی دەدۆزییەوە و دەیگوت: "ئەگەر سوڵتان یەکسەر دوای ئەو ئاگرە گەورەیەی کە ئەستەنبوڵی کردە قەرەبرووت، پارە بۆ پرۆژە گەورەکان تەرخان بکات، هەل دەکەوێتە دەست ئەو دوژمنانەی خوازیارن براکەی بهێننە سەر تەخت. سوڵتان ئێستا هیچ شتێک ناکات، چونکە سوپا لە شەڕی مەجەڕستانە." ساڵی دوایش لەبەر ئەوەی لە دژی ئەڵمانیا کەوتبووینە

شەڕەوە، چاوەڕێمان دەکرد. دواتر کاروباری بنیاتنانی مزگەوتی والیدە هاتە ئاراوە. پوولێکی زۆریشی بۆ تەرخان کرابوو، خۆجەش ناوبەناو لەگەڵ دایە سوڵتان خەدیجە تورهان و سوڵتاندا بەسەری دەکردەوە. پاشان ڕاو و شکاری لەبن نەهاتوو هەبوو، بەڵام من بەشداریم نەدەکرد. بەدەم چاوەڕێکردنی گەڕانەوەی خۆجەوە لە ڕاو، هەوڵم دەدا لە ئامۆژگارییەکانی پێڕەوی بکەم، بەدوای بیرۆکەی درەوشاوەدا بۆ ئەو شتانە دەگەڕام کە ئەو بە "پرۆژەی گەورە"، یان "زانست" ناوی دەبرد، تەمبەڵانە و بەدەم خەوەنووچکەوە پەڕەی کتێبەکانم هەڵدەدایەوە.

ئەم خەیاڵی پرۆژانە، ئەگەر ڕاستیش دەرچووبایە، ئەنجامەکەی لەکن من گرینگ نەبوو، چونکە چی دی مایەی دڵخۆشی نەبوو بۆ من. خۆجەش هێندەی من دەیزانی ئەو شتانەی لە ساڵانی سەرەتای یەکترناسینماندا لە بارەی زانستەکانی گەردووونناسی و جوگرافیا و سرووشتەوە بیرمان لێ دەکردەوە، ئەنجامێکی بەرجەستەی نەبوو. سەعات و ئامێر و مۆدێلەکان ماوەیەکی درێژ بوو لە بیر کرابوون و ژەنگیان هەڵهێنابوو. هەموو شتێکمان دواخستبوو بۆ ڕۆژێک کە تیایدا ئەو شتەمان دەخستە قۆناغی جێبەجێکردنەوە کە ئەو بە"زانست" ناوی دەبرد. ئەوەی بۆ ڕزگاربوونمان لە کارەساتی چاوەڕوانکراو لەبەر دەستماندا بوو، زیاتر خەیاڵی پرۆژەیەک بوو، نەک پرۆژەکە خۆی. بۆ باوەڕهێنان بەو خەیاڵە بێ ڕەنگانەی بەهیچ جۆرێک منیان قایل نەدەکرد و بەمەبەستی ئەوەی لەگەڵ خۆجەدا بم، دەکۆشام لە ڕوانگەی ئەوەوە سەیری ئەو پەڕانە بکەم کە جاروبار هەڵمدەدانەوە و هەوڵیشم دەدا خۆم بخەمە جێی ئەو. لە کاتی گەڕانەوەیدا لە ڕاو، من خۆم وا پیشان دەدا، ڕاستییەکی نوێم لەم بابەت، یان لەو بابەتەدا کە بۆ خۆ پێوە خەریککردن بۆ منی جێ هێشتبوو، دۆزیبێتەوە و وام دەنواند دەتوانین لەسەر ئەو بنەمایە هەموو شتێک بگۆڕین. کاتێک دەمگوت: "هەڵچوون و داچوونی زەریا پێوەندیی بە گەرمای ئەو جۆگەلانەوە هەیە کە دەڕژێنە ناوی"، یان: "پەتا لە ڕێی گەردیلەکانی ناو هەواوە دەگوازرێتەوە، هەوا بگۆڕێت، ئەویش دەڕوات و دوور

دەکەوێتەوە"، یان: "لە دەستمان دێت چەکێکی گەورە دروست بکەین و بە لوولەی درێژی و پێچکەکانی ژێری هەموو کەسێکی پێ ڕاو بنێین"، یان: "زەوی بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە و خۆریش بەدەوری مانگدا"، خۆجە بەدەم گۆڕینی کەلوپەلی تۆزاوی ڕاوەوە هەمان وەڵامی دەدایەوە و منی بە خۆشەویستییەوە دەهێنایە پێکەنین: "جا خۆ ئەو گەمژانەی ئێمە تەنانەت پەی بەو ڕاستییەش نابەن!"

پاشان بەجۆرێک هەڵدەچوو شەپۆلی تووڕەیی ئەو منیشی دەدایە بەر. باسی لە تووڕەهاتییەکانی ڕاو دەکرد و دەیگوت سوڵتان چەندین سەعات بەسەر پشتی ئەسپەوە دوای بەرازێکی سەرلێشێواو دەکەوێت، یان فرمێسک بۆ ئەو کەروێشکانە دەڕێژێت کە تاژییەکانی دەیگرن. بێ ویستی خۆی ددانی پێدا دەنا ئەو قسانەی بەدرێژایی ڕاو بۆ سوڵتانی دەکات، دەچنە ئەم گوێیەوە و لەو گوێیەوە دێنە دەرێ. لێکدالێکدا بە نەفرەتەوە دووپاتی دەکردەوە: "ئەم بێ ئەقڵانە کەی پەی بە ڕاستییەکان دەبەن؟ ئەرێ یەکتر دۆزینەوەی ئەو گشت گەمژەیە ڕێککەوتە، یان ناچاری؟ بۆچی هێندە دەبەنگن؟"

بەو جۆرە، هێدی هێدی تێگەیشت ئەو شتەی بە "زانست" ناوی دەبات، پێویستە ئەمجار لە سەرەتاوە بۆ تێگەیشتن لە ناواخنی مێشکی ئەوان دەستی پێ بکاتەوە. بەهۆی بیرکەوتنەوەی ئەو ڕۆژە خۆشانەی لە دەوری مێزێک دادەنیشتین و نەفرەتمان لە یەکدی دەکرد، منیش هەوای خۆهاویشتنە ناو ئەو "زانستە" لە کەللەمی دا، بەڵام دوای یەکەم تاقیکردنەوە بۆمان دەرکەوت ئیدی کار وەک جاران ناڕوات.

جارێکیان، لەبەر ئەوەی نەمدەزانی چۆن و لەبەر چی تەنگاوی بکەم و بیخزێنمە گۆشەوە، کردم و کۆشام دەسەڵاتم بەسەریدا نەشکا. لەوەش گرینگتر، هەستم دەکرد ئازار و تێکشکانەکانی ئەو، دەرد و شکستی خۆم بن. جارێک، ئەگەرچی خۆیشم باوەڕم پێی نەبوو، بە نموونەی زیاد پێوەنراوەوە گەمژەیی ئەوانەی ئێرەم هێنایەوە بیری، دام بە بەر گوێیدا ئەویش هێندەی ئەوان ناچارە مل بۆ دۆڕان کەچ بکات و پاشان کەوتمە

چاودێریکردنی: بەتوندی وەڵامی دایەوە و گوتی: "سەرنەکەوتن ناچاری نییە، ئەگەر پێش ئەوان بکەوین و خۆمان بدەینە ئەم کارە، بۆ نموونە، ئەگەر پرۆژەی چەکەکە بەدی بهێنین، ئەوا دەتوانین ڕێڕەوی شەپۆلی ئەو ڕووبارەی دەکۆشێت بۆ دواوە بمانگێڕێتەوە، بە ئارەزووی خۆمان بگۆڕین." گەرچی لەمەڕ پرۆژەکان نا، بگرە وەک ئەوەی لە ساتەکانی بێ ئومێدیدا دەیکرد، بە گوتنی "پرۆژەکانمان" لەبری "پرۆژەکانم"، منیشی دڵخۆش دەکرد، کەوتبووە بەر ترسی دۆڕانێکی چاوەڕوانکراو. بە منداڵێکی بێ کەسم دەچوواند، تووڕەیی و خەمگینییەکەیم خۆش دەویست، چونکە ساڵانی سەرەتای کۆلایەتی خۆمیان دەخستەوە بیرم. منیش دەمویست وەک ئەوم لێ بێت. کاتێک بەمەسەر و ئەوسەری ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، یان سەیری کۆڵانی قرێژ و قوڕاویی ناو تاریکی و بەر بارانی دەکرد، یان، وەک گەڕان بەدوای سەرەداوی ئومێدێکی نوێدا بۆ چرای کز و پرتەپرتکەری یەک دوو ماڵی کەناری کەنداوی زێڕینی دەڕوانی، بۆ ساتێک وای بۆ دەچووم ئەوەی بەدەم ئازارەوە بە ژوورەکەدا دێت و دەڕوات، خۆجە نییە، بگرە گەنجیەتیی خۆمە. هەستم دەکرد ئەو کەسە خۆمم ماوەیەکە سەری هەڵگرتووە و منی بەجێ هێشتووە. منی خەواڵوو لە گۆشەیەکدا خۆزگەم دەخواست خۆجە بم، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ جۆشی ونبووم بدۆزمەوە.

ئیدی وزەی بەرگەگرتنی ئەو دڵەڕاوکێ و پەشۆکانە بێ کۆتایی و خۆدووبارەکەرەوەیەم تێدا نەمابوو. لە دوای بوونی خۆجە بە گەورەی ئەستێرەناسان، ڕوویەری زەوییەکانی لە گەبزە زیادی کرد و ڕێژەی داهاتمان چووە سەرێ. جگە لە دەمەتەقێ لەگەڵ سوڵتان و کات بەسەربردن لە تەکیدا، پێویستی بەهیچ کارێکی تر نەبوو. جاروبار دەچووینە گەبزە بۆ بەسەرکردنەوەی ئاشە تێکشکاوەکان و ئەو گوندانەی کە سەگی زەبەلاحی شوانەکانیان بەر لە خاوەنەکانیان بەپیرمانەوە دەهاتن. چاومان بە داهاتەکاندا دەگێڕا و هەوڵمان دەدا لە ڕێی بەراوردکردنی تۆمارەکانەوە تێ بگەین چاودێر تا چ ئاستێک فێڵی لێمان کردووە. جاربەجار بە پێکەنینەوە و

زۆر جاری تریش بە بێزارییەوە لێکۆڵینەوەی پڕ لە کەیف و سەفامان بۆ سوڵتان دەنووسی. لەوانە بترازێت، هیچی ترمان نەدەکرد. ئەگەر بەزۆری منیش نەبوایە، لەوانە بوو خۆجە نەیاتەوە سەر ڕێی ئەو جیهانەی کاتێکی خۆشمان تێدا بەسەر دەبرد و لە ئاکامیشدا لەگەڵ ژنە بۆنخۆشەکانی ناویدا دەنووستین.

ئەوەی زیاتر ئەوی کەللەیی کردبوو، هێرش بۆ سەر ئەڵمانیا و دوورگەی گریت بوو، بەجۆرێک ئەستەنبوڵ بێ سوپا و بێ سوڵتان مابووەوە. سوڵتانیش بە ئامۆژگاریی دایکی خۆی نەکرد و جارێکی تر هەرچی چەنەباز و لەوچە و مەخسەرە و لاساییکەرەوەی لە کۆشک وەدەرنراو هەیە لە دەوری خۆی کۆ کردەوە. خۆجە خۆی لەو سەختەکارانە کە نەفرەتی لێیان دەکرد، دوور دەگرت و سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆ پاراستنی بالادەستیی خۆی، نەچێتە ناویانەوە، بەڵام لە ئاکامی پێداگرتنی سوڵتاندا، ناچار بوو یەک دوو جار لەگەڵیاندا بدوێت و گوێ لە بابەتانەکانیان ڕابگرێت. لەو کۆبوونەوانەدا، پرسیاری لەم جۆرە دەخرایە ڕوو: "ئایا ئاژەڵان ڕۆحیان هەیە، کامیان هەیەتی، کامیان دەچێتە بەهەشت و کامیان دەچێتە دۆزەخ؟ داخۆ گوێچەکەماسی نێرە، یان مێ؟ ئایا ئەو خۆرەی بەیانیان هەڵدێت، خۆرێکی نوێیە، یان هەمان خۆرە ئێواران ئاوا دەبێت، لە ڕێگەی پشتەوە دەسووڕێتەوە و سەرلەبەیانی لەولاوە هەڵدێتەوە؟" خۆجە، بە بیستنی ئەو گەڕەلاوژێیانە ئومێدی بە داهاتوو نەدەما و دەیگوت ئەگەر شتێک نەکەین، بەم زووانە سوڵتانمان لە کیس دەچێت.

لەبەر ئەوەی بە پرۆژەکانی "ئێمە" و بە داهاتووی "ئێمە" دەهاتە گۆ، بە شادمانییەوە تێکەڵ بە گفتوگۆکان دەبووم. جارێکیان، بۆ تێگەیشتن لەوەی چی لە مێشکی سوڵتاندایە، دەفتەری ئەو چەند ساڵەی من و خەون و بیرەوەرییەکانمی بەو ناوەدا پەرش و بڵاو کردەوە. هەروەک چۆن کەسێک بخوازێت کەلوپەلی ڕژاوی کشاوەکانی دۆلابێک بخاتەوە سەریەک، هەوڵمان دا نەخشەی ئەقڵی سوڵتان بکێشین. ئەنجام بەهیچ جۆرێک هیوابەخش نەبوو: ئەگەرچی خۆجە هێشتا دەیتوانی لەمەڕ چەکی لە ئەقڵ بەدەری مایەی

ڕزگـاربوونمان، یان لە بارەی پێـداویسـتیی هەرچی زووتر چارەسـەرکـردنی ڕازەکانی ناو ئەقڵمـانەوە بدوێت، بەڵام ئیتر بەجۆرێک هەڵسوکەوتی نەدەکرد وەک ئەوەی لە کارەساتی چاوەڕوانکراو بێ ئاگا بێت. چەندین مانگ تا ڕادەی شەویلگە شلبوون لەو بارەیەوە قسەمان کرد.

دەمـانگوت تۆ بڵـێـیت وا لە کـارەسـاتەکـە گـەیشـتـبین وەک ئەوەی ئیـمـپـراتۆرییـەت وڵاتەکـانـی ژێر قـەڵەمـڕەوی خـۆی یەک لە دوای یـەک لە دەدۆڕێنێت؟ نەخشەکانمان بەسەر مێزدا بڵاو دەکردەوە و بە خەمبارییەوە ئەو وڵات و چیا و ڕووبارانەمـان دەستنیشـان دەکرد کە چاوەڕێمان دەکرد پێش ئەوانی تر لە دەسـتـیـان بدەین. یان کـارەسـات و ڕووخـان بەواتەی گـۆڕانی مـرۆڤ و باوەڕیانە بێ ئەوەی خـۆیان هـەسـتی پێ بکەن؟ وامـان دەهێنایە بەرچاوی خۆمان بەیانییەک هەر دانیشتوویەکی ئەستەنبوڵ وەک مرۆڤێکی تر لە جێگەی گەرمدا لە خەو هەڵدەسێت، نازانێت چۆن جلەکانی بپۆشێت و بێ ئاگـایە لەوەی منارەی مـزگـەوت بەکـەڵکی چی دێت. لەوانەیشـە کـارەسـات بەواتای بینینی باڵادەستیی ئەوانی تر و هـەوڵدان بێت بۆ لاساییکردنەوەیان. ئەوسـا داوای لێم دەکـرد بڕگەیەک لە ژیانی ڤـینیـسـیـام بگێـڕمـەوە. پاشـان، بەخـەیاڵ کڵاومان دەکردە سـەری هەندێک لە ناسـیاوانـی ئێرە و پانتۆڵمـان لە پێیان دەکرد و بیرەوەرییەکانی منمان پێیان دەژیاندەوە.

لە دانانی ئەو خـەیاڵانەدا کات زۆر بـەخێرایی تێ دەپەڕی، بۆیە وەک دوایین چارە و بۆ ڕزگـاربوون لێـیـان، بڕیارمـان دا بۆ سـوڵتـان بەرزیان بکەینەوە. بەخۆمان دەگوت دیمەنەکانی بە ڕەنگی خـەیاڵ نەخشێندراوی ئەم کارەسـاتە بۆیان هەیە سوڵتان بهەژێنن.

بەو جۆرە، بەدرێژاییی شەوانی کشومات و تاریک، کتێبێکمان پڕ کردەوە. کتێبێک بوو خـەیاڵاتی ئەو کارەسـات و تێکشکانەی لێ دەچۆڕا کـە چەندین مـانگ بوو بە خەمگینی و بـەجۆشێکی بێ ئومێدەوە دەمـانهۆنینەوە. پەڕەکانی کتێبەکەمان پڕ کرد لە باسی هەژارانی سەردانەواندوو، ڕێگە و بانی قوڕاوی؛ باڵەخانەی نیوەناچڵ؛ کۆڵانی تاریک و سەمەرە؛ نزای ئەوانەی بۆ گەڕانەوەی

هەموو شتێک بۆ دۆخی کۆن دەکورووژێنەوە و لە پاڕانەوەکانی خۆیان تێ ناگەن؛ دایکانی دەردەدار و باوکانی بەلەنگاز؛ ئەو نامورادانەی تەمەنیان پێ ڕانەدەگەیشت کار و نووسینی ولاتانی ترمان بۆ بگوازنەوە؛ ئامێرە لە کارکەوتووەکان؛ ئەو بەساڵاچووانەی گریان بۆ ڕۆژانی جوان و بابردوو چاویانی کز کردوە؛ سەگی تەنیا ئێسک و پێست پێوەماوی کۆڵانەکان؛ گوندنشینانی بێ زەوی و زار؛ ئەو بێکارانەی بە دەستی خاڵی بە شاردا دەسووڕێنەوە؛ موسڵمانی نەخوێندەوار و پانتۆڵ لە پێ و هەموو ئەو شەڕانەی بە تێکشکان بەکۆتا هاتوون. بەشێکی تری کتێبەکەمان بە بیرەوەرییە کاڵەوەبووەکانی من پڕ کردەوە: یەک دوو دیمەنی ڕەنگینی پێکهاتوو لە سەردەمی ژیانم لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و براکانمدا لە ڤینیسیا و لە چەند ڕووداوێکی شاد و دەرزبەخشی سالانی خوێندنم. مەبەستمان بوو لە سوڵتان بگەیەنین ئەوانی تر کە چاوەڕێ دەکرێت بەسەرماندا سەربکەون. بەو شێوەیە دەژین و ئێمەش پێویستە بەر لەوان بکەوینە خۆ و وا و اوا بکەین! کتێبەکەمان بە دەستی خۆشنووسی چەپەوانە نووسرایەوە و لە بەشی کۆتاییدا شیعرێکی سەروادار هەبوو. دەکرا شیعرەکە بە دەروازەیەک بۆ ڕازی ئەو مەتەڵانەی ناو سەرمان دابنرێت کە خۆجە پێی خۆش بوو بەردەوام وەک دۆلابێکی پڕ لە کەلوپەل وێنای بکات. هەوای ناسک و تەمومژی ئەو شیعرە پڕ لە شکۆ و بێدەنگە بە خەمیگینی کۆتایی بە یەکێک لە باشترینی ئەو کتێب و لێکۆڵینەوانە دەهێنا کە لەگەڵ خۆجەدا پێکەوە دەماننووسی.

پاش مانگێک لە ڕادەستکردنی کتێبەکە بە سوڵتان، خۆجە فەرمانی دەست بەکاربوونی بۆ بە دروستکردنی چەکی لە ئەقڵ بەدەر لێی وەرگرت. سەرمان لێ شێوابوو، چەندی کردمان و کۆشاین نەمانتوانی بگەینە ئاکامی ئەوەی داخۆ لەو سەرکەوتنماندا تا چ ئاستێک قەرزاری ئەو کتێبە بووین.

## ٩

ئەو کاتەی سولّتان گوتبووی: "تا دەی چەکی لە ئەقلّ بەدەری پەرێشانکەری دوژمنانمان دروست بکە با ببینین"، ڕەنگە مەبەستی تاقیکردنەوەی خۆجە بووبێت، یان خەونێکی هەبووە و لە خۆجەی شاردوەتەوە، یاخۆ مەبەستی بووە پێشانی دایکی دەسەلاّتدار و شازادەکانی بدات ئەو زماندرێژانەی لە دەوری کۆ بوونەتەوە، بە کەلّکی شتێک دێن. یان لەوانەیە پێی وا بووبێت خۆجە دەتوانێت لە دوای پەتاکە پەرجوویەکی تریش بخولّقێنێت، یان لەوانەیە بەڕاستیش کەوتبێتە ژێر کاریگەریی دیمەنی کارەساتەکانی ناو کتێبەکەمانەوە. ڕەنگە لە کارەساتیش زیاتر، شپرزەی ئەوە بووبێت دوای چەند تێکشکانێکی سەربازی، وەک دەترسا، ئەوانەی دەیانەوێت براکەی بهێننە سەر تەخت، ئەم لە تەخت دابگرن. بەدەم بیرکردنەوە و بە سەرسووڕمانەوە، پارە و پوولی زۆر و زەوەندی داهاتی ئەو گوند و خان و باخی زەیتوونانەمان دەژمارد کە سولّتان بەمەبەستی دروستکردنی چەک بۆ ئێمەی تەرخان کردبوو.

دواجار خۆجە گوتی پێویستە تەنیا سەرمان لە واقوڕماویی خۆمان سووڕ بمێنێت "باشە هەموو ئەو چیرۆکانەی سالاّنێک بوو بۆ سولّتانی دەگێڕایەوە و گشت ئەو کتێب و لێکۆلّینەوانەی بۆیمان نووسیبوو، ناڕاست بوون تا گومان بکەین لەوەی بڕوای پێیان نەکردووە؟" لەوەش زیاتر: سولّتان کەوتبووە سەر کەلّکەلّەی زانینی شتەکانی ناو تاریکاییی مێشکمان. خۆجە بەجۆشەوە لە منی دەپرسی: "مەگەر ئەمە ئەو سەرکەوتنە نییە کە سالاّنێکی درێژ بوو چاوەڕێمان دەکرد؟"

وا بوو. سەرباری ئەوەش، بگرە بە دابەشکردنی سەرکەوتن لە نێوان

هەردووکمـاندا دەسـتـمـان کـرد بە کـار. مـنیش، لەبـەر ئەوەی هێـندەی ئەو پەرۆشی ئەنجامی کار نەبووم، شادمـان بووم. شـەش سـاڵی دوای ئەو کاتەی بۆ پێشـخستنی چەکەکە تەرخانمان کرد، ترسناکترین ساڵانی ژیانمان بوون. نەک بەهۆی کـارکـردنمانەوە بـە باروت، بگرە لەبەر هێنانی ئیرەییی دوژمنان بەسەر خۆمـاندا، چونکە هەمووان ئۆقرەیان لێ برابوو، چاوەڕێی سـەرکـەتن، یان تێکشکانی ئێـمـەیان دەکـرد و خـۆشـمـان بە ترسـەوە چاوەڕێی هەمـان شتمان دەکرد. لە مەترسیدا بووین.

سـەرەتا لەسەر مێز کارمان کرد و بەدەم بەفیڕۆدانی کاتەوە زستانێکمان بەڕێ کـرد. لێـوانلێـو بووین لە وره و ویستـی کـار، بەڵام جگە لە بیـرۆکـەی چەکـەکـە و پێـشـبـینیکردنی چۆنیـەتیی بەکـارهێنانی لە بەرەنگار بوونەوەی دوژمندا و بـەدەر لە وردەکـاریە ناڕوون و بێ ڕەنگەکـانی ناو خـەیاڵمـان، هیچ شـتێکی تـرمـان لەبەر دەست نەبوو. دواتر، بڕیارمـان دا لە هەوای کراوەدا بە باروت کار بکەین. کتومت وەک ئەو هەفتانەی پێکەوە تەدارەکی ئاگربازیمان ئامـادە کرد، ئێـمـە دەچووینە ژێر سـێـبـەری دارە بەرزەکـان، پیـاوەکـانمان ئەو تێکەڵانەیان گڕ دەدا کە خۆمان ڕاەچێتەمان بۆیان ئامادە دەکرد. لە هەر چوار لای ئەسـتـەنبـوڵەوە خـەڵکی خـۆ تێـهـەڵقورتێن دەهاتن بۆ ئەوەی سـەیری ئەو دووکەڵە ڕەنگاوڕەنگانە بکەن کە لە ئاکامی گرمەی جۆراوجۆرەوە بە ئاسماندا بەرز دەبووەوە. دواتر، ئـەو چیمـەنەی ئێـمـە تۆپمـان لەسـەر لە قـاڵب دەگرت و شـوێنی لوولەی درێژ و نیشـانە و هەڵدانی چادری ئێمـە بـوو، بەهـۆی ئاپۆڕەی کەسـانـی خـۆ تێـهـەڵقـورتێنەوە بوو بە شـوێنـی جـەژنگێڕان. ڕۆژێکی کـۆتاییی هـاوین بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، سوڵتان خۆیمان لێ پەیدا بوو.

بەزمێکـی ئاگربازیمان بۆی گێڕا زەوی و ئاسـمـانمان لەراندەوە. دانە دانەی ئەو قەوان و گوللانەی بۆ تێکەڵەی باش داگیراوی باروت ئامادەمان کردبوون، تۆپە نوێیەکـان، نەخشـەی ئەو لوولە درێژانەی هـێشتا لە قـاڵبمان نەگرتبوون و ڕەشنووسـی مـیکانیزمـی خـۆبەخۆ تەقـاندنمان پێشـانـی سوڵتـان دا. لەوانی دی زیاتر، بایەخـی بە من دا. سـەرەتا، خـۆجـە ویسـتـی من لە سـوڵتـان دوور

ڕابگرێت، بەڵام سوڵتان پێی سەیر بووە لەگەڵ سەرەتای تەدارەکی ئاگربازیدا منیش هێندەی خۆجە فەرمانم داوە و پیاوەکان هێندەی پرسیان بەو کردووە، بە منیشیان کردووە.

ئەو ساتەی دوای پازدە ساڵ بۆ جاری دووەم چوومەوە بەردەم سوڵتان، بەجۆرێک سەیری کرد، وەک ئەوەی پێشتر منی ناسیبێت و ئێستا بۆی نەبرێتەوە سەریەک کێم، کتومت وەک کەسێکی چاوبەستراوە تامی میوەیەکی کردبێت و هەوڵ بدات بزانێت لە چ جۆرێکە. دامێنی کەواکەیم ماچ کرد. کاتێک زانی بیست ساڵە لێرەم و هێشتا نەبووم بە موسڵمان، هیچ هەڵنەچوو. خەیاڵی لای شتێکی تر بوو: گوتی: "کەواتە بیست ساڵ؟ شتێکی سەیرە!" پاشان ئەو پرسیارەی لێم کرد: "تۆ ئەو شتانە فێری ئەو دەکەیت؟" بەڵام ئەم پرسیارەی بۆ زانینی وەڵامی من نەپرسی. لە چادرە شڕەکەمان کە بۆنی باروت و کبریتی لێ دەهات، چووبووە دەرێ و ڕووەو ئەسپە سپی و جوانەکەی هەنگاوی دەنا. لەپڕ ڕاوەستا، ڕێک لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە، ئێمەی بینی هاوشانی یەکتر ڕاوەستابووین. وەک ئەوەی یەکێک لە پەرجووە بێ وێنەکانی خوا کە بۆ شکاندنی شکۆی ڕەگەزی مرۆگەل و پێشاندانی تووڕەهاتییان دەینوێنێت، یان کورتە بالایەکی بێ کێماسی، یاخۆ دوو برای دووانەی کتومت لەیەکچووی دیبێت، بزەیەک کەوتە سەر لێوی.

شەو بیرم لە سوڵتان کردەوە، بەڵام نەک بەو جۆرەی خۆجە ئارەزووی دەکرد. ئەو هێشتا بە نەفرەتەوە باسی دەکرد، بەڵام من تێ گەیشتبووم ناتوانم ڕقم لێی بێت و بە چاوی سووک تێی بڕوانم. من دڵم چووبووە ئارامی، سالاریی، خوێنشیرینی و ئەو ڕەفتارەی کە وەک منداڵێکی نازدار هەرچی بەخەیاڵدا بهاتایە، دەری دەبڕی. منیش دەمویست وەک ئەو وابم، یان ببم بە دۆستی وی. دوای بڕانەوەی تۆفانی هەڵچوونی خۆجە، لە پێخەوەکەمدا بەدەم هەوڵدانەوە بۆ خەوتن، بیرم دەکردەوە: سوڵتان کەسێک نییە شایەنی ئەوە بێت لە پاشەملە باسی بکرێت، دەمویست هەموو شتێک بدرکێنم بۆی. بەڵام نەمدەزانی ئەو شتانە چین؟

توومەز بایەخ پێدانەکەم یەکسەرە نەبووە. ڕۆژێک خۆجە بە ناڕەزای دڵ گوتی سبەینێ سوڵتان لەگەڵ ئەودا چاوەڕێی هاتنی منیش دەکات. منیش لەتەکیدا ڕۆیشتم. ڕۆژێک بوو لە ڕۆژە جوانەکانی پایزێکی درەنگ و بۆنی دەریا و قەوزەی لێ دەهات. تەواوی سەرلەبەیانیمان لە باخێکی گەورەی بە گەلای سووری وەریو داپۆشراو لە دەوری حەوزێکی گوڵڕەنگی ژێر دار ئەرخەوان و چناردا بەسەر برد. سوڵتان ویستی باسی ئەو بۆقانە بکەین کە حەوزەکەیان پڕ کردبوو لە ژیان. خۆجە ڕووی نەدایێ، ئەوەندە نەبێت یەک دوو قسەی بێ خەیاڵ و بێ ڕەنگی کرد. ئەم ڕەفتارەی خۆجە، منی تووشی سەرسوورمان کرد، بەڵام بەلای سوڵتانەوە مایەی بایەخ پێدان نەبوو. زیاتر گرینگیی بە من دا.

بەو جۆرە، بە دوور و درێژی باسی میکانیزمی بازدانی بۆق و سووڕی خوێنی و دڵی کە تا ماوەیەکی درێژ دوای دەرهێنانی لە جەستەی، لە لێدان ناکەوێت و باسی مێش و مەگەزەکانی خۆراکی بۆقم کرد. بۆ ئەوەی خولی پێگەیشتنی هێلکەیەکی ناو حەوزەکە تا ئەو کاتەی دەبێتە بۆق باشتر ڕوون بکەمەوە، داوای قەڵەم و کاغەزم کرد. لە قوتوویەکی زیوینی بە یاقوت نەخشێندراودا دەستەیەک قەڵەمی قامیش هێندرا. سوڵتان زۆر سەرنجی ئەو نیگارانەی دەدا کە من دەمکێشان. هەرچی چیرۆکی بۆق لە خەیاڵمدا مابووەوە، بۆ سوڵتانم گێڕایەوە و ئەویش بە خۆشییەوە گوێی ڕاگرت. هەر ئەوەندەی نۆرە هاتە سەر چیرۆکی ئەو شازادەیەی بۆقێک ماچ دەکات، سوڵتان بۆڵاندی و چارەی گرژ کرد. هیچیش لەو نەوجەوانە گەمژەیە نەدەچوو وەک ئەوەی بەردەوام خۆجە باسی دەکرد. زیاتر لە پێگەیشتوویەکی هۆشمەند دەچوو، بۆیە دەیویست ڕۆژی خۆی بە زانست و هونەر دەست پێ بکات. ئەو چەند ساتە جوانەی بە چارەیەکی گرانەوە بەسەر برد، سوڵتان نیگاری بۆقەکانی بە دەستەوە گرتبوو، دواجار بە منی گوت: "من هەر لە زووەوە گومانم کردبوو تۆ چیرۆکەکانی بۆ دەئافرێنیت. کەواتە هەر خۆتیش نیگارەکان دەکێشیت!" پاشان لە بارەی بۆقی سمێڵدارەوە پرسیاری لێم کرد.

پێوەندیم لەگەڵ سوڵتاندا ئا بەو جۆرە دەستی پێ کرد. ئیدی هەموو جارێک منیش لەتەک خۆجەدا بۆ کۆشک دەچووم. ڕۆژانی سەرەتا، خۆجە زیاتر بێدەنگیی هەڵدەبژارد و بەزۆری هەر من و سوڵتان قسەمان دەکرد. ئەو کاتانەی لەگەڵ سوڵتاندا سەبارەت بە خەون و نیگەرانی و ڕابردوو، و داهاتووی دەدواین، بیرم دەکردەوە ئەم پیاوە قسەخۆش و هۆشمەندەی بەرامبەرم بە چ پێوانەیەک بەو سوڵتانە بچوێنم کە سالانێک بوو خۆجە بۆ منی باس دەکرد! لە میانەی پرسیاری وەستایانە و فرت و فێڵە بچووکەکانییەوە تێ دەگەیشتم سوڵتان بە پشتنبەستن بەو کتێبانەی پێشکێشی کراوە، بەپەرۆش بوو بزانێت خۆجە تا چ ڕادەیەک خۆجەیە و تا چ ئەندازەیەک منە. منیش تا چ ئاستێک منم و تا چ ڕادەیەکیش خۆجەم. خۆجەش، لەو کاتەدا سەرقاڵی تۆپ و لوولە درێژەکانی ئامادەکراو بۆ لە قاڵبگرتن بوو، هیچ گوێی بەم پەرۆشییانەی سوڵتان نەدەدا و بە شتی پڕوپووچی دەزانی.

شەش مانگ دوای دەست بەکاربوونمان لە تۆپەکاندا، هەواڵ گەیشتە خۆجە کە سەرداری تۆپخانە، لەبەر ئەوەی لووتمان لە کاری ئەو ژەندووە، بە قیندا چووە و داوای کردووە یان پۆستەکەی لێ وەربگرنەوە، یاخۆ ئێمەی شێت کە نیازمان وایە بەبیانووی داهێنانی شتێکی نوێوە شکۆی تۆپخانە بخەینە ژێر پێوە، لە ئەستەنبوڵ شار بەدەر بکرێین. ئەم هەڵوێستە، خۆجەی زۆر نیگەران کرد، بەڵام هیچیش خۆی ماندوو نەکرد بۆ دۆزینەوەی ڕێگەیەک بۆ لە یەککگەیشتن لەگەڵ سەرداری تۆپخانە، چونکە پێ دەچوو ئامادە بێت بۆ ڕێککەوتن. دوای مانگێکیش، ئەو ڕۆژەی سوڵتان دەستووری دا بۆ پەرەپێدانی چەک کەڵک لە ئامێری تری جگە لە تۆپ وەربگرین، خۆجە هیچ بەسەر خۆی نەهێنا. ئیدی هەردووکمان دەمانزانی تۆپ و لوولەی تازە لە قاڵبدراومان جیاوازییەکی ئەتۆیان لەگەڵ کۆنەکانی چەندین ساڵ لەمەوبەردا نییە.

بەو جۆرە، بە بۆچوونی خۆجە، پێمان نابووە قۆناغێکی نوێ، دەبوو هەموو شتێک لە نووکەوە ڕێک بخەینەوە و خەیاڵ بئافرێنین. بەڵام من لەبەر ئەوەی

ئاشنای هەڵچوون و خەیاڵەکانی بووبووم، شتی نوێ بۆ من لەو نێوەندەدا تەنیا ناسینی سوڵتان بوو. ئەویش بەناسینی ئێمە دڵخۆش بوو. وەک باوکێکی بەسەرنج کە دوو برای بەشەڕهاتوو لەسەر تێکەڵکردنی گوللە شووشەکانیان لە یەک جیا دەکاتەوە و پێیان دەڵێت: "ئەمە هی تۆیە و ئەوەش هی تۆیە"، سوڵتانیش چاودێریی قسە و هەڵسوکەوتی ئێمەی دەکرد و ئێمەی لە یەکدی جیا دەکردەوە. ئەم چاودێریکردنە، هەندێک جار منداڵانە و جاروباریش زیرەکانە دەهاتە بەرچاوم و منی نیگەران دەکرد. خەریک بوو بڕوا بکەم کەسایەتیی من بێ ئاگاداریی خۆم، لێم جیا بووەتەوە و ئاوێتەی کەسایەتیی خۆجە بووە. کەسایەتیی خۆجەش بەهەمان شێوە لەو جیا بووەتەوە و ئاوێتەی کەسایەتیی من بووە. سوڵتانیش زۆر بەباشی لەم ئافراندنە خەیاڵییە تێ گەیشتبوو، بۆیە ئێمەی لە خۆمان باشتر دەناسی.

لە کاتی لێکدانەوەی خەونەکانیدا، یان لە باسکردنی چەکەکەدا کە تا ئەو کاتە تەنیا لە خەیاڵماندا بوونی هەبوو، سوڵتان لەپڕ ڕادەوەستا، ڕووی لە یەکێکمان دەکرد و دەیگوت: "نەخێر، ئەمە بیرۆکەی تۆ نییە، هی ئەوە." جاروباریش جووڵەمانی لە یەک جیا دەکردەوە: "ئێستا تۆ وەک ئەو دەڕوانیت. وەک خۆت بڕوانە!" کاتێکیش من بە سەرسووڕمانەوە بزەیەکم بۆی دەکرد، ئەو دەیگوت: "ئاوا دروستە، ئافەرین. ئەرێ ئێوە هیچ سەیری خۆتان کردووە لە ئاوێنەدا؟" لێمانی دەپرسی داخۆ هەریەکەمان لە بەردەم ئاوێنەدا تا چ ڕادەیەک دەتوانێت خۆی بێت و خۆی ڕابگرێت. جارێکیان دەستووری دا هەموو ئەو لێکۆڵینەوە و کتێبی ئاژەڵان و ساڵنامانە بهێنن کە ساڵانێک بوو بۆیمان دەنووسی و بۆیمان دەنارد. بەدەم هەڵدانەوە و خوێندنەوەی پەڕەکانەوە گوتی: "کوێی کتێبەکان کێ نووسیویەتی و کوێیشی کامتان خۆی خستۆتە شوێنی ئەوی تر و بەخەیاڵی خۆیدا هێناوە؟" بەڵام ئەوەی خۆجەی کەللەیی کرد و منیشی خستە ژێر جادووی خۆیەوە و سەرم لێی سووڕما، لاساییکەرەوەیەک بوو سوڵتان لە ئامادەبوونی ئێمەدا بانگی کرد.

ئەو کابرایە نە ڕووخساری و نە جەستەی بە ئێمە نەدەچوو. باڵاکورت و

قەڵەو بوو. جلوبەرگیشی جۆرێکی تر بوو، بەڵام هەر ئەوەندەی دەستی کرد بە قسە، من ترسم لێ نیشت: کتومت ئەوەی دەدوا، دەتگوت ئەو نییە و خۆجەیە. جۆری ئەو، وەک ئەوەی نهێنییەک بە گوێی سوڵتاندا بچرپێنێت، خۆی لێ نێزیک دەخستەوە. وەک ئەو، بە نواندنی ڕەفتارێکی ورد و بەدەم بیرکردنەوەوە دەچووە سەر وردەکارییەکان و تۆنی دەنگی خۆی گران دەکرد. کتومت وەک ئەو دەکەوتە بەر جۆش و خرۆشی وتەکانی خۆی و بۆ قایلکردنی کەسی بەرامبەر تا هەناسەی لێ دەبڕا، بەخێرایی دەست و قۆڵی بەکار دەهێنا. کابرا، ئەگەرچی لە قسە کردندا تۆنی دەنگی خۆجەی وەرگرتبوو، بەڵام باسی ئەستێرە، یان پرۆژەی چەکی لە ئەقڵ بەدەری نەدەگێڕایەوە، بگرە ناوی خواردنەکانی چێشتخانەی کۆشک و ناوی ئەو کاری و بەهاراتانەی دەهێنا کە بۆ لێنانیان پێویست بوون. سوڵتان پێ دەکەنی، ڕووخساری خۆجە ڕەش داگەڕابوو، یارۆی لاساییکەرەوەش بە ژماردنی یەک بەیەکی وێستگەکانی نێوان ئەستەنبوڵ و حەڵەب درێژەی بە گێڕانەوەی خۆی دا. پاشان سوڵتان داوای لێ کرد دەمەلاسکەی من بکاتەوە. ئەو کابرایە کە بە سەرسووڕماوی و بەدەمی داچەقیوەوە سەیری منی دەکرد، هەر کتومت خۆم بووم: بودەڵەیەکم لێ دەرچووبوو. ئەو دەمەی سوڵتان داوای لێ کرد لاسایی کەسێک بکاتەوە نیوەی خۆجە بێت و نیوەی من بم، من وەک جادووم لێ کرابێت، وا بووم: بەدەم سەیرکردنی جووڵەکانی کابراوە، منیش وەک سوڵتان لە ناخەوە دەمویست بڵێم: "ئەوە منم و ئەویشیان خۆجەیە"، بەڵام کابرای لاساییکەرەوە بە دەست ئاماژەی بۆمان دەکرد و خۆی ئەو ئەرکەی ڕادەپەڕاند. سوڵتان دوای ئەوەی دەستووری دا و کابرای نارده دەرەوە، فەرمانی دا بە قوڵی بیر لەو شتە بکەینەوە.

ئەرێ ئەم قسەیە چ واتەیەکی دەگەیاند؟ ئێوارە بە خۆجەم گوت سوڵتان زۆر لەو کەسە ژیرترە کە چەندین ساڵە تۆ بۆم باس دەکەیت. پێم گوت سوڵتان ئێستا بۆخۆی بەو ئاراستەیەدا دەڕوات کە تۆ دەتویست بیهێنیتە سەری، کەچی ئەو دیسان هەڵچوو، تووڕەیی دەربڕی و دەمی کەفی کرد. ئەمجارەیان

مــافم دایێ، چونکە هونەری یارۆی لاســاییکەرەوە شــتـێک نەبوو بەرگــەی بگیرێت. خۆجە گوتی لەمەودوا ئەگەر زۆری لێ نەکەن، پێ نانێتە ناو کۆشک و سەرای سوڵتانەوە. لە کاتێکدا دوای چەندین ساڵ چاوەڕوانیکردن ئەم هەلەی دەست کەوتبوو، ئیدی نیازی نەبوو بچێتە ناو ئەو گەمژانە و خۆی پەرێشان بکات. لەبەر ئەوەی من خولیاکانی سوڵتانم دەزانی و بە هۆش و ژیریش هێندەی دەمامکدارەکانم لە دەست دەهات، ئیدی پێویست بوو من لە جێی ئەو بۆ کۆشک بچم.

ئەگەر بە سوڵتانم گوت خۆجە نەخۆشە، بڕوای پێم نەکرد. گوتی: "با بزانین! با بۆ چەکەکە کار بکات." بەو جۆرە ماوەی ئەو چوار ساڵەی خۆجە سەرقاڵی داڕشتنی نەخشەی چەک و جێبەجێکردنی بوو، من دەچوومە کۆشک و سەراکان. ئەویش وەک جارانی من، لەگەڵ خەیاڵەکانی خۆیدا لە ماڵ دەمایەوە.

ماوەی ئەو چوار ساڵە فێر بووم ژیان تەنیا بریتی نییە لە چاوەڕوانی، بگرە شتێکە دەتوانرێت چێژی لێ وەربگیرێت. ئەوانەی دەیانبینی سوڵتان هێندەی خۆجە نرخ و بەهای منیش دەزانێت، منیان بۆ هەموو تەدارەک و ئاهەنگێک بانگ دەکرد. ڕۆژێک کچی وەزیر شووی دەکرد؛ ڕۆژێکی دی، منداڵێکی تری سوڵتان لە دایک دەبوو؛ دواتر کوڕەکانیان خەتەنە دەکرد؛ ڕۆژی دواتر، بەبۆنەی وەرگرتنەوەی قەڵایەک لە مەجەرییەکان ئاهەنگیان دەگێڕا؛ پاشان شازادە دەستی بە خوێندن دەکرد. هێشتا ئەم بۆنانە نەدەبڕانەوە نەدەهات ئەوەندەت دەزانی ئاهەنگی ڕەمەزان و جەژن دەهاتە پێشەوە. لەو ئاهەنگانەدا کە هەندێکیان چەند ڕۆژێکی دەخایەند، هێندە گۆشتی چەور و پلاوم لووش دابوو، ئەوەندە شێر و وشترمرغ و بووکی دەریای لە شەکر و فستق دروستکراوم ماشیبووەوە، لە ماوەیەکی کورتدا قەڵەو بووبووم. زۆربەی ڕۆژان تا وزەم تێدا دەما، سەیری بەزمی ڕۆژم دەکرد: یەکترهێنان و بردنی زۆرانبازانی خۆ چەور کردوو؛ سەمای ئەو تەنافبازانەی پەتیان لە نێوان منارەکاندا هەڵدەواسی و بە خۆیان و دارەکانی دەستیانەوە بەسەریدا

دەپەرینەوە، یان بە ددان ناڵی ئەسپیان دەشکاند و چەقۆ و شیشیان بە ئێرە و ئەوێی خۆیاندا دەکرد؛ جادووگەران، کاتێک مار و کۆتر و مەیموونیان لە جبەکانیان دەردەهێنا و لە چاو تروکاندنێکدا پەرداخەکانی دەستمان و پارەی گیرفانمانیان دەفڕاند؛ گەمەی بووکەشووشەی قەرەگوێز و هاجیڤات، چونکە من شەیدای جنێوەکانیان بووم. شەوانە، ئەگەر بەزمی ئاگربازی نەبوایە، لەگەڵ دۆستە نوێیەکانمدا کە زۆربەیانم لە هەمان ڕۆژدا دەناسی، دەچووینە یەکێک لەو هەموو کۆشک و سەرایەی خەڵکەکە ڕوویان تێ دەکرد. دوای چەندین سەعات شەراب خواردنەوە و گوێگرتن لە موزیک، پیاڵەم لە پیاڵە دەدا و چێژم وەردەگرت لە سەیرکردنی سەماکارانی شۆخی لاساییکەرەوەی ئاسکی نووستوو، کوڕانی جوانپۆش و گەمەبازی سەر ئاو، لە گوێگرتن لەو گۆرانیبێژانەی بە دەنگی پڕ لە بۆکروزیان گۆرانی پڕ لە واتا و ئاوازیان دەچڕی.

پەیتاپەیتاش دەچووم بۆ بارەگای بالیۆزان و زۆر پەرۆشیان بووم. دوای سەیرکردنی سەمایەکی باڵێ کە تیایدا کچان و کوڕانی شۆخ بەیەکدا دەهاتن و دەچوون، یان پاش گوێگرتن لە نوێترین چریکەی تیپێکی موزیکی لە ڤینیسیاوە هاتوو، چێژم لە ناوبانگی خۆم وەردەگرت کە تا دەهات زیاتر دەنگی دەدایەوە. ئەو ئەوروپاییانەی لە باڵیۆزخانەکان کۆ دەبوونەوە، لە بارەی ڕووداوە ترسناکەکانی ژیانمەوە پرسیاریان دەکرد. بەپەرۆش بوون بزانن چەند ئازارم چەشتووە، چۆن خۆم ڕاگرتووە و چۆن هێشتا بەرگە دەگرم. من ئەوەم لێ دەشاردنەوە کە سەرتاپای ژیانم لە نێوان چوار دیواردا بەدەم خەوەنووچکە و نووسینەوەی کتێبی بێ واتاوە بەسەر بردووە. کتومت وەک ئەوەی لەگەڵ سوڵتان دەمکرد، بۆ ئەمانی خوازیاری ئاشنابوونی ئەم وڵاتە سەیرەش چەندین بەسەرهاتی خەیاڵی و لە ئەقڵ بەدەرەم دەگێڕایەوە. بەتەنیا ئەو کچە گەنجانە نا کە دەهاتن بۆ ئەوەی پێش شووکردن باوکانیان ببینن، یان ئەو ژنانەی باڵیۆزان کە چاوبڕکێیان لەگەڵم دەکرد، بگرە سەرجەم باڵیۆزانی بەشان و شەوکەت و نووسیاران بە سەرسامییەوە گوێیان دەگرت

بۆ چیرۆکی خوێناویی ئاین، درندەیی، فێڵ و تەڵەکەبازیی ئەڤین و حەرەمسەرا کە سەرلەبەریان زادەی خەیاڵی خۆم بوون. ئەگەر هەر زۆریشیان بۆم بهێنایە، هەر لەوێ یەک دوو نهێنیی دەوڵەتم لە خەیاڵی خۆمدا دەئافراند و بە گوێیانمدا دەچرپاند، چەند خوویەکی پێشتر لای هیچ کەس نەزانداراو و سەیرم دەدایە پاڵ سوڵتان. ئەو کاتانەی ئەوان داوای زانیاریی زیاتریان دەکرد، من چێژم لەوە دەبینی بەرگێکی نهێنی لە خۆمەوە بئاڵێنم. وەک کەسێک خۆم پێشان دەدا نەتوانێت هەموو شتێک بدرکێنێت و قوڕوقوپم دەکرد. خۆم دەخستە دۆخێکی بێدەنگەوە، ئەمەش هێندەی تر ئەو بودەڵانەی تووشی ماخۆلان دەکرد کە خۆجە دەیویست بیانکات بە پێشەنگ بۆ ئێمە. بەڵام دەمزانی لە نێوان خۆیاندا بەچرپە باس لە پێوەندیی من بە پرۆژەی نهێنی و گەورەی زانستییەوە و بە بیرۆکەی چەکێکی نادیارەوە دەکەن و دەڵێن پارە و پوولێکی زۆری تێ دەچێت.

ئێواران، ئەگەر دوای بینینی ئەو گشت لەش و لارە جوانە و مەستبوون بە جۆرەکانی خواردنەوە، لە کۆشک و سەراکانەوە بۆ ماڵ دەگەڕامەوە، دەمبینی وا خۆجە بەدیار هەمان مێزەوە دانیشتووە کە بیست ساڵی ڕەبەق بوو پێکەوە کارمان لەسەری دەکرد. گوڕێکی کاری بە خۆی بەخشیبوو من پێشتر لەودا بەدیم نەکردبوو. سەر مێزەکە پڕ بوو لە دەستنووسی ئاڵۆز و بزرکاو، لێکۆڵینەوە و نیگاری سەیری سەمەرە و من هیچ لە واتایان تێ نەدەگەیشتم. داوای لێم دەکرد ئەو ڕۆژە چیم کردووە و چیم دیوە، بۆی بگێڕمەوە. دوای تاوێکی کورت ڕقی لە هەموو ئەو بەزم و ئاهەنگانە هەڵدەسا، بەکاری بێ ئابڕوویی و بێ ئەقڵیی دادەنا، قسەی پێم دەبڕی و بەدەم قسەکردنەوە لەمەڕ "ئێمە" و "ئەوان"، دەستی دەکرد بە گێڕانەوەی پرۆژە و نەخشەکانی خۆی.

جارێکی تریش بایدایەوە و دەیگوت هەموو شتەکان پێوەندییان بە ناواخنی مێشکمانەوە هەیە، دەیگوت سەرلەبەری پرۆژەکەی لەسەر ئەو بنەمایە دارشتووە. لەبەر سەرقاڵیی خۆی، زۆر بە شپرزەیی باسی هاوشێوەی دۆلابێکی پڕ لە وردەواڵە و شتی تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد کە بەلای ئێمەوە

واتای ناواخنی مێشکی دەگەیاند. بەڵام شتی مایەی حاڵی نەبوون بۆ من ئەوە بوو داخۆ چۆن دەتوانێت ئەو چەکەی کە هەموو ئومێدی خۆی و ئێمەی لەسەر بنیاتنراوە، بەرجەستە بکات! پێم وا بوو نە کەسێکی تر و نە خۆیشی، وەک هەندێک جار لە خەیاڵی خۆمدا لێکم دەدایەوە، سەر لەم پرسە دەرناکات. کەچی ئەو دەیگوت ڕۆژێک دێت کەسێک مێشکمان بکاتەوە و هەموو بیرۆکە و خولیاکانی ناویان پشتڕاست بکاتەوە. خۆجە دەیگوت ئەو کاتەی لە ڕۆژانی پەتادا بەجووتە دەچووینە بەردەم ئاوێنە، ئەو پەی بە ڕاستییەکی زۆر گەورە بردووە و بیرۆکەی چەکەکەش لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە! من کەوتبوومە ژێر کاریگەریی وتە پڕ لە جۆشەکانی ئەوەوە، گەرچی نەشمتوانیبوو بەتەواوی لێیان تێ بگەم. دواتر بە نووکی پەنجە گرژبووەکانی، لەسەر کاغەزەکان بیچمێکی نامۆ و ناڕوونی پێشانم دا.

ئەو بیچمە لە هەر پێشاندانێکدا دەمبینی تۆزێک گەشەی کردووە و دەتگوت شتێکم بیر دەخاتەوە. پاش ئەوەی سەیری پەڵەی ڕەشی نیگارەکەم کرد کە دەتوانم بە "ئیبلیسی" ئاماژەی بۆ بکەم، بۆ ساتێک پێم وا بوو دەستبەجێ دەتوانم بڵێم ئەو شتەی دەیبینم لە چی دەچێت، بەڵام وەک ئەوەی جادووم لێ کرابێت، لەپڕ نقەم لە خۆم بڕی، چونکە دەترسام هۆشم بەزمێکم پێ بگێڕێت. بەدرێژایی چوار ساڵ بەردەوام ئەو بیچمەم دەبینی، سەیرم دەکرد وردەکارییەکانی لە نێوان کاغەزەکاندا پەرت و بڵاو بوونەتەوە، هەرجارەی کەمێک پەرەی دەسەند و دوای لووشدانی ڕەنجی مرۆڤ و هەموو ئەو پارانەی بە ساڵان بۆی کرابووەوە، دواجار خەریک بوو بەرجەستە دەبوو. جاری وا هەبوو لای خۆمەوە بیچمەکەم بە شتێک دەچوواند جاروبار لە ژیانی ڕۆژانەدا، هەندێک جار لە خەونەکانماندا، یان لە ساڵانی ڕابردوودا کاتێک بیرەوەریی خۆمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، بەرچاوم کەوتبێت، یان لە شتێک دەچوو پێشتر باسمان کردبێت، بەڵام نەمدەتوانی هیچ هەنگاوێکی تر بنێم بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو شتانەی بە مێشکمدا ڕادەبووردن. سەرم بۆ ناڕوونیی بیرەکانم دانەواند و لە خۆتوخۆڕایی چاوەڕێ بووم چەکەکە خۆی نهێنیی خۆیم بۆ ئاشکرا بکات.

چوار ساڵ دواتر، پەلە ڕەشەکە، ئەو دیمەنە ترسناکە، ئەو داهێنانە سەیرەی هێندەی مزگەوتێک گەورە بوو، سەرانسەری ئەستەنبوڵ باسیان دەکرد، لە کاتێکدا بە بۆچوونی خۆجە چەکێکی ڕاستەقینەی لێ دەرچووبوو، هەرکەس لای خۆیەوە بە شتێکی دەچوواند. منیش نوقمی ئەو وردەکارییانە بووم کە خۆجە لە ڕابردوودا سەبارەت بە سەرکەوتنی ئەو چەکە لە داهاتوودا بۆی باس کردبووم.

ئەو دەمانەی دەچوومە کۆشک، وەک کەسێک هەوڵ بدات خەونێکی بیر بکەوێتەوە کە مێشکی لەبەر کەللەڕەقی بخوازێت لە بیری بکات، هەوڵم دەدا هەموو ئەو وردەکارییە بریقەدار و ترسناکانە بۆ سوڵتان دووبارە بکەمەوە و باسی ئەو پێچکە، چەرخ، قوببە، بارووت و ئامێری بەرزکردنەوانەی بۆ بکەم کە مەگەر هەر خوا بزانێت خۆجە چەند جار بۆ منی دووبارە کردبووەوە. وشەکان، دەربڕینی من نەبوون، لە قسەکانیشمدا هەست بە گەرمیی وتە ئاگرینەکانی خۆجە نەدەکرا، بەڵام سەرباری ئەوەش دەمبینی کاریگەری لەسەر سوڵتان دادەنێت. گەشانەوەی ئومێدی ئەو پیاوە هۆشمەندە بە بڕێک قسەی بێ سەروبەر و نەشئەی سەرکەوتنی خۆجە و شیعرەکەی سەبارەت بە ڕزگاربوون کە ئەرکی من ئەوە بوو تەنیا بە زیاد پێوەنانەوە بۆی بگێڕمەوە، ئومێدی بە منیش دەبەخشی. سوڵتان گوتی ئەو خۆجەیەی لە ماڵەوەیە، تۆیت. ئەم گەمە ژیرانەیەی سوڵتان مێشکی منی تێک دابوو، بەڵام من ئیدی پێی ڕاهاتبووم. هەر جارێک منی دەخستە جێی خۆجە، پێم وا بوو هیچ تێ نەگەم باشترە، چونکە دوای کەمێک دەیگوت تۆ خۆجەت فێری هەموو شتەکان کردووە. دەیگوت ئەم شل و خاوەی ئێستا تۆ نیت، ئەوەی خۆی فێری هەموو شتەکان کردووە، لە مێژە چووەتە پێستی ئەوەوە! من زیاتر پێم خۆش بوو بچینە سەر باسی ئاهەنگەکانی هەمان ڕۆژ، ئاژەڵ، داوەت و داوەتکاری، یان خۆپیشاندانی خاوەنکاران و پیشەکاران کە لەو سەروبەندەدا تەدارەکی بۆ ساز دەدرا. دواتر سوڵتان گوتی: هەموو کەسێک دەزانێت تۆ لە پشت پرۆژەی ئەم چەکەوەیت.

ئەوەی هەرە زیاد منی دەترساند، ئا ئەمە بوو. چەندین ساڵ بوو خۆجە لە چاوان ون بووبوو. دەکرێت بگوترێت بەیەکجاری لە بیر کرابوو. ئەوەی لە کۆشک و سەرا و ناو شار و لە تەنیشت سوڵتانەوە دەبیندرا، هەر من بووم. ئیدی وای لێ هاتبوو ئیرەییان پێ دەبردم! نەک بەهۆی ئەوەی داهاتی ئەو هەموو گوند و باخی زەیتوون و خانە بۆ پرۆژەی چەکێکی نادیار تەرخان کرابوو، هەموو رۆژێکیش قسە و قسەڵۆکی زیاتری لە بارەوە دەکرا، یان من هێندە لە سوڵتانەوە نێزیک بووم، بگرە ئێمە لە رێی ئەم چەکەوە لووتمان لە کاری ئەوانی تر دەژەنی و بەهۆی ئەوەشی من گاور بووم، ددانیان لێم جیڕ دەکردەوە. کاتێکیش نەمتوانی چی تر خۆم لە ئاست بووختانەکانیاندا کەڕ بکەم، نیگەرانی و خەمەکانی خۆمم بۆ خۆجە و سوڵتان گواستەوە.

بەڵام زۆر گوێیان پێم نەدەدا. خۆجە تا تەوقی سەر نوقمی پرۆژەکەی بوو! وەک چۆن بەسالاچوویەک تاسەی تافی لاوی دەکات، منیش تاسەی هەڵچوونی ئەوم کردبوو. لەو چەند مانگەی دواییدا لەبەرەوە وردەکاریی زیاتری دەخستە سەر پەڵە رەش و نادیارەکەی سەر کاغەزەکان، گەشەی پێی دەکرد و وەک من لێی ترسابووم، شتە سەمەرەکە گەیشتە قۆناغی لە قاڵبگرتن، پارە و پوولێکی بێ ئەژماری خەرج کرد و پۆڵای ئەستوری لە قاڵب دا، بەڵام هیچ گوللەیەکی پێوە نەدەچوو. گوێشی لەو قسە خراپانە نەدەگرت کە من بۆیم دەگێڕایەوە. تەنیا بایەخی بە بارەگای باڵیۆزانی بیانی دەدا و دەیپرسی: "ئەو باڵیۆزانە چۆن مرۆگەلێکن، مێشکیان چۆن کار دەکات، ئایا هیچ بیرۆکەیەکیان لە بارەی ئەم چەکەوە هەیە؟" لە هەمووشی گرینگتر: "بۆچی سوڵتان بەهیچ جۆرێک بیر لەوە ناکاتەوە بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەردەوامی دەوڵەت باڵیۆز رەوانەی ئەو وڵاتانە بکات؟" هەستم دەکرد خۆی ئارەزووی لەو ئەرکە هەیە و خوازیارە لە دەست گەمژەکانی ئێرە رزگاری بێت. بەڵام تەنانەت لەو رۆژانەشدا کە لە بەرجەستەکردنی نەخشەکانیدا ئاستەنگ دەهاتە رێی و قاڵبەکانی درزیان تێ دەکەوت، یان لەبەر ترسی پیا رانەگەیشتنی پارە تووشی بێ ئومێدی دەبوو، بە راشکاوی ئەم ئارەزووەی خۆی دەرنەدەبڕی.

تەنیا یەک دوو جار نەبێت قسە لە دەمی دەرپەڕی و گوتی دەیەوێت پێوەندی لەگەڵ زانایانی "ئەوان"دا دابنێت. پێی وا بوو لەوانەیە ئەوان لە ڕاستییەکانی ناو مێشکیی ئێمە بگەن. دەیویست لەگەڵ زانایانی ڤینیسیایی، فلاندەرستانی، یان زانایانی هەر وڵاتێکی تر کە لەو ساتەدا بەخەیاڵیدا بهاتبایە، نامە بگۆڕێتەوە. لەبەر خۆیەوە دەیپرسی: "تۆ بڵێیت باشترینی ئەوان کێ بێت، لە کوێ دەژین، چۆن نامەیان لەگەڵدا دەگۆڕدرێتەوە؟" لە منی دەپرسی ئایا دەکرێت ئەم پرسیارانە ڕووبەڕووی باڵیۆزەکان بکەمەوە؟ لەو ڕۆژانەی کۆتاییدا، کاتێک چەکەکە لە قۆناغی بەرجەستەبووندا بوو، من خووم دابووە ئاهەنگ و ڕابواردن و زۆر خۆم لە قەرەی نەدەدا، ئەو تکایەشم لە بیر کرد، چونکە ڕەشبینی لێ دەچۆڕا و دوژمنانی شاد دەکرد.

سوڵتانیش خۆی لە ئاست قسە و قسەڵۆکی دوژمنانمان کەڕ کردبوو. لەو ڕۆژانەدا خۆجە لە پیاوی ئازا دەگەڕا بۆ تاقیکردنەوەی چەکەکە بچنە ناو تۆپەڵی پۆڵای ترسناکەوە و لە ناو ژەنگ و بۆنی ئاسنی قوڕگ سووتێندا چەرخەکان هەڵسووڕێنن. منیش گازندەم لە دەست واتەواتەکان کرد، بەڵام سوڵتان هیچ گوێی بە قسەکانم نەدا. وەک هەردەم قسەکانی خۆجەی بە من دووبارە کردەوە. متمانەی پێی هەبوو، لە هەموو شتێک ڕازی بوو، هیچ پەشیمان نەبوو لەوەی پشتی پێی بەستووە. لە پای هەموو ئەمانەش سوپاسی منی دەکرد. بێگومان لە هەمان سۆنگەوە: چونکە من خۆجەم فێری هەموو شتێک کردووە. ئەویش وەک خۆجە باسی لە ناوەڕۆکی مێشکمان دەکرد. هاوتەریب لەگەڵ ئەو بابەخ پێدانەدا، بابەتێکی تر دەهاتە ئاراوە. کتومت چۆن خۆجە سەردەمانێک لە منی دەپرسی، سوڵتانیش پرسیاری ئەوەی دەکرد داخۆ لەوێ، لەو وڵاتانە، لە وڵاتی پێشووی من، خەڵک چۆن دەژین؟

خەیاڵی زۆر و زەوەندم بۆی دەگێڕایەوە. بەهۆی دووبارەکردنەوەی لەسەریەکیان، ئەمڕۆ بڕوام بە زۆربەی ئەو خەیاڵانە هەیە، بەڵام ئەوەی بۆم نابڕێتەوە سەریەک ئەوەیە داخۆ خەیاڵەکانم بەسەرهاتەکانی تافی لاویم بوون، یاخۆ ئەو بەسەرهاتە خەیاڵکردانە بوون کە لە هەر دانیشتنێکمدا لە بەردەم

مێزەکەمدا بۆ نووسینەوەی کتێبەکەم بەخەیاڵمدا هاتبوون و بە نووکی پێنووس تۆمارم کردبوون؟ هەندێک جار لە جێدا یەک دوو درۆی شیرینم بۆ دەهات و دەمخستنە سەر چیرۆکەکانم. برێک چیرۆکیشم هەبوو بە تێپەڕبوونی کات گەشەم پێیان کردبوو. بەردەوام دووپاتم دەکردەوە خەڵکی ئەوێ کوژمکەی زۆر بە جلوبەرگیانەوە هەیە، چونکە سوڵتان زۆری حەز لەم چیرۆکە دەکرد. چیرۆکی ئەوتۆشم دەگێڕایەوە، خۆیشم نەمدەزانی داخۆ ڕووداوەکانی ناویان بەشێکن لە بیرەوەرییەکانم، یاخۆ زادەی خەیاڵی خۆمن؟ بەڵام یەک دوو ڕاستیش هەبوو کە بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵ فەرامۆشم نەکردبوون: ئەو بابەتانەی لە کاتی خواردنی نانی بەیانیان لە ژێر دار مازووەکاندا لەگەڵ دایکم و باوکم و خوشک و براکانمدا لە بارەیانەوە دەدواین! سوڵتان کەمترین بایەخی بەو بابەتانە دەدا. جارێک بە منی گوت لە ڕاستیدا هەموو جۆرەکانی ژیان هاوشێوەی یەکترن. نازانم لەبەر چی بوو، بەڵام ئەم قسەیە منی ترساند. گوزارەیەکی ئیبلیسی کەوتە سەر ڕووخساری سوڵتان پێشتر و من پێوەم نەدیبوو. دەمویست واتەی ئەو قسەیەی لێ بپرسم. پاشان بەترسەوە سەیری ڕووخساریم کرد و لە ناخەوە دەمویست بڵێم "من منم" پێم وا بوو ئەگەر ئەو قسە قۆڕەی پێ بڵێم، ئەوا دەمتوانی گەمەی هەموو ئەو فیتنەبازانەی بەمەبەستی کردنی من بە کەسێکی تر خەریکی فێڵ و تەڵەکەبازین و گەمەکانی خۆجە و سوڵتان پوچەڵ بکەمەوە و خۆم وەک خۆم بە ئاسوودەیی درێژە بە ژیان بدەم. کەچی جۆری ئەوانەی لە ترسی ئەوەی نەبادا ئاسوودەیی خۆیان بخەنە مەترسییەوە، خۆیان لە هەموو جۆرە وتەیەکی ناڕوون بەدوور دەگرن، بە ترسەوە بێدەنگ بووم. ئەمە لە بەهاردا بوو، لەو ڕۆژانەدا کە خۆجە کاری دروستکردنی چەکەکەی بە ئەنجام گەیاندبوو، بەڵام نەیتوانیبوو پیاوی پێویست بۆ بەگەڕ خستنی کۆ بکاتەوە. بەتەواوی سەرمان سووڕما ئەگەر دوای ماوەیەکی کورت بیستمان سوڵتان بە خۆی و بە سوپاوە بۆ شەڕ بەرەو پۆڵۆنیا بەڕێ کەوتووە. بۆچی چەکە دوژمن تەفروتوناکەرەکەمانی بۆ شەڕ نەبردبوو؟ بۆچی منی لەگەڵ خۆیدا نەبردبوو،

ئایا چی دی متمانەی پێمان نەمابوو؟ ئێمەش وەک هەموو ئەوانەی لە ئەستەنبوڵ مابوونەوە، باوەڕمان وا بوو سوڵتان بۆ ڕاو چووبێت، نەک بۆ شەڕ. خۆجە خۆشحاڵ بوو بەوەی ساڵێکی تریش کاتی کەوتبووە دەست. منیش هیچ کار و ڕابواردنێکم بۆ نەمابووەوە. پێکەوە بۆ چەکەکە دەست بەکار بووین.

ڕەنجی زۆرمان کێشا بۆ دۆزینەوەی پیاو بۆ بەکارخستنی چەکی زەبەلاحمان، بەڵام کەس خۆی لە قەرەی چوونە ناو ئامێرەکەمان نەدەدا، چونکە زۆر ترسناک دەهاتە بەرچاو و کەس نەیدەزانی چییە. خۆجە دەیگوت پارەیەکی زۆر دەدات. دەڵاڵمان خستە ناو شار. پیاوانی خۆمان بەردایە دەورووبەری کارخانەی دروستکردنی کەشتی و تۆپخانە، لە ناو بێکاری چایخانەکان و سەرسەری و سەرکێش و کەسانی سەربەگۆبەند بەدوای پیاودا دەگەڕاین. زۆربەی ئەوانەی دەماندۆزینەوە، ئەگەرچی دەسپێک پێیان بە جەرگی خۆیاندا دەنا و دەچوونە ناو ئەو تۆپەڵە ئاسنەوە، پاش ماوەیەک لە گەرمای ئەو مەگەزە سەمەیەرەدا قرچەقرچ دەپیشان، لەبەرامبەر سووڕاندنی چەرخەکان خۆیان پێ ڕانەدەگیرا و هەڵدەهاتن. لە کۆتاییی هاویندا، ئەو کاتەی توانیمان ئامێرەکە بخەینە جووڵە، هەموو ئەو دراوەی بەدرێژاییی ئەو ساڵانە بۆ ئەم کارە پاشەکەوت کرابوو، تەواو بوو. چەکەکەمان، لە نێوان نیگای پڕ لە ترسی کەسانی بەپەرۆش و گاڵەگاڵی سەرکەوتندا، لەسەرخۆ جووڵاند. بە لارەلار چەند تۆپێکی نا بە قەڵایەکی خەیاڵییەوە و دوای ئەوە لە جووڵە کەوت. هاتنی پارە لە گوند و لە باخەکانی زەیتوونەوە درێژەی هەبوو، بەڵام خۆجە بەبیانووی ئەوەی مەسرەفیان زۆر دەبێت، بڵاوەی بە دەستەی پیاوان کرد، ئەگەرچی پاش ماندووبوونێکی زۆر پێکەوەمان نابوو.

زستان بەدەم چاوەڕێکردنەوە بەسەرچوو. سوڵتان دوای گەڕانەوەی لە شەڕ، لە ئەدرنە بارەگای خست، چونکە شوێنێکی زۆر شیرین بوو لەبەر دڵی. تاک و تەنیا بووین، کەس نەبوو لە دوومان بگەڕێت و هەواڵمان بپرسێت. بێکار و بێ دەسەڵات بووین، چونکە کەسێک نەبوو بەیانیان بچینە

کۆشکەکەی، بە گێڕانەوەی چیرۆک و بەسەرهات شادی بخەینە دڵی و کەسێک نەبوو من شەوانە لە کۆشک و سەراکانیدا ڕابوێرم. هەوڵم دەدا کاتی خۆم بە وەرگرتنی دەرزی عود و بە کێشانی نیگارێکی خۆم لەسەر دەستی نیگارکێشێکی لە ڤینیسیاوە هاتوو بەسەر ببەم. خۆجە، چەکەکەی لە قوولەدیبی بە پاسەوانان سپاردبوو، خۆیشی جاروبار دەچوو بۆ بەسەرکردنەوەی. ئەوەش نەبێت بڵێیت شتێکی بۆ ئێرە و ئەوێی زیاد نەکردبێت، بەڵام بەزوویی لەوەش بێزار بوو. لە شەوانی دوایین زستانی هاوبەشماندا باسی چەک و ئەرکەکانی بۆم نەکرد. جۆرێک لە مەلوولی باڵی بەسەردا کێشابوو، نەک لەبەر ئەوەی خولیا و سەودای خۆی لە دەست دابوو، نەخێر، بگرە لەبەر ئەوەی من نەمتوانیبوو جۆشی ئەو بورووژێنم.

شەوانە زۆربەی کاتمان بەدەم چاوەڕێکردنەوە بەسەر دەبرد، چاوەڕێمان دەکرد بایەکە بیخات و بەفر بارین ببڕێتەوە. چاوەڕێی دوایین هاتنی بۆزافرۆش و کوژانەوەی ئاگری ناو سۆپا و بە خەلوزبوونیمان دەکرد. چاوەڕێی کوژانەوەی دوایین چرای پرتەپرتکەری بەری ئەوبەری کەنداوی زێڕین و هاتنی خەوی زراومان و بانگی بەیانیمان دەکرد. لە یەکێک لە شەوانی ئەو زستانەدا کە بەدەگمەن تیایدا دەدواین و بەزۆری خەیاڵمان دەکردەوە، خۆجە لەپڕ بە منی گوت زۆر گۆڕاوم و ئیدی بووم بە کەسێکی تەواو جیاواز. ئاگر لە جەستەم بەربوو، پشتم ئارەقەی دەردا. ویستم وەڵامی بدەمەوە و پێی بڵێم ناهەقیت و من وەک جاران وام و بەیەک دەچین. خوازیار بووم پێی بڵێم پێویستە وەک لە ڕابردوودا دەیکرد، ئێستاش بایەخم پێ بدات و شتی زۆرمان هەیە قسەی لە بارەوە بکەین، بەڵام ئەو ڕاستی دەکرد. بەیانیی ئەو ڕۆژە نیگارەکەی خۆم لای نیگارکێش هێنابووەوە و بە دیواری ژوورەدا هەڵمواسیبوو. چاوم تێبڕی و بۆم دەرکەوت گۆڕابووم، لە ئاکامی خواردنی زۆری میواندارییەوە قەڵەو بووبووم، غەبغەبەم شۆڕ بووبووەوە، ماسولکەمانم سست و جووڵەم گران بووبوو. لە هەمووشی خراپتر، ڕووخسارم بەیەکجاری گۆڕابوو. بەهۆی خواردنەوە و ماچی زۆرەوە لە

بانگهێشتەکاندا، جۆرێک لە بێ ئابڕوویی لە سەر لێوم نیشتبوو. چاوەکانم لەبەر بێ خەوی مۆر هەڵگەڕابوون. وەک کەسانی کەمژەی لە ژیان و دنیا و خۆیان ڕازی، جۆرێک لە ئاسوودەیی لە نیگامدا بەدی دەکرا، بەڵام دەمزانی لە دۆخی نوێی خۆم ڕازیم: بێدەنگ بووم.

دواتر، تا ئەو کاتەی زانیمان سوڵتان ئێمەی بە چەکەوە بۆ شەڕ بۆ ئەدرنە بانگ کردووە، من هەمان خەونم دەبینی: لە ڤینیسیا لە ئاهەنگێکی دەمامکداراندا بووین، ئاهەنگە تێکەڵ و پێکەڵەکانی ئەستەنبوڵی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ. پاش ئەوەی ژنان دەمامکی "ژنە دۆست"یان لەڕووی خۆیان دادەگرت، دایکم و دەزگیرانم لە ئاپۆڕەکەدا دەبینی و ئومێدەوار دەبووم. منیش، بۆ ئەوەی ئیدی بمناسنەوە، دەمامکی خۆم لەسەر ڕووم لا دەبرد، بەڵام ئەوان حاڵی نەدەبوون لەوەی کە من منم. بە دەمامکەکانی دەستیان کە بە دەسکی لاستیکەوە بە دەستیانەوە گرتبوون، کەسێکی تریان لە پشتمەوە پێشانم دەدا. کاتێک ئاوڕم دەدایەوە، دەمبینی ئەو کەسە خۆجەیە و ئەویش دەزانێت من کێم. ئەو پیاوەی وەک خۆجە دەهاتە پێش چاو و من بەمەبەستی ئەوەی بمناسێتەوە، بە ئومێدەوە لێی نێزیک دەکەوتمەوە، بێ ئەوەی شتێکم پێ بڵێت، دەمامکی دادەگرت و لە ژێریدا ڕووخساری گەنجایەتیم دەردەکەوت. ئەمەش منی بە هەستی خۆ بەتاوانبارزان دەترساند و لە خەو ڕایدەچڵەکاندم.

## ١٠

سەرەتای هاوین، هەر ئەوەندەی زانیمان سوڵتان لە ئەدرنە چاوەڕێی خۆمان و چەکەکەمان دەکات، خۆجە کەوتە خۆ. من ئەو کاتە زانیم هەموو شتێکی ئامادە کردووە و بەدرێژاییی زستانیش لەگەڵ پیاوانی دەستەی چەکدا کە پێشتر بڵاوەی پێیان کردبوو، هەر لە پێوەندیدا بووە. دوای سێ ڕۆژ بۆ گەشت ئامادە بووین. خۆجە، وەک ئەوەی بۆ خانوویەکی تر بگوازینەوە، شەوی بەر لە دواین ڕۆژی پێش گەشتی بەدەم گەڕان و هەڵدانەوەی کتێبی کۆن و بەرگ دڕاو، لێکۆڵینەوەی نیوەناچڵ، ڕەشنووسی زەردهەڵگەڕاو و کەلوپەلی ناو ماڵەوە بەسەر برد. زەنگی ژەنگرتووی سەعاتی نوێژەکەی خستەوە کار، تۆزی سەر ئامێرەکانی گەردووناسیی پاک کردەوە. تا دەمەوبەیانی خۆی لە ناو کتێب، پرۆژەی ئامێرەکان و ڕەشنووسەکانی ئامادەکراوی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوومان‌دا بەسەر برد. لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تیشکی ڕۆژدا بینیم وا خەریکی هەڵدانەوەی پەڕە دڕاو و زەردهەڵگەڕاوەکانی ئەو دەفتەرەیە کە من تێبینییەکانی تاقیکردنەوەی یەکەم بەزمی فیشەکبازیی خۆمانم تێیدا تۆمار کردبوو. بە دوودڵییەوە لێمی پرسی: ئایا پێویست دەکات ئەمانە لەگەڵ خۆماندا ببەین؟ کاتێک بینی بێدەنگ ڕاوەستاوم و سەیری دەکەم، بە هەڵچوونەوە دەفتەرەکەی دەستی فڕێدایە سووچێکەوە.

سەرباری ئەوەش، پاش گەشتمان بۆ ئەدرنە لە ماوەی دە ڕۆژدا، زۆر لە یەکترەوە نێزیک بووین، بەڵام ئەو نێزیکبوونەمان لە ئاستی پێوەندیی ساڵانی ڕابردوودا نەبوو. بەر لەهەموو شتێک خۆجە ئومێدی هەبوو. چەکەکەمان بەدەم جیڕەجیڕ و تەقوتۆقەوە لەسەرخۆ کەوتبووە ڕێ. بە سەمەرە، مەگەز، ئیبلیس، کیسەڵی قەڵغاندار، دەستاڕی پێدار، ئاسنی ڕەش، زەبەلاح،

مەنجەلی تایەدار، دێو، چاو لە ناو سەر، دڕندە، بەراز سیفەت، کوڕی ڕەش و سەمەرەی ڕوو لە ئاسمان ناودەبرا. بەو ئەندازەیەی خۆجە دەیویست، تەماشاکەرانی تووشی سەرسووڕمان کردبوو، لەوەش خێراتر دەچووە پێش کە پێشبینی دەکرا. خۆجە شاگەشکە دەبوو بەبینینی خۆتێهەڵقورتێنەرانی گوندەکانی دەوروبەر کە لەمبەر و ئەوبەری ڕێگە ڕادەوەستان، بەجۆشەوە سەیری ئامێرەکەیان دەکرد و لە ترساندا نەیاندەوێرا دەستی پێوە بدەن. شەوانە، پاش ئەوەی پیاوەکانمان دوای ڕۆژێکی شەکەت و وزە پرووکێن لە چادرەکاندا خەوێکی قورس دەیبردنەوە، لە تاریکایی و کشتوماتیی شەودا کە جاروبار زیکەی مێش و مەگەز دەیشڵەقاند، خۆجە باسی ئەو کارەساتەی دەکرد کە زەبەلاحەکەمان بەسەر دوژمنانیدا دەهێنێت. ئەگەرچی هەمان جۆشی جارانی نەمابوو، و لەوە دەچوو بزانێت دەوروبەری سوڵتان و سوپا کاردانەوەیان لەبەرامبەر چەکەکە چۆن دەبێت و لە نەزمی هێرشی سوپادا چ شوێنێکی بۆ دیاری دەکرێت، بەڵام هێشتا دەیتوانی بە ئاسوودەیی و بەوپەڕی متمانە بەخۆبوونەوە باس لە "دوایین هەل" و گۆڕینی ڕەوتی ڕووبار بکات بەو ئاڕاستەیەی کە خۆمان دەمانەوێت. لە هەمووشی گرینگتر، دەیتوانی بەهەمان جۆشی جارانەوە باس لە "ئەوان و ئێمە" بکات.

چەکی زەبەلاح بەتەدارەکەوە چووە ئەدرنەوە، سوڵتان و چەند چاپلوسێکی بێ کەڵکی دەوروبەری نەبێت، کەسی تر بەڕووی خۆشەوە پێشوازی لێی نەکرد. سوڵتان جۆری ئەوەی پێشوازی لە دۆستێکی دێرینی خۆی بکات، بەخێرهاتنی خۆجەی کرد. باسی لە ئەگەری شەڕێک دەکرد، بەڵام زۆر هەست بە خۆسازدان و پەشۆکان نەدەکرا. ئیدی دەستیان کرد بە بەسەربردنی ڕۆژ بە جووتە. منیش تێکەڵ بەوان دەبووم. کاتێک سواری ئەسپەکانیان دەبوون و بۆ بیستنی جریوەی مەل ڕوویان لە ناو دارستانە تاریکەکان دەکرد؛ لەهەردوو ئاوی تونجا و مەریچ سواری بەلەم دەبوون و سەیری بۆقیان دەکرد؛ ئەو لەقلەقانەیان دەلاواندەوە کە دوای شەڕ لەگەڵ داڵەکاندا بە برینداری دەکەوتنە باخچەی مزگەوتی سەلیمییەوە و ئەو کاتانەی دەچوون بۆ پشکنینی چەکەکە

بەمەبەستی سەرلەنوێ بینینی لایەنە باشەکانی، من بەردەوام لەتەکیاندا بووم. بەڵام بە ئازارەوە هەستم دەکرد ناتوانم لە گفتوگۆکانیاندا بەشداری بکەم و هیچ شتێکم نەبوو لە ناخەوە بۆیان باس بکەم بۆ ئەوەی ئەوانیش بە بایەخەوە گوێم لێ بگرن. لەوانەیە ئیرەیم بە نێزیکیی نێوانیان بردبێت. بەڵام دەمزانی ئیدی توانای بەرگە گرتنم نەماوە. خۆجە هێشتا هەمان شیعری دەخوێندەوە: باسی سەرکەوتن، بالادەستیی ئەوانی تر، پێویستیی خۆ راپسکاندن و هەڵمەتبردن، داهاتوو، و شتەکانی ناو مێشکمانی دەکرد. ئیدی من سەرم سووڕمابوو لە فریوخواردنی سوڵتان بەو چیرۆکە خەیاڵکردانە.

لە ناوەڕاستی هاویندا، ئەو رۆژانەی بەچڕی باس لە شەڕ دەکرا، رۆژێک خۆجە گوتی پێویستی بە کەسێکی بەهێز و بازووداره و منی لەگەڵ خۆیدا برد. بەپەلە و هەنگاوی خێرا بەناو ئەدرنەدا رۆیشتین. بەنێوان گەڕەکی قەرەج و جووەکان و چەند کۆلانێکی رەنگ خۆڵەمێش و خانووی لەیەکچووی موسڵمانە هەژارەکاندا تێ پەڕین. من پێشتر لە ناو بێزاریی سەرم بە سەرانسەری ئەو شوێنانەدا کردبوو. هەستم کرد خانووە بە لاولاو داپۆشراوەکانی لای چەپم کەوتوونەتە لای راستەوە و لەمەوە تێ گەیشتم لە هەمان گەڕەکدا دەخولێینەوە. پرسیم و ئەویش لە وەڵامدا گووتی: "ئێمە واین لە گەڕەکی فیلدامی . خۆجە لەپڕ لە دەرگای ماڵێکی دا. منداڵێکی چاوسەوزی تەمەن نێزیکەی هەشت ساڵان دەرگای کردەوە. خۆجە پێی گوت: "شێر، شێر.. چەند شێرێک لە کۆشکی سوڵتان هەڵهاتوون. ئێمە بۆیان دەگەڕێین." پاڵێکی بە منداڵەکەوە نا و چووە ژوورەوە، منیش دوای کەوتم. ناوەوەی ماڵەکە بۆنی تۆز و تەختە و سابوونی لێ دەهات. بەپەلە بەسەر پلیکانەیەکی نیوەتاریک و داڕزاودا سەرکەوتینە سەرەوە و گەیشتینە دالانێک. خۆجە دەستی کرد بە کردنەوەی ئەو دەرگایانەی کە دەهاتنە پێشی. لە ژووری یەکەمدا پیاوێکی بەسالاچووی پەریشان و ددان لە دەمدا نەماو، بە دەمی داچەقیوەوە نووستبوو. دوو منداڵی دەم بەخەندە بەمەبەستی پرسینی شتێک ریشی کابرایان رادەکێشا و بە بینینی کردنەوەی دەرگا ترسان. خۆجە ئەو

دەرگایەی داخست و یەکێکی تری کردەوە. لە ژوورەکەدا کۆمەڵێک لێفە و قوماشی لێفە هەبوو. ئەو منداڵەی دەرگای حەوشەی لێمان کردبووەوە، پێش دەرگای سێهەمی گرت و گوتی: "ئێرە شێری لێ نییە، دایکم و پوورمی لێیە." بەڵام خۆجە گوێی بەقسەی منداڵەکە نەدا و پاڵێکی بە دەرگاوە نا. دوو ژن پشتیان لە ئێمە بوو، لەبەر تیشکێکی لاوازدا نوێژیان دەکرد. لە ژووری چوارەمدا کابرایەک هەبوو خەریکی لێفە دروون بوو. لەبەر ئەوەی بێ ڕیش بوو، زۆر بە من دەچوو. هەر هێندەی خۆجەی دی، هەڵسایە سەرپێ و گوتی: "بۆچی هاتیت هەی سەرشێتی سەرگەردان، چیت لێمان گەرەکە؟" خۆجە گوتی: "سەمرا لە کوێیە؟" کابرا گوتی: "دە ساڵ لەمەوبەر چووە ئەستەنبوڵ. بە پەتاکە مرد. ئەی تۆ بۆ نەتوانی بتۆپیت؟" خۆجە، بێ ئەوەی وشەی لەدەم بێتە دەر، لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و لە ماڵەکە چووە دەرێ. لەو دەمەیدا دوای ئەو کەوتبووم، لە دوامەوە گوێم لە هاواری منداڵێک و دەنگی ژنێک بوو وەڵامی دایەوە: "دایە، شێر هاتووە!" "نەخێر، ئەوە مامت و براکەی بوون!"

دەمەوبەیانییەکی زووی دوای دوو هەفتە چوومەوە هەمان شوێن. ڕەنگە لەبەر ئەوە بوو بێت چەندی کردم و کۆشام ڕووداوەکەم بۆ لە بیر نەکرا، یان لەبەر ئەوەی خۆم بۆ ژیانی نوێ و بۆ ئەو کتێبە ئامادە دەکرد کە ئێستا ئێوە پشوودرێژانە دەیخوێننەوە. بەهۆی ئەوەی ڕووناکی سەری لێم شێواند، دەسپێک کۆڵان و ماڵەکەم پێ نەدۆزرایەوە، کاتێکیش دۆزیمەوە، ویستم قەدبڕ بکەم و سەرێک لە تیمارخانەی مزگەوتی بایەزید بدەم. پێشتر ئاراستەکەیم دەسنیشان کردبوو. پێ دەچێت بۆچوونەکەم هەڵە بووبێت، چونکە سەرەتا نەمتوانی ڕێگەی کورتی ژێر سێبەری سپیندارەکان؛ ئەو ڕێگەیەی دەگاتەوە پردەکە و کاتی خۆی خۆجە و ئەوان پیایدا ڕۆیشتوون، بدۆزمەوە. پاش ئەوەی دۆزیمەوە، تەماشام کرد لە قەراغ ڕێگەی ژێر سێبەری سپیندارەکان ڕووبارێک نەبوو مرۆڤ لە کەناری دابنیشێت و بەدەم سەیرکردنی ئاوەوە حەلوا بخوات. لە تیمارخانەکەش هیچ کامێک لەو شتانەم بەدی نەکرد کە پێشتر لە بارەیانەوە دوابووین. قەرەباڵغ نەبوو، پاک و خاوێن بوو، بەڵام نە دەنگی ئاو

دەبیستــرا و نە شـووشــەی ڕەنگاوڕەنگ دەبیندرا. نەخـۆشـێکی بە زنجـیر شەتەکدراوم بینی، خۆم پێ ڕانەگیرا و پرسیارم لە پزیشک کرد. لە وەڵامدا گوتی: "عاشق بووە، شێت بووە، چەشنی هەر شێتێکی دی، خۆی لێ بووە بە کـەسـێکی تر." ویسـتی زیاتری لەسـەر بڕوات، مـن گـوێم ڕانەگـرت و دوور کەوتمەوە.

بڕیاری شـەڕ کـە پێـمـان وا بوو چی دی ڕاناگـەیەندرێت، بەشـێـوەیەکی چاوەڕوان نەکـراو لە ڕۆژێکی کـۆتایی هاویندا ڕاگـەیەندرا. پۆلۆنەکـان لە توانایاندا نەمابوو لە ژێر باری تێکشکانی ساڵی پێشـتر و ئەو باجەی زۆرەی کەوتبووە سەریان، خۆیان ڕابگرن. بۆیە لە ڕێی ناردنی هەواڵەوە گوتبوویان: "وەرن بە نووکی شـمـشـێر باج و سەرانەی خـۆتان وەربگرن." ڕۆژانی دواتر خۆجە لە تووڕەییدا سوور هەڵگەڕابوو. لە کاتی سازدانی تەدارەکدا بۆ ڕەوتی سوپا، کەس بیری لە جێیەک بۆ چەکی زەبەلاح نەدەکردەوە. کەس نەیدەویست لە کاتی شـەڕدا ئەم تۆپەڵە ئاسنە ڕەشە لە تەنیشت خۆیەوە ببینێت. کـەسیش چاوەڕێ نەبوو هیچ ماریفەتێک لەم قازانە زەبەلاحە بوەشێتەوە. لە هەمووشی خراپتر: بە مـایەی شـوومی و نەگبەتییـان دەزانی! ڕۆژێک بەر لـە بەڕێکەوتنی سوپا، خـۆجە پێشبینیی خۆی لە بارەی شەڕەوە بەیان کرد و نەیارەکانمان بە ئاشکرا گـوتیـان ئەم چەکە هێندەی مـسـۆگەرکردنی سـەرکەوتن، نەفرەتیـشی بەدواوەیە. واشی بۆ دەچوون زیاتر لـە خۆجە، من لە پشت ئەو نەفرەتەوە بم و کاتێکیش خـۆجـە ئەم شـتـانەی گێڕایەوە، مـن ترسـم لێ نیشت. سـوڵتـان ڕای گـەیاندبوو مـتـمـانەی بە خــۆجــە و چەکـەکــە هـەیە و بۆ ئـەوەی پێش لە دروستبوونی دەمەقاڵە بگرێت، گوتبووی لە کاتی شەڕدا تۆپەکە سەر بە خۆی و بە هێزەکانی ژێر دەستی خۆی دەبێت. سەرەتای مانگی ئەیلول، لە ڕۆژێکی گەرمدا لە ئەدرنە دەرچووین. هەمووان پێیان وا بوو کات درەنگە بۆ بەڕێکەوتن بـەرەو شــەڕ، بـەڵام زۆر قـــســـە لەو بـارەیەوە نەدەکـــرا: لە ســـەرەوبەندی دەرچوونمـاندا مـن تازە تـێ دەگــەیشــتـم ســـەربـازەکــان هێندەی لـە دوژمن دەترسن، بگرە هەندێک جـار زیاتریش لە نـەگبـەتی دەترسن و بەدەم ترسـانەوە

لە ئەگبەتی شەڕ دەکەن. ڕۆژی یەکەم لە پێشڕەویماندا بەرەو باکور، بە چەندین گوندی خاوێن و دەوڵەمەنددا تێ پەڕین و بەسەر پردگەلێکدا پەڕینەوە کە چەکەکەمان زەویی ژێریانی خستبووە لەرە. شەوەکەی سەرمان سووڕما لەوەی لە چادری سوڵتانەوە بەدوامانـدا نێردرا. سوڵتانیش، وەک سەربازەکانی منداڵ بووبووەوە. ماخۆلان و جۆشی منداڵێکی تێدا بەدی دەکرا کە دەیویست دەست بە گەمەیەکی نوێ بکات. کتومت وەک سەربازەکانی، ئەویش بەدرێژاییی ڕۆژ داوای لە خۆجە دەکرد واتەی ڕووداو و پێشهاتەکانی بۆ لێک بداتەوە: "هەوری سووری بەردەم خۆرنشین، بازە نزم فڕەکان، دووکەڵکێشی شکاوی ماڵی گوندێک و لەقلەقی سەرهەڵگرتوو بەرەو باشوور واتەی چی دەگەیەنن؟" بێگومان خۆجە واتەی هەموو پرسیارەکانی سوڵتانی بە ئەرێنی لێک دەدایەوە.

بەڵام کارمان بەکۆتا نەهاتبوو. ئێمە هەردووکمان تازە بۆمان دەرکەوتبوو سوڵتان لە شەوانی دەرچووندا بۆ شەڕ ئالوودەی بیستنی چیرۆکی ترسناک و پڕ لە پەرۆشە. خۆجە بەپشتبەستن بە شیعری ناو کتێبێک کە ساڵانێک لەمەوبەر دابوومان بە سوڵتانمان و من لە هەموو کتێبەکانی تر زیاترم خۆش دەویست، وێنەی دیمەنێکی تاریک و لێڵی کێشا: دیمەنێکی درێوی لێوانلێو لە کەسانی کوژراو، تێکشکانی خوێناوی، ناپاکی و پەرێشانی، بەڵام هێشتی تیشکی سەرکەوتن لە گۆشەیەکدا کە نیگای پڕ لە ترسی سوڵتان بتوانێت بیبینێت، بدرەوشێتەوە. بۆ ئەوەی بیوروژێنین، دەبوو ئەقڵمان بخەینە کار، پێویست بوو بە زووترین کات هۆشیار بینەوە و دوای تێگەیشتن لە "ئەوانەی ئەوان و ئەوانەی ئێمە"، لە ئاستی زانینی ناواخنی مێشکمان و هەموو ئەو شتانەی تردا بین کە چەندین ساڵ بوو خۆجە بۆ منی دەگێڕایەوە، بەڵام ئیدی من هاتبوومە سەر ئەو باوەڕەی لە بیریان بکەم! من ئەوەندە ئەو بەسەرهاتە بێ تامەم بیستبوو ئیدی لێی بێزار بووبووم، بەڵام ڕەنگە ئەو وای بۆ چووبێت سوڵتان پێی ڕاهاتووە، بۆیە هەموو شەوێک شتێکی تری بۆ تاریکی و درێوی و سامناکییەکەی زیاد دەکرد. کەچی ئەگەر باس دەهاتە سەر شتەکانی ناو

مێشکمان، هەستم دەکرد سوڵتان خۆشحاڵانە چێژ لە ترسان وەردەگرێت.

لە هەفتەی یەکەمی کشانی سوپادا، دەرچوون بۆ ڕاو دەستی پێ کرد. دەستەیەک تەنیا بۆ ئەو کارە لەگەڵ سوپادا هاتبوون و لە پێشەوە دەڕۆیشتن. دوای پشکنینی ناوچەکە و هەڵبژاردنی شوێنی لەبار و وەگەڕخستنی گوندنشینان، سوڵتان و ئێمە و ڕاوچییەکان خۆمان لە ڕەوتی ڕیزەکانی سوپا دادەبڕی و ڕوومان لە بێشەڵانێکی بەناوبانگ بە ئاسک، قەدپاڵێکی دەوڵەمەند بە بەرازی کێوی، یان لە دارستانێکی پڕ لە ڕێوی و کەروێشک دەکرد. دوای گەشتە بچووک و پڕ لە کەیف و سەفاکانی ڕاو کە هەرجارە چەندین سەعاتی دەخایەند، وەک ئەوەی بە سەرکەوتوویی لە شەڕ گەڕابینەوە، بە تەنتەنەوە دەگەڕاینەوە ناو ڕیزی سەربازەکان. سوپا پێشوازی لە سوڵتان دەکرد و ئێمەش ڕاستەوخۆ لە دوایەوە بووین. خۆجە بە هەڵچوون و نەفرەتەوە بۆ ئەم تەدارەکەی دەڕوانی، بەڵام من زۆر حەزم لێی بوو. ئێواران زیاتر پێم خۆش بوو پێکەوە لەگەڵ سوڵتان، لەبری ڕەوتی سوپا و دۆخی ئەو گوند و ناوچانەی سوپایان پێدا تێ دەپەڕی، یان دوایین هەواڵەکانی گەیشتوو لە دوژمنەوە، باسی ڕاومان بکردایە. خۆجە ئەم چەنەبازییەی ئێمەی بە گەمژەیی و بودەڵەیی دەزانی، لەبەر ئەوە ڕقی لێمان هەڵسا و دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهات و فاڵگرتنەوە و هەر شەوەش مشتێکی دەخستە سەر خەرمانی توندوتیژیی بەسەرهاتەکانی. خۆجە، بەمەبەستی ترساندنی سوڵتان چیرۆک و پەندی لەسەر ناواخنی مێشکمان دەگێڕایەوە، بەڵام منیش خەریک بووم وەک ئەوانەی دەوروبەر پێیان بێزار و دڵتەنگ دەبووم.

کەچی دەبوو لەوەش خراپتر ببینم! دیسان بۆ ڕاو دەرچووبووین. نێزیکەی دە گوند چۆڵ کرابوون و خەڵکەکە بەناو دارستاندا بڵاوەیان کردبوو. لە تەنەکەیان دەدا و دەیانویست بە هەرا و ژاوەژاو ڕووی بەراز و مامزەکان لەو گۆشەیە بکەن کە ئێمە بە ئەسپ و چەکەوە لێی ڕاوەستابووین و چاوەڕێمان دەکرد، بەڵام تا نیوەڕۆ هیچ ناژەڵێکمان لێ هەڵنەکەوت. بەمەبەستی ڕەواندنەوەی بێزاریمان کە بەشێزۆری بەهۆی گەرمای نیوەڕۆوە بوو، سوڵتان

داوای لە خۆجە کرد لەو بەسەرهاتانەی بۆ بگێڕێتەوە کە شەوانە ترس دەخەنە دڵییەوە. بەدەم بیستنی دەنگی لێدانی تەنەکەوە لە دوور، هێدی هێدی دەچووینە پێش تا گەیشتینە گوندێکی کرستیاننشین و وچانمان دا. خۆجە و سوڵتان بە دەست ئاماژەیان بۆ یەکێک لە ماڵە چۆڵکراوەکانی گوند کرد. لەو ساتەدا پیاوێکی بەساڵاچووی ڕیوەڵەم بینی سەری لە نێوان دەرگای ماڵەوە هێنابووە دەرێ. سوڵتان دەستووری دا کابرایان هێنایە بەردەمی. پێش کەمێک لەمەڕ ناواخنی مێشکی "ئەوان" دوابوون، کاتێک هەستم بەپەرۆشیی سەر ڕووخسارییان کرد و بینیم وا خۆجە لە ڕێی وەرگێڕەوە پرسیار لە یارۆی بەساڵاچوو دەکات، لە ترسی ئەو شتەی بەخەیاڵی خۆم بۆی چووبووم، لێیان نێزیک کەوتمەوە.

خۆجە داوای لە کابرا دەکرد بێ بیرکردنەوە دەستبەجێ وەڵامی پرسیارەکانی ئەم بداتەوە: گەورەترین تاوان و مەزنترین خراپەکاری لە ژیانتدا کامەیە؟ کابرای گوندی، لە ژێر لێوەوە بە زمانێکی سلاڤیی خراپ دەدوا و وەرگێڕیش بۆمانی وەردەگێڕا: "بەساڵاچوویەکی پاک و بێ تاوان و بەلەنگازم." بەڵام خۆجە پێی لە کابرا کردبوو بە کەوشدا و داوای لێ دەکرد باسی خۆی بکات. کابرای پیرە هەستی کرد سوڵتانیش هێندەی خۆجە پەرۆشی بیستنی ئەمە، بۆیە دادنی بە تاوانی خۆیدا نا: "بەڵێ، تاوانبارم، دەبوو منیش ئەمڕۆ لەگەڵ خەڵکی ئاوایی لە ماڵ دەرچوومایە. دەبوو منیش هاوشانی خوشک و برایانم بچوومایە بۆ ڕاو و بەدوای ئاژەڵدا ڕام کردایە. بەڵام ناتوانم، بیانووم هەیە و بەشی هێندە تەندروست نیم لە گزنگی بەیانەوە تا خۆرنشین بەناو دارستاندا ڕابکەم." بە دەستی ئامارەی بۆ دڵی دەکرد و داوای لێبووردنی دەکرد. خۆجە هەڵچوو، بەدەنگی بەرز نەڕاندی: "ئەوە نا، من پرسیاری تاوانە ڕاستەقینەکانم لێت کرد." بەڵام پێ نەدەچوو کابرای گوندی لە پرسیارەکە گەیشتبێت، ئەگەرچی وەرگێڕ چەند جارێکیش بۆی دووبارە کردەوە. بە خەمەوە دەستی نابووە سەر دڵی و لەوێدا ڕاوەستابوو. کابرای پیرەیان برد. دوای ئەوەی یەکێکی تریان هێنا و ئەویش هەمان شتی گوتەوە،

خۆجە لە داخـاندا سـوور هەڵگەڕا. بۆ ئەوەی ئەرکی کـابرای دووەم ئاسـان بکات، بێ ئـەوەی ناوم بهـێنێت، گـوناه و تاوانەکـانی منی بۆی گـێڕایەوە، بۆ نموونە: گوناهەکانی سەردەمی منداڵیم، درۆکانم بۆ ئـەوەی خۆم لە خـوشک و براکانم زیاتر خۆشەویست بکەم و گوناهە زایەندییەکانی سـەردەمی زانکۆم. لەو کـاتەدا من بە ڕق و شـەرمـەوە ڕۆژانی پەتاکـەم هاتەوە بیر، ئێسـتـاش لە کـاتی نووسـینەوەی ئەم کـتێـبـەدا بەتاسـەوە بیـری ئەو ڕۆژگـارە دەکـەم. گوندییـەکی گۆج وەک دوایـین کـەس هێندرا، بە فسکە ددانی پێدا نا لە کاتی خۆشـوشـتـنی ژناندا لە نـەواڵ، ئەم سـەیری کـردوون. خـۆجە بەبیـسـتنی ئەم ددانپـیـانانە کـەمـێک خـاوبـووەوە و گـوتی: "بـەڵێ، ئەوان ئاوان لەبەرامـبـەر گوناهەکانـی خۆیاندا، ئامـادەن ڕووبەڕووی خراپەکارییەکانیـان ببنەوە. بەڵام ئیـدی نۆرەی ئێمـەیە بزانین چی بـە مێـشکمـاندا ڕادەبـووڕێت. ئەم قسـانە و گەلێ شتـی تریشـی گوت. دەمـویست بڕوا بەخـۆم بهێنم قسـەکانی کـاریگەریـی زۆریان لەسەر سوڵتان دانەناوە.

بەڵام سـوڵـتـان پەرۆشـتـر بووبوو. دوو ڕۆژ دواتـر و لە ڕاوێکی تردا کـاتێک بەسواریی ئەسپەوە بەدوای ڕەوە ئاسکێکدا غارمان دەدا، چاوپۆشـی لە دەست پێکردنەوەی هـەمـان بەزم کرد. ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێت لەبەرامـبەر پێداگرتنی خۆجـەدا خـۆی پێ ڕانەگـیرابێت، یان لێپرسـینـەوەکـەی، زیاتر لەوەی من بۆی چووم، پـێ خـۆش بووبێت. ئیـدی لە ڕووباری دانـوب پەڕیبـووینەوە و دیسـان گەیشتبووینە گوندێکی کرستیاننشین. خەڵکی ئاوایی بە زمانێکی بەڕەچەڵەک لاتینـی دەدوان. گۆڕانکـارییـەکی ئەوتۆش لەو پرسـیـارانەدا نەبوو کە خـۆجـە ئاڕاسـتـەی خـەڵکی دەکـرد. پرسـیـارەکـانی، توندوتیـژیـی شـەوانی پەتاکـەی دەخسـتـەوە بیرم، چونکە ئەو کاتە ناچارم کردبوو خـراپەکارییـەکـانی خـۆی تۆمـار بکات. وەک دادوەرێکی نەناسـراو پرسـیـاری لە گـوندنشـینان دەکـرد، سـوڵتـانیش بە بێـدەنگی پشـتـیوانی لێی دەکرد و گـوندنشـینانیش لە ترسی سـوڵتـان وەڵامـیـان دەدایەوە. من، سـەرەتا نەمـویست گـوێ لە پرسـیـار و وەڵامـەکـان بگرم. بەشـێـوەیەکی سـەیر ڕقـم هەڵسـابوو. لە خـۆجـە زیـاتر، لە

سـولّتـان تووڕه بووم، چونکه چێـژی له گـهمـهکـه وهردهگـرت و نهیدهویـست سنوورێک دابنێت بۆی. بهڵام هێندهی پێ نهچوو منیش کهوتمه بهر کاریگهریی ئهو پهرۆشییه درێیوه. باوهڕم به خۆم هێنا به گوێگرتن هیچ له دهست نادهم و لێیان نێزیک بوومهوه. گوناه و تاوانهکان به زمانێکی شیرینتر به گوێی من دهگێردرانهوه و زۆربهیان له یهکدی دهچوون: درۆی ساده، فرتوفێڵی بچووک، یهک دوو نامـهردایهتی، دوو سێ بێ وهفـایی، هەره زیاد، چهند دزییـهکی بچووک.

ئێواره خۆجه گوتی گوندنشینان ههموو شتێکیان نهگێڕاوهتهوه و ڕاستی دهشارنهوه. به بۆچوونی خۆجه، من له کاتی خۆیدا له ددانانان به تاوانهکانمدا زۆر پێشڕهویم کردبوو. پێی وا بوو دهبێت گوناهی زۆر قووڵ و ڕاستهقینهتریان ههبێت بۆ جیاکردنهوهی ئهوان له ئێمه. بۆ ئهوهی ڕاستییهکان به دهست بخات و پیشانی بدات له پێشدا "ئهوان" و دوایی "ئێمه" چۆنین، ئامادهبوو، ئهگهر پێویست بکات، سولّتان له خشته ببات و هێز بهکار بهێنێت.

ڕۆژانی دواترمان بهدهم ئهم توندوتیژییه درێژهوه بهسهر برد و تا دههاتیش زیادی دهکرد و بێ واتاتر دهبوو. دهسپێک ههموو شتێک ساده و ئاسایی بوو. ئهو ڕۆژانه له کۆمهڵێک منداڵ دهچووین لهوانهی له ناوهڕاستی گهمهی خۆیاندا یهک دوو کاڵتهی شیرین دهکهن. کۆڕی لێپرسینهوه له ناوهڕاستی سهعاته دوور و درێژهکانی ڕاودا ڕێک دهخرا و بۆ ئێمه وهک بهزم و ڕابواردنی بچووکی کاتی پشوودانی لێ هاتبوو. دواتریش وهرگهڕایه سهر تهدارهکێک که وزهی لهبهر خـواست و ئۆقره و هۆشمـان بڕیبـوو، لهبهر هۆیهکی نادیاریش نهمـاندهتوانی دهسـتی لێ ههڵبگرین. گـوندنشـینانێکم دهبینی لهبهر پرسیارهکان و نهزانینی هۆی ههڵچوونی خۆجه سهریان لێ شێوابوو، ئهگهر بهڕوونی بیانزانیبایه چییان لێ داوا دهکرێت، لهوانهبوو بێنه گۆ و قسه بکهن. کهسانی بهساڵاچووی شهکهت و ددان له دهمدا نهماوم دهبینی له مـهیدانی گوندهکاندا کۆ دهکرانهوه، پێش ئهوهی زمانیان تهتهڵه بکات و پێ له ڕاستیی تاوانهکانیان، یان گوناهه ساختهکانیان بنێن، به چاوی ئومێد لێبڕاوهوه بۆ

هاوکاری له دهوروبهر و له ئێمه دهپاڕانهوه. دهستهی گهنجانم دهبینی لهبهر ئهوهی ددانپیانان و گوناههکانیان به کهم دهبیندرا، دارکاری دهکران. لهو ساتهدا ڕهفتارێکی خۆجهم بیر کهوتهوه: جارێک دوای خوێندنهوهی ئهو شتانهی لهسهر مێزهکه نووسیبوویانی، مستهکۆڵهیهکی به پشتمدا کێشا و به هه‌ڵچوونهوه گوتی " تۆ، قوڕت بهسهر!" پاشان چۆن هه‌ڵچوو، بهتوندی لهگهڵ خۆیدا کهوته ناکۆکی، چونکه نهیدهتوانی تێ بگات بۆچی من مرۆڤێکی وام. ئهگهر بهتهواویش نهبێت، ئیدی زۆر باش دهیزانی بهدوای چیدا دهگهڕێت و به چ ئاکامێک دهگات. شێوازی تریشی تاقی کردهوه: لهپڕ قسهی به ددان پێداهێن دهبڕی و پێی دهگوت درۆ دهکهیت. پاشان پیاوانی ئێمه کابرای گوناهباریان دارکاری دهکرد. ههندێک جار قسهی به یارۆی ددان پێداهێن دهبڕی و دهیگوت برادهرهکهت پێچهوانهی ئهوهی تۆ دهڵێت. ماوهیهک شێوازێکی تری تاقی کردهوه: خهڵکی بهجووته بۆ بهردهم خۆی بانگ دهکرد. سهرباری زهبر و زهنگی پیاوانمان، گوندنشینان شهرمیان له یهکدی دهکرد و وهک پێویست بهقوڵایی ڕاستییهکاندا نهدهچوونه خوارێ. خۆجه بهبینینی ئهو دۆخه هێندهی تر کهڵلهیی دهبوو.

ئهو کاتهی بارانێکی بهخوڕ و بێ بڕانهوه دهستی پێ کرد، منیش لهگهڵ ڕووداوهکاندا ڕاهاتبووم. بیرم دێت کۆمهڵێک گوندنشین له مهیدانی قوڕاویی گوندهکهیاندا کۆ کرابوونهوه و تا سهر ئێسقان تهڕ بووبوون. نه له توانایاندا ههبوو بدوێن و نه نیازیشیان ههبوو شتێک بڵێن. چهندین سهعات بهدهم تێههڵدانهوه ڕاگیران. تا دههات دهرچوونمان بۆ ڕاو له کزیی دهدا و کهم دهبووهوه. جارویار نێره بهرازێکی کێوی، یان ئاسکێکی چاو جوانمان ڕاو دهکرد و ئهمهش دهبووه هۆی خهمباربوونی سوڵتان، بهڵام ئیدی لهبری وردهکارییهکانی ڕاو، لێپرسینهوهی گوندنشینان ئهقڵمانی داگیر کردبوو، کتومتیش وهک ڕاو زۆر زووتر تهدارهکی بۆ ساز دهکرا. شهوانه خۆجه وهک ئهوهی لهبهرامبهر کارهکانی ڕۆژیدا ههست به ئازاری ویژدان بکات، ناخی خۆی بۆ من هه‌ڵدهڕشت. ڕووداوهکان و بهکارهێنانی توندوتیژی ئۆقرهی لێ

بریبـوو، بەڵام دەیویست زانیـارییـەک بسـەلمێنێت، زانیـاریەک بێت بەکـەڵکی هەمووومان بێت و پێشـانی سوڵتـانیشی بدات. دواتـر گوتی: "پێت وا نییـە ئەو گوندنشـینانە ڕاسـتـیـیـەکـان دەشـارنەوە؟" پـاشـان گـوتی: "دەبێت هـەمـان تاقیکردنەوە لە گوندێکی موسـڵمانیش ئـەنجام بدەین." لـەوەشدا سـەرکـەوتوو نەبوو، چونکە ئەوانیش هـەمـان شـتی چەشنی هـاوسێ کـرسـتـیـانەکـانیـان هەڵڕشت و هـەمـان چیرۆک و بالۆرەیـان گێڕایەوە. ڕۆژێک لەو ڕۆژە بەربادانەی کـە باران خۆشـی نەدەکردەوە، خـۆجـە لەبەر خـۆیەوە بۆڵەیەکی کرد و گـوتی ئەوانە مـوسـڵـمـانـی ڕاسـتـەقـینە نین. بەڵام ئێـواران لە کـاتی لێکدانەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژدا، دەمبینی هەستی کردووە سـوڵتان لەم ڕاسـتـییە بێ ئاگـا نییە.

ئەمـەش، جگە لە هـەڵـچوونی زیاتری خۆجـە و بێزاربـوونی لە ئامـادەبوونی سـوڵتـان لە کـاتی لێپـرسینەوەکاندا و بەکـارهێنانی زیاتری توندوتیژی وەک دوایین ئومـێـد، بەکـەڵکی هیـچ شـتـێکی تر نەهات. منیش لە ڕووی پەرۆشـیـی خـۆمــەوە دوای کـەوتبـووم. لە ڕێ و ڕەوتماندا بەرەو بـاکـور، گـەیشــتـینە ناوچەیەکی داپۆشـراو بە دارسـتـان. خەڵکی گونـدەکانی ئەوێ بەزمانـی سلاڤی قسـەیان دەکرد. بە چاوی خـۆمـان خۆجەمـان بینی لە گوندێکی خنجیـلانە و جـوان بە دەسـتـی خـۆی لە مـێـردمنداڵێکی جـوانکارەی دەدا، چونکە جگە لە درۆیەکی منداڵانە هیـچی تری بیـر نەکـەوتبـووەوە. ئێـوارە هـەسـتـێکی خـۆ بەتاوانبـارزانی ئەوتۆ دای گـرتبـوو کـە تەنانەت مـنیش زیاد پێـوەنـانم تێـیـدا دەبینی. گـوتی: "هـەرگـیـز ئەو ڕەفـتـارە دووبارە ناکـەمـەوە. جـارێکی تر وا هەسـتـم کـرد لە دوورەوە کـۆمـەڵێک ژنم لە ژێر بارانێکی زەردباودا بینی بۆ چارەنووسـی نێرینـەکانیـان دەگریان. ئیدی پیـاوەکـانیـشـمـان ئەزمـوونێکی زۆریان لـە کـاری خـۆیـاندا پەیدا کـردبوو، لە ڕووداوەکـان بێــزار بـووبوون. هەندێک جـار ئەوان پێش ئێـمــە دەکـەوتن، کـەسـێکی ددان پێـداهێنیـان هەڵدەبژارد و دەیانـهـێنایە بەردەممان. بەر لە خــۆجـە، لەبەر ئەوەی بـەهـۆی بەکارهێنانی توندوتیژی شـەکەت دەبوو، وەرگێڕەکەمـان خـۆی پرسیـارەکـانی

سەرەتای لە کابرای ددان پێداهێن دەکرد. کەسانێکی سەرنجڕاکێشمان لێ هەڵکەوت لە ترسی زەبر و زەنگی چەشنی ئەفسانە تەشەنەکردوومان بە گوندەکاندا، یان وەک ئەوەی ساڵانێکی درێژ بە ترس و سەرسوورمانی دادپەروەرییەکی باڵای نادیارەوە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژەی لێپرسینەوەیەیان کردبێت، و بە دوور و درێژی پێیان لە گوناهەکانی خۆیان نا. بەڵام چیرۆکی بێ وەفایی ژنان و پیاوان و ئیرەیی پێبردنی گوندنشینانی هەژار بە هاوسێ خواپێداوەکانیان، چی دی بۆ خۆجە جێی بایەخ پێدان نەبوو. بەردەوام دووپاتی دەکردەوە ڕاستییەکی قووڵتر هەیە، بەڵام پێم وا بێت خۆیشی وەک ئێمە لەبەرەوە لە گەیشتن بەو ڕاستییە دەکەوتە گومانەوە. بەلانی کەمەوە هەر کاتێک پەی بە گومانی ئێمە ببردایە، شێت و دەهری دەبوو، بەڵام ئێمە و سوڵتانیش دەمانزانی نیازی دەستهەڵگرتنی نییە. لەوانەیشە لەم سۆنگەیەوە بووبێت بێدەنگ بووین لەوەی کە خۆجە هەموو سەرەداوەکانی گرتبووە دەستی خۆی. جارێکیان لاوێکی جوانکیلەمان ڕاکێشایە ژێر بانێک، تا سەر ئێسقان تەڕ بووبوو، نەفرەتی لە باوەپیارەی خۆی، خراپەی ئەو دەرهەق بە دایکی و نەفرەتی لە زڕخوشک و براکانی دەکرد. هەر ئەوەندەی دیمان خۆجە چەندین سەعات دایە بەر پرسیار، ئاهێکمان بەبەردا هاتەوە، بەڵام ئێوارە گوتی ئەویش لاوێکی ئاسایی شایەن بە لە بیربردنەوەیە، بەو جۆرە سەری بابەتەکەی نایەوە.

زۆر زیاد بەرەو باکور چووبووینە پێشەوە. کاروانی سوپاکەمان وەک مار لە نێوان چیا بەرزەکاندا پێچی خواردبوو، بۆیە بەڕێگەی قوڕاویی ناو دارستانە تاریکەکاندا زۆر لەسەرخۆ ڕێی دەکرد. حەزم لە نهێنیی بێدەنگیی گومان وروژێنەر و ئەو هەوا فێنک و تاریکە بوو کە لە دارستانە بە دار سنەوبەر و ڕەشە داربەڕوو داپۆشراوەکانەوە دەهات. ئەگەرچی کەس ئەو ناوەی بەکار نەدەهێنا، بەڵام پێم وا بێت لە دامێنی ناوچەی کارپات بووین. کاتی خۆی ئەو ناوچەیەم لەسەر نەخشەیەکی ئەورووپای بە مامز و کۆشکی گۆتیک خەملێندراوی دەستکاری نیگارکێشێکی خراپ لەبەر دەستی باوکمدا دیبوو.

خۆجە لەبەر باران سەرما لێی دا و کەمێک نەخۆش کەوتبوو، بەڵام سەرباری ئەوەش، هەموو بەیانیانێک لە شارێ، وەک ئەوەی بیەوێت بەهۆی پێچ و دەوری زۆرییەوە درەنگ بگەینە شوێنی مەبەست، جیا دەبووینەوە و دەچووینە ناو دارستانەکانەوە. ئیدی ڕاو و شکار کەوتبووە خانەی لە بیرچوونەوەوە. دەتگوت هەڵوەدای ڕاوکردنی ئاسکی کەنار ئاوێک، یان قەدپاڵی نەواڵێک نەبووین، بگرە چێژمان لە زیاتر ڕاگرتنی ئەو گوندنشینانە دەبینی کە بۆ ئێمە ئامادە دەکران! دواتر، لە کاتی گونجاودا بڕیار دەدرا و دەچووینە یەکێک لە گوندەکانەوە. پاش ئەنجامدانی ئەوەی پێویست بوو بیکەین و دوای ئەدۆزینەوەی ئەو گەوهەرەی عەوداڵی بووین، خۆجە بەمەبەستی لە بیرکردنی بەدڕەفتاری و دارکاری خەڵک و پێش هەموو شتێکیش بۆ لە بیربردنەوەی بێ ئومێدیی خۆی، داوای لێمان دەکرد دەستبەجێ ڕوو لە گوندێکی تر بکەین و ئێمەش دەکەوتینە شوێنی. جارێکیان ویستی تاقیکردنەوەیەکی تر ئەنجام بدات. سوڵتان بەددان بەخۆداگرتن و پەرۆشیی خۆی، منی تووشی سەرسووڕمان کردبوو، دەستووری دا بیست یەنیچەرەی بۆ بهێنن. خۆجە هەمان ئەو پرسیارانەی جارێک لەوان و جارێکیش لە گوندنیشنانی داماوی ڕاگیراو لە بەردەم دەرگای ماڵاندا کرد. جارێکی تریان، گوندنشینانی بردە لای کاروانی سوپا و ئامێرەکەمانی پیشانیان دا. ئەوانیش دەیانبینی بۆ ئەوەی فریای ڕەوتی سەربازەکانی سوڵتان بکەوێت، چۆن بە چەتوونی و جیڕوهوڕ بە ڕێگەی قوڕاویدا دەڕوات. لە بۆچوونیانی پرسی و داوای لە نووسەران کرد وەڵامەکانیان تۆمار بکەن. بەڵام لەبەر هۆیەکی لای من نەزانراو، ئیدی خۆیشی بڕستی لێ بڕابوو: ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێت، وەک خۆی دەیگوت، ئێمە هەر بەڕاستی تێ ناگەین، پێ دەچوو خۆیشی لە زەبر و زەنگی بێ واتا بێزار بووبێت، یان بەهۆی ئەو هەستی خۆ بەتاوانبارزانەوە بوو کە شەوان تووشی دەبوو، یان وای بۆ دەچووم لە منگەمنگی سوپا و شازادەکان دەربارەی ڕووداوەکانی ناو دارستانەکان و چەکەکە بێزار بووبێت. لەوانەیشە تەنیا لەبەر نەخۆشییەکەی بووبێت. کۆکە دەنگی گۆڕیبوو، وەک

جاران گڕ نەبوو، وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانی لەبەر بوو، بەجۆشی جارانیشەوە پرسیاری نەدەکرد. شەوانە، لەمەڕ داهاتوو، سەرکەوتن و ڕزگاربوونمان لە فەوتان قسەی دەکرد، بەڵام بڕوای بە قسەکانی خۆی و بە دەنگی خۆیشی کە تا دەهات لاوازتر دەبوو، نەدەکرد. دێتەوە یادم چۆن دواجار لە ژێر بارانێکی هاوشێوەی ڕەنگی دووکەڵی گۆگردردا چەند گوندنشینێکی سلاڤیی داماوی کۆ کردەوە و زۆر دڵڕەقانە خستنیە بەر لێپرسینەوە. ئێمە لەبەر ئەوەی نەماندەویست چی دی گوێ بگرین، لە دوورەوە ڕاوەستابووین. لە تیشکێکی خەیاڵیی ئەفشانکراو بە باراندا دەمانبینی خۆجە ئەم دەست و ئەو دەستی بە ئاوێنەیەکی چوارچێوە زیوین دەکرد و ئەوانیش داماوانە سەیری ڕووخساری لاوازی خۆیان دەکرد تیایدا.

چی دی بۆ ڕاو و شکار دەرنەچووین. لە ڕووبار پەڕیبووینەوە و چووبووینە خاکی پۆلۆنیاوە. بارانی بەخوڕ ڕێگە و بانەکانی پڕ کردبوو لە قوڕ و لیتە، چەکەکەمان وەک پێویست ڕێی نەدەکرد و ڕەوتی سوپاشی خاو کردبووەوە. قسەی شازادەکان کە هەر لە بنەڕەتەوە خۆشییان بەچارەی چەکی زەبەلاحماندا نەدەهات، سەبارەت بە شوومی و نەفرەتهێنانی ئامێرەکەمان لەو ماوەیەدا زیاتر پەرەی سەندبوو. قسە و قسەڵۆکی یەنیچەرەکانی بەشدار لە تاقیکردنەوەکانی خۆجەدا، ترش و خوێی زیاتری بەسەر ئەو بابەتەدا دەکرد. وەک هەموو جارێکیش، لە خۆجە زیاتر، منی گاوری نامووسڵمانیان تاوانبار دەکرد. کاتێک خۆجە دەستی بەهەمان چەنەبازیی شیعر ئامێز کە سوڵتانیش لێی بێزار بووبوو، دەکردەوە و باسی پێویستبوونی چەکەکە و هێزی دوژمن و پێویستیی هەوڵدانمان بۆ ڕزگاربوون لە کارەساتی چاوەڕوانکراوی دەکرد، ئەو شازادانەی لە چادری سوڵتاندا گوێیان لێی دەگرت، باوەڕیان بە ساختەکاریی ئێمە و نەگبەتیی چەکەکەمان پتەوتر دەبوو. بە چاوی کەسێکی لەڕێ لادەر، بەڵام وەک نەخۆشێکی بەتەواوی ئومێد لێ نەبڕاو بۆ خۆجەیان دەڕوانی. بە بۆچوونی ئەوان، مەترسیی بنەڕەتی و تاوانباری سەرەکی، منی گاورم و بە هۆنینەوەی شوومی و نەگبەتی سوڵتان و خۆجەم لە خشتە بردووە.

شەوانە دوای گەڕانەوەمان بۆ چادری خۆمان، خۆجە بە دەنگە نەخۆشەکەی و بەهەمان شێوەی باسکردنی ئەوان و گەمژەکانی ساڵانی ڕابردوو، بە ڕق و هەڵچوونەوە قسەی دەکرد، بەڵام چی دی ئەو نەشئە و ئومێدەی ساڵانی ڕابردووی کە باوەڕم وا بوو دەتوانین بەردەوام بە زیندوویی ڕای بگرین، نەمابوو.

سەرباری ئەوەش، دەمبینی ئەوەندە ئاسان نییە سەری داوەکە شل بکات. دوای دوو ڕۆژ، ئەگەر بینیم چەکەکەمان لە قوڕ و لیتەی پاشماوەی باراندا چەقیوە و بووەتە هۆی ڕاوەستانی ڕەوتی بەرەو پێشچوونی سوپا، من بەتەواوی بێ ئومێد بووم. خۆجە سەرباری نەخۆشییەکەی، ورەی بەرنەدا. کەس پیاوی نەداینێ، تەنانەت ئەسپیشیان پێمان ڕەوا نەبینی. خۆجە چووە کن سوڵتان و نێزیکەی چل ئەسپێکی پەیدا کرد. زنجیری تۆپەکانی کردەوە و کۆمەڵێک پیاوی کۆ کردەوە. دوای ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژ هەوڵمان دا، لەگەڵ نێزیکبوونەوەی سوورایی خۆرنشینیدا، لە ژێر نیگای ئەوانەدا کە دەپاڕانەوە لە قوڕدا بچەقێت و نوقم ببێت، بەدەم لێدانی ئەسپەکانەوە جانەوەری زەبەلاحمان تەکانی دا. ئێوارەش، خۆجە بەرەنگاری ئەو شازادانە بووەوە کە خوازیار بوون ڕزگاریان بێت لێمان و دەیانگوت ئەو چەکە نەک هەر بەتەنیا نەگبەتی، بگرە گرفتی سەربازیش لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. بەڵام هەستم دەکرد ئیدی باوەڕیشی بە سەرکەوتن نەماوە.

شەو لە چادری خۆماندا بووین، عوودێکم بە دەستەوە بوو هەر لە سەرەتای سەفەرماندا لەگەڵ خۆم هێنابووم. ویستم کەمێک بژەنم، بەڵام عوودەکەی لە دەستم وەرگرت، فڕێی دایە گۆشەیەکەوە و گوتی: "داوای کەللەت دەکەن." پرسی: "ئەرێ بەمە نازانیت؟" دەمزانی. خۆشحاڵ دەبوو ئەگەر لەبری من، داوای کەللەی ئەویان بکردایە. پەیم بەوەش بردبوو، بەڵام هیچم نەگوت. لەوەدا بووم عوودەکەم هەڵبگرمەوە، دەستمی گرت و ویستی باسی ئەوێ، باسی وڵاتەکەمی بۆ بکەم. هەروەک ئەوەی بۆ سوڵتانم دەکرد، یەک دوو بەسەرهاتی خەیاڵکردم بۆ ئەویش گێڕایەوە، بەڵام لەپڕ هەڵچوو. ڕاستیی دەویست،

وردەكارییە ڕاستەقینەكان: پرسیاری دایكم و دەزگیرانەكەم و خوشك و براكانمی لێم كرد. لە كاتێكدا من وردەكارییە "ڕاستەقینەكان"م دەگێڕایەوە، ئەو خۆی هاویشتە ناو قسەكانمەوە و بەو ئیتاڵییەی كە لە منەوە فێر ببووبوو، لە ژێر لێوەوە چەند وشەیەكی خنكاو و بڕێك ڕستەی كورت و ناتەواوی گوتەوە و من نەمتوانی لە واتەكانیان بگەم.

ڕۆژانی دواتر، بەبینینی بڕێك شوورا و سەنگەری سووتێندراو و ڕووخێندراو كە قۆڵی پێشەوەی هێزەكانمان دەستیان بەسەریاندا گرتبوو، هەستم كرد وەك دوایین تیشكی هیوا كۆمەڵێك بیرۆكەی سەمەرە و درێوی بۆ هاتووە. سەرلەبەیانی، كاتی تێپەڕبوومان بەهێمنی بە گوندێكی ئاگر تێبەردراودا، كۆمەڵێك بریندارى بینی لەبن دیوارێكدا لە گیانەلادا بوون. لە ئەسپ دابەزی و بەرەو ڕوویان چوو. سەرەتا وام زانی دەیەوێت بە هانایانەوە بچێت، لەوە دەچوو ئەگەر وەرگێڕی لەتەكدا بوایە، پرسیاری دەرد و ئازاری لێیان بكردبایە. لە دوورەوە سەیرم دەكرد، دواتر تێ گەیشتم جۆش گرتی، وەك بڵێیت پەیم بەهۆی جۆشگرتنەكەی بردبوو. دەیویست شتی زۆر جیاوازیان لێ بپرسێت. ڕۆژی دواتر، كاتێك لەگەڵ سوڵتاندا چووین بۆ بەسەركردنەوەی شوار و سەنگەرەكانی ڕاست و چەپی ڕێگە، خۆجە لە هەمان جۆش و خرۆشدا بوو. هەر جارێك لە خانووە وێرانكراوەكان و لە نێوان دیواری تەختەی بە گوللەی تۆپ كون تێكەوتوودا بریندارێكی سەر هێشتا نەپەڕێندراوی دەبینی، خۆی دەگەیاندێ. منیش، بۆ ئەوەی شتی قۆڕی لێ نەوەشێتەوە و دواتر بەسەر مندا بهێندرێت، یان هەروا لەڕووی پەرۆشیمەوە دوای دەكەوتم. بریندارانی جەستە كون تێبوو بە فیشەك و پارچەی گوللە تۆپ وا دەهاتنە پێش چاو وەك ئەوەی پێش پۆشینی دەمامكی مردن بیانەوێت شتگەلێك بۆ خۆجە بگێڕنەوە. خۆجە خۆی بۆ پرسیار و وەڵام ئامادە دەكرد و چاوەڕێی دەكرد ئەو ڕاستییە قوڵەی كە بۆی هەبوو لەپڕ هەموو شتێك بگۆڕێت، لە دەمی ئەوان ببیستێت. بەڵام دەمبینی هێوا لێبڕاویی ڕووخساری ئەو بریندارانەی لەگەڵ مەرگدا زۆرانبازییان دەكرد، لەگەڵ بێ ئومێدیی خۆیدا

بەراورد دەکات. تا زیاتر لێیان نێزیک دەکەوتەوە، ئێستێکی دەکرد و بێدەنگ دەبوو.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، پاش ئەوەی بیستی سەرباری هەوڵی زۆر دەست بەسەر قەڵای دۆپیۆدا نەگیراوە و ئەمەش سوڵتانی تووڕە کردووە، بەهەمان جۆشی پێشـووەوە خۆی گەیاندە دەرباری سوڵتان. دوای گەڕانەوەی بەگومان بوو، بەڵام وا دیار بوو نەیدەزانی لە چ بەدگومانە. داوای لە سوڵتان کردبوو چەکی زەبەلاح بخاتە شەڕەوە و پێی گوتبوو ساڵانێکی درێژ ئەو ئامێرەی بۆ ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆ دروست کردووە. بە پێچەوانەی بۆچوونی منەوە، سوڵتان گوتبووی کاتی هاتووە، بەڵام فەرمووبووی جارێ پێویستە چاوەڕێی شازادە ساری حوسێن بکرێت، چونکە ئەویش هەمان ئەرکی پێ سپێردراوە. بۆچی ئەمەی گوتووە؟ ئەمە یەکێک بوو لەو جۆرە پرسیارانەی چەندین ساڵ بوو من نەمدەزانی لە خۆی دەپرسێت، یاخۆ لە من؟ نازانم لەبەر چی بوو وام بەخەیاڵدا هات پێی وا بێت من هەست بە نێزیکی لەو ناکەم و لە تاو بێ ئۆقرەیی خۆم بێزار بووم. خۆی وەڵامی دایەوە: "چونکە ترسی ئەوەیان هەیە من لە بەشە سەرکەوتنی ئەوان بخۆم."

نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، پاش ئەوەی بیستمان شازادە ساری حوسێن هێشتا قەڵاکەی پێ نەگیراوە، خۆجە گشت هەوڵی خۆی خستە کار بۆ ئەوەی بڕوا بەو وەڵامەی خۆی بهێنێت. لەبەر ئەوەی واتەوات سەبارەت بە شوومی و سیخوڕیی من زۆر تەشەنەی کردبوو، ئیدی من نەدەچوومە چادری سوڵتان. شەو، کاتێک بەمەبەستی ڕووداوەکانی ڕۆژ ڕووی لە چادری سوڵتان کردبوو، خۆجە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی سەرکەوتن و بەختەوەریدا سەرکەوتبوو، بە ڕووخساری سوڵتانیشەوە دیار بووە باوەڕی پێی هێناوە. لە گەڕانەوەیدا بۆ چادر، گەشبینی کەسێک کە باوەڕی وایە دواجار قاچی ئیبلیس دەشکێت، باڵی بەسەریدا کێشابوو. گوێم بۆی ڕاگرت، نەک لەبەر گەشبینییەکەی، بگرە لەبەر ئەوەی چاودێریی هەوڵی بێ وچانیم بۆ خۆ لەسەرپێ ڕاگرتنی دەکرد.

دیسان بایدایەوە سەر باسی بەسەرهاتە کۆنەکان و ئێمە و ئەوان و

سەرکەوتنی چاوەڕوانکراو، بەڵام خەمیگینییەک لە دەنگیدا هەبوو من پێشتر لە گـێـڕانەوەی بەسـەرهاتەکـاندا هیچ پێی ئاشنا نەبووم: دەتگوت باسی بیرەوەرییـەکی هـاوبەشی سـەردەمی منداڵیمـان دەکـات. عـوودەکـەم گـرتەوە دەسـتم، ئەمـجـار هیچ دەنگی نەکرد. من نەزانانە زیقـەم لە عـوود هەڵسـاند. ئەویش باسی ڕۆژانی جـوانی داهـاتووی دەکـرد و دەیگوت ئەوسـا دەتـوانین ڕەوتی ڕووبار ئاڕاسـتـەی ئەو لایە بکەین کـە خـۆمـان مـەبەسـتـمـانە، بەڵام هەردووکمـان دەمـانزانی لە بارەی ڕابردووەوە دەدوێت. لە زەینی خـۆمـدا داری بێ جـووڵەی ناو باخـچـەیەکی پشـتـەوە، ژووری گـەرم و ڕووناک و مـێـزێکی خواردنم دەبینی بە خزم و کەسوکار دەور درابوو. بەدرێژاییی ئەو هەموو ساڵە یەکەم جارم بوو بە گوێگرتن لە خۆجە هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد. دەیگوت ئەمـانەی ئێرەی خـۆش دەوێت و لەبەر شـانی گـرانە لێیـان دوور بکەوێتـەوە، منیش قسـەکانیم بۆی سـەلماند. گوتی مرۆڤ دوای بیرکردنەوە لەمانەی ئێرە گەمژەکانی بیر دەکەوێتەوە و لەگەڵ ئەم قسەیدا هەڵچوو، من دیسان قسەکانیم بۆی سەلماند. پێ دەچوو گەشبینییەکەی لەبەرامبەر داهاتوودا زۆر ڕووکەشانە بێت. ڕەنگە لـەبەر ئەوە بووبێت هەردووکمـان پەیمان بەو ژیانە نوێیـەی بردبێت کـە بەو زووانە دەسـتـی پێ دەکـرد، یان بەهـۆی ئەوەوە بووبێت ئەگـەر منیش لەجێی ئەو بوومایە، هەمان شتم دەکرد. بڵێم چی، نازانم!

سـەرلەبەیانـی ڕۆژی دوایی، لە کاتێکدا بەمـەبەستی تاقیکردنـەوە چەکمـان بەرەو سـەنگەرێکی بچـووکی دوژمن لـە نێـزیک ڕێـی خـۆمـان بەڕێ کـرد، هەردووکمان بە هەستێکی سەیری پێشوەختەوە دەمانزانی ئامێرەکەمان بە کەڵکی هیچ شتێک نایەت. سوڵتان بۆ پشتوانیکردنمان، نێزیکەی سەد پیاوی خستبووە خزمەتمان. بەڵام لە دوای یەکەم هێرشی چەکەکەمان، ڕۆیشتن و بڵاوەیان کـرد. چەکی زەبەلاح هەندێکیـانی پان کـردەوە و لەتوپەتی کـردن. برێکیشیان بەهۆی تەکانی کاریگەریی چەکەکەمانەوە کە دوای تەقاندنی چەند گوللەیەکی ئەنجام نەپێکاو نامـەردانە لە قـوڕدا چەقی، بەرکـەوتن و کوژران. بەشی زۆریشـمـان لە ترسی شـوومـی و نەگبـەتی هەڵهـاتین، نەمـانتـوانی کـۆ

ببینەوە و خۆمان سەرلەنوێ بۆ پەلامار ساز بدەینەوە. دڵنیام هەردووکمان لەو ساتەدا بیرمان لە هەمان شت کردووەتەوە.

دواتر پیاوەکانی شازادە حەسەنی قەڵەو بێ ئەوەی زیانێکی زۆریان لێ بکەوێت، بە سەعاتێک سەنگەرەکەیان گرت. خۆجە پاش بیستنی ئەم هەواڵە ویستی بە ئومێدێکی ترەوە، پێم وا بێت منیش ئەمجار زۆر بەباشی لێی حاڵی بووبووم، ئەو زانیارییە قوڵە بسەلمێنێت کە هەڵوەدای بوو، بەڵام سەرلەبەری سەربازەکانی ناو سەنگەر بە شمشێر لەتکرابوون. تەنانەت لەبن دیوارە ڕووخاو و ماڵە ئاگر تێبەربووەکانیشدا کەس بەدەم گیان کێشانەوە نەدەبیندرا. کاتێکیش ئەو کەللە سەرانەم بینی کە بەمەبەستی بردنیان بۆ بەردەم سوڵتان کۆ کرابوونەوە، یەکسەر تێ گەیشتم بیر لە چ دەکاتەوە. لەوەش زیاتر، ڕەواییم بەپەرۆشی و گەڕانی خۆجە بەدوای زانستدا بەخشی، وەلێ ئیدی نەمدەویست زۆر چوونە پێشەوەی ببینم. پشتم تێ کرد، بەڵام دوای کەمێک خۆم پێ ڕانەگیرا و سەیرێکم کرد. لە کەللە سەرەکان دوور دەکەوتەوە و هیچ ڕۆژێکیش تێ نەگەیشتم تا چ ڕادەیەک لە نەخشەکانی ناو سەریدا چووەتە پێشێ.

نیوەڕۆ، پاش ئەوەی گەڕاینەوە بۆ ناو کاروانی سوپا، گوتیان هێشتا دەست بەسەر قەڵای دۆپیۆدا نەگیراوە. سوڵتان بەتەواوی هەڵچووبوو، باسی سزادانی شازادە ساری حوسێنی کردبوو. گوتبووی بەهەموو سوپاوە بۆ ئەوێ دەچین! بە خۆجەی گوتبوو ئەگەر تا ئێوارە قەڵا نەگیرێت، ئەوا ئامێرەکەی ئێمە لە هێرشی سبەینێدا بەشدار دەبێت. لەو کاتەدا دەستووری دابوو لە ملی قۆماندانێک بدرێت، چونکە بەدرێژایی ڕۆژێک نەیتوانیبوو دەست بەسەر سەنگەرێکی بچووک بگرێت. چەکەکەمان گەیشتبووەوە کاروانی سوپا. سوڵتان گوێی بە سەرنەکەوتنی چەکی زەبەلاحمان لەبەرامبەر سەنگەرێکی بچووکدا، یان قسە و قسەڵۆکی لەمەڕ نەکبەتیی ئامێرەکەمان نەدا. خۆجە ئیدی باسی وەرگرتنی بەشی خۆی لە سەرکەوتن نەدەکرد. نەیدەدرکاند، بەڵام دەمزانی بیر لە چی دەکاتەوە: کۆتایی گەورەی

ئەستێرەناسانی پێشوو؛ یان کاتێک من منداڵیی خۆم و ئاژەڵەکانی ناو کێڵگەکانی خۆمانم دەهێنایە پێش چاوم، دەمزانی هەمان شت بەخەیاڵی ئەویشدا ڕادەبووریت. دەمزانی ئەویش بیر لەوە دەکاتەوە گەیشتنی هەواڵی سەرکەوتن لە قەڵاوە دوایین بەختی ئێمەیە، بەڵام ڕاستییەکەی، باوەڕی بەو بەختە نەبوو، بگرە نەیدەویست باوەڕی پێی هەبێت. من دەمزانی کڵێسایەکی بچووکی ئاگرتێبەربووی گوندێکی وێرانکراو کە قەڵاکەی دوای شەڕێکی دژوار گیراوە و، پاڕانەوە و نزای دواتری قەشەی بوێریش هەستی ژیانێکی نوێی لەمەدا ورووژاندووە. دەمزانی ئاوابوونی خۆر لە پشت گردە بە دارستان داپۆشراوەکانی لای چەپمانەوە لە کاتی ڕەوتماندا بەرەو باکور، وەک لە مندا، لەویشدا هەستی لە کەموکورتیی بەدەری شتێکی دەخوڵقاند کە بە بێدەنگی و بەوردی لە قۆناغی پێگەیشتندا بوو.

دوای ڕۆژئاوابوون، پاش گەیشتنی هەواڵی ئەوەی نەک هەر شازادە ساری حوسێن تێکشکاوە، بگرە زانینی ئەوەی کە ئۆتریشی و مەجەڕستانی و کازاکەکانیش بەهانای پۆلۆنییەکانەوە هاتوون بۆ قەڵای دۆپیۆ، قەڵامان خۆیمان بینی. بەسەر گردێکی بەرزەوە بوو، سوورایی خۆرنشین لە چەند شوێنێکی قوولە بە ئاڵا خەمڵێندراوەکانی دەدا. سپی بوو؛ سپی و جوان. نازانم لە چییەوە بوو بیرم بۆ ئەوە چوو مرۆڤ تەنیا لە خەوندا دەتوانێت شتێکی وا جوان و دانسقە ببینێت. لەو خەونەدا بە پەشۆکاوی دەتەوێت بە ڕێگەیەکی پێچ و پەنای ناو دارستانێکی تاریکدا بگەیتە ڕووناکیی سەر گردەکە و ئەو باڵەخانە سپییە؛ وەک ئەوەی لەوێ ئاهەنگێک ساز بکرێت و تۆیش بخوازیت ئامادەی بیت، یان کامەرانییەک هەبێت؛ بەڵام ئەو ڕێگەیەی کە دەڵێیت ئێستا تا تاوێکی تر بەکۆتا دێت، هەر نابڕێتەوە و نابڕێتەوە. بیستم ڕووبارەکە لە تەختاییی نێوان دارستانی تاریک و دامێنی قەدپاڵدا زۆنگاوێکی بۆگەنی دروست کردووە، هێزەکانی پیادە، ئەگەرچی بە پشتیوانی تۆپ توانیویانە خۆیانی بۆ شۆڕ بکەنەوە، بەڵام نەیانتوانیوە بگەنە قەدپاڵەکە. من کاتێک بەمەم زانی، بیرم لەو ڕێیە دەکردەوە کە ئێمەی گەیاندبووە ئێرە.

هەموو شتێک وەک قەڵای سپی کە پۆلە باڵندەی بەسەریدا دەفڕین، جۆری قەدپاڵی بەردین کە تا دەهات تاریکتر دادەگەڕا و وێنەی دارستانی بێدەنگ و تاریک، بێ کێماسی دەینواند: دەمزانی زۆربەی ئەو شتانەی چەندین ساڵ بوو وەک ڕێککەوت بەسەرم هاتبوون، ئیدی بەناچاری ڕوو دەدەن؛ دەمزانی سەربازەکانمان هەرگیز ناگەنە قووڵە سپییەکانی قەڵاکە و دەمزانی خۆجەش وەک من بیر دەکاتەوە. ئەگەر بەیانی دەستمان بە هێرش بکردایە، بۆی هەبوو چەکەکەمان لە زۆنگاودا نوقم بێت و پیاوانی ناوی و دەوروبەری ڕووبەڕووی مەرگ ببنەوە. پاشان بۆ ئەوەی قسە و باسی شوومی و نەگبەتی و ترسی سەربازەکان هێور بکەنەوە، داوایان دەکرد کەللەی سەرم فڕێ بدرێتە بەردەمیان و دەمزانی خۆجەش بەقەد من پێشبینی ئەمەی کردبوو. هاتەوە بیرم چەندین ساڵ لەمەوبەر بەمەبەستی ئەوەی دنەی بدەم لە بارەی خۆیەوە بدوێت، باسی هاوڕێیەکی سەردەمی منداڵی خۆم بۆی کردبوو کە خۆمان لەسەر هاوکات بیرکردنەوە لە یەک شت ڕاهێنابوو. هیچ گومانم نەبوو لەوەی هەمان شت بەخەیاڵی ئەویشدا تێ دەپەڕی.

درەنگانی شەو چووە چادری سوڵتان، ماوەیەکی زۆر تێ پەڕی و هەر نەگەڕایەوە. لەبەر ئەوەی زۆر باش پێشبینیم دەکرد سوڵتان و شازادەکان داوای لێکدانەوەی ڕووداوەکانی ڕۆژ و داهاتووی لێ دەکەن و فرە باش دەمزانی ئەو چ دەڵێت، لەپڕ وام بەخەیاڵدا هات هەر لەوێ کوشتوویانەوە و وای بۆچووم پیاوکوژەکان دوای کەمێکی تر دەگەنە سەر منیش. دواتر خەیاڵم چوو بۆ ئەوەی لە چادر دەرچووبێت و بێ ئەوەی بە من بڵێت، ڕاستەوخۆ بەرەو قەڵای سپیی دیوار لە تاریکیدا دەرەوشاوە چووبێت. وام هێنایە بەرچاوی خۆم لە ئێشکگر و زۆنگاو و دارستانەکە پەڕیوەتەوە و زۆر لە مێژە خۆی گەیاندووتە وێندەرێ. خۆم زۆر تێک نەدا، لە کاتێکدا من چاوەڕێی ڕۆژی داهاتووم دەکرد و بیرم لە ژیانی نوێی خۆم دەکردەوە، ئەو هاتەوە، دوای سالانێکی زۆر و پاش گفتوگۆی درێژ و ورد لەگەڵ ئەوانەی ناو چادرەکەدا، زانیم خۆجە لە چادری سوڵتان هەمان ئەو شتانەی گوتبوو کە من پێشبینیم

کردبوو. هیچی بۆم نەگێڕایەوە، وەک کەسێک لەسەر سەفەر بێت، پەلەپەلی بوو. گوتی تەمێکی چڕ دەرەوەی داگرتووە. من لە مەبەستی تێ گەیشتم.

تا تاریک و لێڵی دەمەوبەیان باسی ئەوەم بۆی کرد چۆن شتە لە پاش بەجێماوەکانی وڵاتەکەم و ماڵەکەم بدۆزێتەوە، کێ لە ئەمپۆلی و فلۆرنسا دەماننناسێت و باسی خووی دایکم، باوکم، خوشک و براکانم بۆی کرد. باسی هەندێک جیاوازیی بچووک و تایبەتم بۆی کرد لەوانەی مرۆگەل لە یەکتر جیا دەکەنەوە. بەدەم قسەکردنەوە بیرم کەوتەوە من پێشتر هەموو ئەم شتانەم بۆی گێڕاوەتەوە تەنانەت تا بە خاڵە گەورەکەی سەر پشتی برای بچووکیشم دەگات. گەلێک جار، لە کاتی گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتانەدا بۆ سوڵتان، یان لە کاتی نووسینەوەی ئەم کتێبەدا، وا هەستم دەکرد بەسەرهاتەکانم لە ڕاستییەوە دوور بن و زادەی خەیاڵی خۆم بن، بەڵام ئەو کاتەی بۆ خۆجەم دەگێڕایەوە، بەتەواوی باوەڕم پێیان هەبوو. هەر بەڕاستیش خوشکەکەم لە کاتی قسەکردندا کەمێک زمانی دەیگرت. جلوبەرگیشمان کوژەکەی زۆریان پێوە بوو. ئەو شتانەش ڕاست بوون کە لە پەنجەرەی ڕووەو باخچەی پشتەوەی ماڵەکەماندا دەمبینین. دەمەوبەیانی هاتمە سەر ئەو باوەڕەی بۆیە کەوتوومەتە بەر جادووی ئەم بەسەرهاتانەم، چونکە پێم وا بوو، ئەگەرچی درەنگیش بێت، ڕەنگە ڕۆژێک لەو شوێنەوەی تیایدا ڕاوەستاون، دەست پێ بکەنەوە. دەمزانی خۆجەش بیر لە هەمان شت دەکاتەوە و بە خۆشحاڵییەوە باوەڕی بە بەسەرهاتی خۆی هەیە.

بێ پەلەپرووزێ و بێ ئەوەی یەک وشە بڵێین، جلوبەرگی خۆمان گۆڕییەوە. ئەنگوستیلە و مەدالیای خۆمم کە بەدرێژاییی چەندین ساڵ لە شاردنەوەیاندا لە پێش چاوی ئەو سەرکەوتوو بووم، ڕادەستی کرد. مەدالیاکەم وێنەی داپیرە و پرچی لە خۆوە سپیبووی دەزگیرانمی تێدا بوو. پێم وا بێت بەدڵی بوو، لە ملی کرد. دوایی لە چادر چووە دەرێ و ڕۆیشت. سەیری ونبوونی لەسەرخۆیم کرد لە ناو تەمی کپدا. خەریک بوو دەوروبەر ڕووناک دەبووەوە و منیش زۆر خەوم دەهات، چوومە جێگەی ئەوەوە و بە ئاسوودەیی لێی نووستم.

## ١١

ئیدی وا گەیشتمە کۆتاییی کتێبەکەم. لەوانەیە خوێنەرانی هۆشمەندم ڕایان وا بێت لە مێژە بەسەرهاتم بەکۆتا گەیشتووە و ڕەنگە تەنانەت کتێبەکەشیان فڕێ دابێتە لاوە. سەردەمانێک منیش بیرم لە هەمان شت دەکردەوە: ئەم پەڕانە کە ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر نووسیبوومن، بەنیازی ئەوەی جارێکی تر نەیانخوێنمەوە، فڕێم دابوونە گۆشەیەکەوە. ئەو سەردەمە نیازم وا بوو تەواوی هۆشی خۆم بدەمە کۆمەڵە چیرۆکێک کە بە چێژەوە بۆ خۆم هۆنیبوومنەوە، نەک بۆ سوڵتان: وەک چیرۆکی ئەو بازرگانەی بوو بە گورگ و تێکەڵ بە گەلەگورگ بوو؛ یان ئەو چیرۆکی ئەڤینانەی لە بیابانی چۆڵی وڵاتانی هەرگیز نەدیوم و لە دارستانە تەزیوەکاندا دەقەومان. دەمویست ئەم کتێبە و ئەم بەسەرهاتە لە بیر بکەم. پاش ئەو هەموو قسە و قسەڵۆکانەی بەر گوێم کەوتبوون، دوای گشت ئەو ڕووداوانەی بەسەرم هاتبوون، ئەگەرچی دەمزانی کارێکی وا ئاسان نییە، خەریک بوو زۆر بەئاسانی ئەو ئامانجەم بپێکم، بەڵام بە قسەی مێوانێک کە دوو هەفتە لەمەوبەر بۆ دیتنم هاتبوو، فریوم خوارد و سەرلەنوێ ئەم کتێبەم هێنایەوە دەرێ. ئەمڕۆ ئیدی دەزانم ئەمە خۆشەویستترین کتێبی منە و بڕیارم داوە وەک پێویست، جۆری ئەوەی خۆم دەمەوێت و بەپێی خەون و خەیاڵی خۆم بە ئەنجامی بگەیەنم.

ئەو کاتەی بۆ بە ئەنجانم گەیاندنی کتێبەکەم چوومە بەردەم مێزی کۆنمان، نیگام کەوتە سەر ئاشێکی ناو دار زەیتوونە دوورەکان و بەلەمێکی بچووکم بینی لە جەنەتحیسارەوە بەرەو ئەستەنبوڵ دەچوو. لای خوارەوەی باخچەکەش برێک منداڵم بینی بە شادمانی لە ناو دار هەنجیرەکاندا گەمەیان دەکرد، ئەو ڕێگە تۆزاوییەم دەبینی کە لە ئەستەنبوڵەوە دەچووە گەبزە. لە بەفری زستاندا،

ڕێبـــــواری زۆر بەو ڕێگەیەدا تێ نـاپەڕن، بەڵام بەهـاران و هـاوینـان ئەو کـاروانـانەم دەبینـی کـە بەرەو ڕۆژهـەڵات، بۆ ئەنـادۆڵ، بەغـدا و شـام بـەڕێوە بوون. هـەرە زیاتر، عـەرەبانەی دوای گـا بەوێدا تێ دەپەڕین و هێـدی هێـدی ڕێیان دەکرد.. هەندێک جاریش بە بینینی ئەسپسوارێک کە نەمدەتوانی لە دوورەوە جلوبەرگی بناسمەوە، ترپەی دڵم زیادی دەکرد. بەڵام کاتێک نێزیک دەکەوتەوە، حاڵی دەبووم خالۆی ڕێبوار بۆ لای من نایەت. بەم دواییانە کەس نەدەهات، ئیدی دەشمزانی نایەن.

بەڵام گـازندەشم نەدەکـرد و بـاکم لە تـەنیـایـی نەبوو: ئـەو سـاڵانەی وەک گەورەی ئەستێرەناسان کارم کردبوو، پارە و پوولێکی زۆرم پێکەوە نابوو، ژنم هێنابوو، چوار منداڵم هەبوو. هەر زوو لە کاتی گونجاودا دەستم لە کارەکەم هەڵگرت، چونکە پیشەکەم فێری کردبووم پێشوەخت هەست بەو کارەساتانە بکەم کـە لەوانە بوو دواتر بەسـەرم بێن. مـاوەیەکی زۆر بەرلەوەی سـوپای سـوڵتـان بەرەو ڤـیەنا بەڕێ بکەوێت و لێبـووکەکـانی دەوروبەری لە تاو ڕقی تێکشکان کەللەی گەورەی ئەستێرەناسانی دوای من بپەڕێنن و سوڵتانی ئالوودەی ئاژەڵ لە تەخت بهێننە خوارێ، من بۆ ئێرە، بۆ گەبزە، هەڵهاتم. ئەم خانووەم بە دروستکردن دا و لەگەڵ کتێبە خۆشەویستەکانم و منداڵەکانم و یەک دوو پیاوی خۆمدا تیایدا نیشتەجێ بووین. هاوسەرەکەم، ئەو کاتەی گـەورەی ئەستێرەناسـان بووم، خـواستبـووم، زۆر لە خـۆم گـەنجـتر بوو. کـەیبـانوویەکی شـارەزا بوو، گـەلێک بەباشی سـەری لە کـاروباری ناومـاڵ دەردەچوو، هەموو ئەرک و کاروباری گەورە و بچووکی منی لە ئەستۆی خۆی گرتبوو. ئیدی تەمەنم خۆی لە حەفتا ساڵ دەدا و هاوسەرەکەم بەدرێژاییی ڕۆژ بەتەنیا لەم ژوورەدا جێی دەهێشتم بۆ ئەوەی خەیاڵ بکەمەوە و کتێب بنووسم. بەمجۆرە، لە پێناوی دۆزینەوەی کۆتاییەک بۆ بەسەرهات و ژیانم، تێر و پڕ و بەکامی دڵ بیر لە (ئەو) دەکـەمەوە. ئەمە بەمەرجێک لە ساڵانی دەسپێکدا هەوڵم دەدا خۆم لەو بیرکردنەوەیە بپارێزم.

سـوڵتـان یەک دوو جـار ئارەزووی کـرد باسی (ئەو) بکـات، بەڵام بۆی دەرکەوت من بەهیچ جۆرێک پێم خۆش نییە خۆم لەقەرەی ئەو باسە بدەم. پێم

وا بوو ئەویش لەم هەڵوێستەم ڕازی بوو. ئەوەندە نەبێت دەیویست شتێکی بۆ ڕوون بێتەوە، بەڵام هەرگیز نەمتوانی بزانم دەیەوێت چی و تا چ ڕادەیەکی بۆ ڕوون ببێتەوە. هەر لە سەرەتاوە پێمی گوتبوو پێویست ناکات شەرم بکەم لە پای ئەوەی (ئەو) کاریگەریی لەسەرم داناوە و شتی لێوە فێربووم. پێمی دەگوت: "من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی هەموو ئەو کتێب و ساڵنامە و پێشبینیکردنانەی بەدرێژاییی ئەو ساڵانە پێشکێش بە منت کردووە، لە نووسینی (ئەو) بووە. ئەو کاتەی تۆ خزابوویتە کونیماڵەوە و سەرقاڵی پرۆژەی چەکەکەت بوویت، من هەمان شتم بە (ئەو) دەگوت. دەشزانم هەروەک چۆن (ئەو) هەموو شتێکی بە تۆ و تۆیش هەموو شتێکت بە (ئەو) گوتووە، ئەمەشی بۆت گێڕاوەتەوە." لەوانەیە لەو کاتەدا هێشتا هیچ کاممان سەری پەتەکەی لە دەست نەترازابێت، بەڵام هەستم دەکرد سوڵتان لەسەر زەمینێکی پتەوتر ڕاوەستاوە. ئەو کاتە سوڵتانم وا هاتە پێش چاو لە من ژیرتر بێت و هەر شتێک بۆ زانین بشێت دەیزانێت، بۆیە گەمەی دەکرد تا لەو ڕێیەوە من بخاتە لەپی دەستییەوە. لەوانەیە کاریگەریی قەرزارباریشم بەسەر ئەم هەڵوێستەمەوە هەبووبێت، چونکە سوڵتان منی لە دەست ئەو سەربازانە ڕزگار کرد کە بەهۆی تێکشکانمان لە زۆنگاوەکەدا و بەهۆی واتەواتی شوومی و نەگبەتییەوە هار بووبوون و داوای پەڕاندنی کەللەی سەری منیان دەکرد. ئەگەر سوڵتان لە ساڵانی سەرەتادا بە ڕاشکاوی پرسیاری بکردبایە، لەوانەبوو هەموو شتێکی بۆ بگێڕمەوە، چونکە ئەو کاتانە هێشتا قسە و قسەڵۆکی لەمەڕ ئەوەی "من من نیم"، تەشەنەی نەکردبوو. دەمویست لەگەڵ کەسێکدا سەبارەت بە ڕووداو و پێشهاتەکان بدوێم. تاسەی (ئەو)م کردبوو.

بەتەنیا ژیان بەسەربردن لەو ماڵەی ساڵانێکی زۆرمان پێکەوە تێدا گوزەراندبوو، بێ ئۆقرەییی منی زیاتر دەکرد. گیرفانەکانم پڕ بوون لە پارە، لەو سەروبەندەدا بوو لاقەکانم لەسەر ڕۆیشتن بۆ بازاڕی بەدیلگیراوان ڕاهات. دواجار بەلەنگازێکم کڕی، نە بە (ئەو) دەچوو، نە بە من، هێنامەوە بۆ ماڵ. شەو، ئەگەر چوومە بەردەم ئاوێنە و داوام لێ کرد هەموو شتێکم فێر بکات، باسی وڵات و ڕابردووی خۆیم بۆ بکات و لەوەش زیاتر خراپەکارییەکانی خۆیم

بۆ بگێڕێتەوە، لێم ترسا. شەوێکی بەرباد بوو، بەزەییم بەو داماوەدا هاتەوە و بڕیارم دا سبەینێ ئازادی بکەم. بەڵام بەخێلی یەخەمی گرت، بۆیە بردمە بازاڕی دیلەکان و فرۆشتمەوە. دواتر بە گەڕەکدا بڵاوم کردەوە کە بڕیاری ژن هێنانم داوە. لەبەر ئەوەی پێیان وا بوو منیش دەبمە کەسێکی وەک ئەوان و ئاسوودەیی باڵ بەسەر گەڕەکدا دەکێشێت، بە شادمانییەوە هاتنە لام. منیش ڕازی بووم بچمە ڕیزی ئەوانەوە، گەشبین بووم، بیرم دەکردەوە قسە و قسەڵۆک بەکۆتا دێت، ساڵانی ساڵ چیرۆک و بەسەرهات بۆ سوڵتانی خۆم دەهۆنمەوە و بە ئاسوودەیی دەژیم. ژنەکەم زۆر بەوردی هەڵبژارد. شەوانە عوودیشی بۆم دەژەند.

کاتێک واتەوات سەری هەڵدایەوە، سەرەتا پێم وا بوو گەمەیەکی سوڵتانە، چونکە باوەڕم وا بوو چێژ لەوە وەردەگرێت چاودێریی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی من بکات و بە پرسیارکردن تووشی سەرسووڕمانم بکات. دەسپێک، ئەگەر لە خۆیەوە قسەی لە جۆری "ئایا خۆمان دەناسین؟ پێویستە مرۆڤ خۆی باش بناسێت"ی دەکرد، زۆر نیگەران نەدەبووم؛ چونکە دەمزانی لێبووکەکان دیسان دەوریان داوە و ئەو پرسیارە وەڕسکەرانە لە لەوچەیەکی شەیدای فەلسەفەی یۆنانەوە فێر بووە. پاش ئەوەی منی ڕاسپارد شتێک لەو بارەیەوە بنووسم، نوێترین کتێبی خۆم پێشکێشی کرد. ئەو کتێبە تایبەت بوو بە چیرۆکی کارمامز و چۆلەکەی شادمان و بێ خەم. شادمان بوون، چونکە بیریان لە خۆیان نەدەکردەوە و لە خۆیان نەدەپرسی ئێمە کێین؟ کاتێک بیستم کتێبەکەی بەهەند گرتووە و بەچێژەوە خوێندوویەتییەوە، ئاهێکم بەبەردا هاتەوە، بەڵام هێشتا قسە و قسەڵۆکم پێ دەگەیشتەوە: دەگوترا من سوڵتان بە گەمژە دەزانم، چونکە هیچ لەو کەسە ناچم کە شوێنیم گرتووەتەوە، گوایە (ئەو) لاواز و من قەڵەو بووم. ئەگەر دەمگوت من ناتوانم هەموو شتەکانی (ئەو) بزانم، منیان بە درۆزن دەزانی و پێیان وا بوو منیش ڕۆژێک لە گەرمەی شەڕێکدا و دوای هێنانی نەگبەتی بەسەر سوپادا وەک (ئەو) هەڵدێم، نهێنییەکانی شەڕ بە دوژمن دەگەیەنم، ڕێ بۆ بەزینی سوپا خۆش دەکەم و هتد... بۆ خۆپاراستن لەم قسانە کە پێم وا بوو لە سوڵتانەوە سەرچاوە دەگرن، پێم لە ئاهەنگ و

بەزم و ڕەزم بڕی، زۆر لە نێواندا نەدەبیندرام و لاواز بووم. بەوردی دوای ئەو بابەتانە کەوتم کە دوایین شەو لە چادری سوڵتاندا باس کرابوون و هەموویم بۆ ڕوون بووەوە. ژنەکەم یەک لە دوای یەک منداڵی دەبوو. داهاتێکی باشم هەبوو، دەمویست واتەوات، (ئەو) و ڕابردوو لە بیر بکەم و بە ئاسوودەیی درێژە بەکاری خۆم بدەم.

نێزیکەی حەوت ساڵ خۆم پێ ڕاگیرا. ئەگەر ئۆقرەم لێ نەبڕایە، یان ڕوونتر بڵێم ئەگەر پەیم بە خاوێنکردنەوەیەکی تری دەوروبەری سوڵتان نەبردبایە، دەمتوانی تا کۆتایی بەردەوام بم، چونکە بە تێپەڕبوون بەو دەرگایانەدا کە سوڵتان بۆمی خستبونە سەرپشت، ناسنامەی کۆنی خۆم سڕیبووەوە و دەمویست بەیەکجاری لە بیری خۆمی ببمەوە. ئیدی بەشێوەیەکی بێ سەروبەر وەڵامی پرسیارەکانی تایبەت بە ناسنامەم دەدایەوە، چونکە پێشووتر منیان نیگەران کردبوو: دەمگوت: "ئەوە کەی گرینگە مرۆڤ کێیە یان کێ نییە، گرینگ کار و کردەوەمانە. پێم وا بێت سوڵتان لەم دەرگایەوە چووە دۆلابی ئەقڵمەوە! داوای لێم کرد باسی ئەو وڵاتەی بۆ بکەم کە (ئەو) بۆی هەڵاتووە، باسی ئیتاڵیا. کاتێک دەمگوت زانیاریی ئەوتۆم نییە، ئەو هەڵدەچوو: "بە منی گوتووە هەموو شتێکی بۆ تۆ گێڕاوەتەوە، بۆچی دەترسیت، قسەکانی (ئەو) بێنەوە بیری خۆت و هیچی دی. منیش ناچار باسی منداڵیی (ئەو) و یەک بەیەکی ئەو بیرەوەرییە جوانانەم بۆ سوڵتان ڕیز کرد کە بەشێکیشیم خستۆتە دووتوێی ئەم کتێبەوە. سەرەتا هێندە ئۆقرەم لێ نەبڕابوو، سوڵتان بەجۆرێک گوێی لێم دەگرت وەک ئەوەی باسی کەسی سێیەمی بۆ بکەم. بەڵام ساڵانی دواتر زۆر چووە پێشەوە. ئیدی بەجۆرێک گوێی بۆ قسەکانم ڕادەگرت وەک ئەوەی گوێی بۆ (ئەو) ڕاگرتبێت: بەڵام هەر جارێک پرسیاری وردەکارییەکانی لای (ئەو)ی دەکرد، داوای لە من دەکرد نەترسم و ئەو وەڵامەی بدەمەوە کە لەو ساتەدا بەخەیاڵمدا دێت: "دوای کام ڕووداو خوشکەکەی تووشی قسە بزرکاندن بووبوو؟ بۆچی لە زانکۆی پادووا وەرنەگیرابوو؟ لە یەکەم تەدارەکی فیشەکبازیدا کە (ئەو) لە ڤینیسیا سەیری کردبوو، ڕەنگی جلوبەرگی براکەی چۆن بوو؟" ئەو کاتانەی ئەم وردەکارییانەم بەجۆرێک وەک ئەوەی بەسەر خۆم

هاتبێت بۆ سولتان دەگێڕایەوە، یان پێکەوە بە بەلەم بە ئاوی دەریادا دەگەڕاین؛ یان بەدیار حەوزێکی گوڵڕەنگی پڕ لە بۆقەوە بووین؛ یان لە بەردەم قەفەسی زیوینی مەیموونە بێ ئابڕووەکاندا بووین؛ یان لە یەکێک لەو باخچانەدا بووین کە پڕ بوو لە بیرەوەریی ئەو سەردەمانەی پێکەوە پیاسەمان تیایاندا دەکرد. ئەو کاتانە سولتان بە چیرۆکەکان و بە گەمەی پشکوتنی گوڵ لە باخچەی مێشکماندا خۆشحاڵ دەبوو، زیاتر لە من نێزیک دەبووەوە و بەشێوەیەک باسی (ئەو)ی دەکرد وەک ئەوەی بەدوای دۆستێکی دێریندا بگەڕێت کە ناپاکی لە هەردووکمان کردبێت: لەو کاتانەدا بوو گوتی: (باشی کرد هەڵهات، ئەگەر نا، سەرباری ئەوەی سەفای زۆری بۆم دەسازاند، زۆر بیرم کردبووەوە بەرگەی بێ ئابڕوویی نەگرم و ڕۆژێک دەستووری کوشتنی بدەم.) دواتر، لەبەر ئەوەی سەرم لێ دەرنەدەچوو باسی کاممان دەکات، بە چەند لێدوانێک منی ترساند، بەڵام بەتوندی نا، بە میهرەبانی قسەی دەکرد: ڕۆژی وا هەبووە ترساوە لەبەرامبەر نەزانیی (ئەو)دا خۆی پێ ڕانەگیرێت و بڕیاری کوشتنی بدات و هێندەی نەماوە لە دوایین شەودا بانگی پیاوکوژان بکات! پاشان گوتی: "تۆ بێ ئابڕوو نیت، خۆشت بە ژیرترین و بێ تاوانترین مرۆڤی جیهان دانەناوە؛ کارەساتی پەتاکەشت لە بەرژەوەندیی خۆت لێک نەداوەتەوە. بە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو پادشا بچووکەی لەسەر مێخ دانراوە، شەوانە خەوت لە چاوی کەس نەفڕاندووە. کەسیشت نەبووە دوای بیستنی خەونەکانی سولتان بۆ ماڵ ڕابکەیت و بەدەم کاڵتە پێکردنەوە بۆی بگێڕیتەوە. کەست نەبووە بۆ فریودانی سولتان چیرۆکی قۆڕ و پڕ لە بەزمی لەگەڵدا بنووسیت!" کاتێک گوێم بۆ ئەم قسانە ڕادەگرت، بەترسەوە هەستم دەکرد خۆیشم و هەردووکمان، وەک لە خەوندا، لە دەرەوە دەبینم و سەری پەتەکەم لە دەست ترازاوە. بەڵام لە چەند مانگی ڕابردوودا سولتان وەک ئەوەی بیەوێت شێتم بکات، زیاتری دەگێڕایەوە: "تۆ لەو ناچیت، وەک (ئەو) هەموو هۆشی خۆت نەداوەتە ئەو سۆفیگەرییەی کە ئێمە لە ئەوان جیا دەکاتەوە! سالانێکی زۆر لەمەوبەر، ئەو دەمەی من هەشت سالان بووم و ئێوە هێشتا منتان نەناسیبوو، پێکەوە تەدارەکێکی فیشەکتان کرد و منیش لە کەناری ئەوبەرەوە

سەیرم دەکرد. ئیبلیسەکەی تۆ ئەوەی (ئەو)ی لە تاریکایی ئاسماندا بەسەرکەوتن گەیاند و ئێستا لەگەڵ (ئەو)دایە، لەتەک (ئەو)دا چووەتە ولاتێک پێی وایە ئاسوودەیی تێدا دەدۆزێتەوە!" دواتر لە میانەی گەڕانی بەردەوامەمان بەناو باخچەکاندا سوڵتان دەیپرسی: "باشە مرۆڤ هەر دەبێت سوڵتان بێت تا بتوانێت حاڵی بێت مرۆگەل لە سەرانسەری جیهاندا لە یەک دەچن؟" بە ترسەوە بێدەنگ دەبووم. وەک ئەوەش بیەوێت دوایین هێڵی بەرگریم بڕووخێنێت، دەیپرسی: "ئایا توانای مرۆڤ بۆ جێگرتنەوەی یەکدی باشترین بەڵگە نییە بۆ ئەوەی کە مرۆگەل هەموویان لە یەک دەچن؟" ئیدی بەو جۆرە کار لە کار ترازابوو.

پێ دەچوو بتوانم بە پشوودرێژیی خۆم بەرگەی هەموو ئەمانە بگرم، چونکە ئومێدم وا بوو ڕۆژێک دێت سوڵتان و منیش (ئەو) لە بیر خۆمان ببەینەوە و بیریشم لە پێکەوەنانی پارەی زیاتر دەکردەوە. ئیدی لەسەر ترسان لە ناڕوونی و لێڵی ڕاهاتبووم، بەلام سوڵتان وەک ئەوەی بەسەر ئەسپەوە بەدوای کەوڕێشکدا غار بدەین و لە دارستاندا ڕێمان هەڵە کردبێت، بەشێوەیەکی زۆر بێ پەروا دەرگاکانی ئەقڵمی دەکردەوە و دای دەخست. لە هەمووشی خراپتر، ئەمەی بە پێش چاوی هەموانەوە دەکرد. دیسان هەمان ئەو لێبووکانە دەورەیان دابوو، لەبەر ئەوەی پەیم بە نێزیکبوونەوەی کارەسات، خاوێنکردنەوەیەکی نوێ و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی هەمووماندا بردبوو، ترسام. ئەو ڕۆژەی سوڵتان داوای لێم کرد دەربارەی پردەکانی ڤینیسیا، قردێلەی ڕازاوەی سەرپۆشی سەر ئەو مێزەی (ئەو) لە سەردەمی منداڵیی خۆیدا نانی بەیانیانی لەسەر دەخوارد، ئەو ساتەی بۆ ئەوەی ببێت بە موسڵمان، هێندەی نەمابوو سەری ببەڕێندرێت و ئەو دیمەنانەی لە پەنجەرەی ڕووەو باخچەی پشتەوەی ماڵەکەیاندا دەیبینێت، قسەی بۆ بکەم و داوای لێم کرد هەمووی، وەک ئەوەی کتومت بەسەر خۆم هاتبێت، لە کتێبێکدا بنووسمەوە، بڕیارم دا بە زووترین کات لە ئەستەنبوڵ هەڵبێم.

بەمەبەستی لە بیرکردنی (ئەو)، لە گەبزە، لە ماڵێکی تردا نیشتەجێ بووین. سەرەتا لەوە دەترسام پیاوانی کۆشک بێن، بمدەنە پێش خۆیان و بمبەن، بەلام

نەکەس بەدوامدا هات و نە کەس لێمی پرسییەوە. کەسیش دەستی لە داهاتەکانم نەدا. یان دەبوو لە بیر کرابم، یاخۆ لە ژێر چاودێریی نهێنیی سوڵتاندا بووم. گوێم نەدایێ و درێژەم بە کارەکانم دا. ئەم خانووەم بە بنیاتنان دا و باخچەی پشتەوەم بە ئارەزووی خۆم و بەجۆرێک لە ئاستی وەلامدانەوەی دەنگەکانی ناخمدا بێت، ڕازاندەوە. کاتی خۆم بە خوێندنەوەی کتێب، نووسینی چیرۆکی پڕ لە بەزم بۆ خۆشیی خۆم و لەگەڵ ئەو میوانانەدا بەسەر دەبرد کە بەهۆی ئەوەی کۆنە گەورەی ئەستێرەناسان بووم، بۆ پرس و ڕاوێژ دەهاتە کنم. منیش کەمتر بۆ پارە و زیاتر بۆ بەزم و سەرگەرمیی خۆم گوێم بۆ چیرۆک و بەسەرهاتیان ڕادەگرت. دەتوانم بڵێم ئەو ماوەیە بەباشترین شێوە ئەو وڵاتەم ناسی کە منداڵیی خۆمم تیایدا بەسەر بردبوو: کەمئەندامان، کەسانی داماوی کوڕ و برا لێ بزر بوو، نەخۆشانی بێچارە، باوکانی خاوەن کچی قەیرە، ئەو گرکنانەی بالایان هیچ زیادی نەدەکرد، پیاوانی دڵپیس، کوێر، بەلەموان و ئەڤیندرانی سەودا و سەرگەردان دەهاتنە لام. منیش بەرلەوەی داهاتوویان بۆ بخوێنمەوە، بە دوور و درێژی گوێم بۆ بەسەرهاتی ژیانیان ڕادەگرت و لە دەفتەرێکدا دەمنووسییەوە بۆ ئەوەی، کتومت وەک لەم کتێبەدا کردوومە، دواتر بیخەمە سەر چیرۆکەکانی خۆم.

هەر لەو سالانەدا پیاوێکی بەسالاچووم ناسی کە لەگەڵ خۆیدا خەمێکی بۆ ژوورەکەم هێنا. دەبێت دە، یان پازدە ساڵ لە من بەتەمەنتر بووبێت. ناوی ئەولیا بوو. بە بینینی خەمی سەر ڕووخساری، دەمودەست بۆم دەرکەوت کوشتەی دەستی تەنیاییە، بەلام ئەو وای نەگوت: سەرتاپای تەمەنی خۆی بۆ گەڕان و گەشتنامەیەکی دە بەرگی کە لە تەواوبووندا بوو، تەرخان کردبوو. دەیویست بەرلەوەی مالئاوایی لە ژیان بکات، بچێتە مەککە و مەدینەی نیزیکترین شوێن لە خوا، خوازیار بوو لە بارەیانەوە بنووسێت. بەلام کێماسییەک لە کتێبەکەیدا هەبوو ئۆقرەی لێی بڕیبوو. بەنیاز بوو باسی ئیتالیا بۆ خوێنەرانی بگێڕێتەوە، پێشتریش زۆری لە بارەی کانیاو و پردەکانییەوە بیستبوو. ناوبانگی منی لە ئەستەنبوڵ بیستبوو، هاتبووە لام و پرسیاری لێم کرد داخۆ دەتوانم باسی ئەوێی بۆ بکەم؟ من گوتم هەرگیز

ئیتاڵیام نەدیوە. ئەویش گوتی وەک گشت کەسێکی تر بەمە دەزانێت. ئەمجار گوتی بەڵام تۆ سەردەمانێک کۆیلەیەکی خەڵکی ئەو وڵاتەت هەبووە و هەموو شتێکی بۆت گێڕاوەتەوە. پێشنیازی کرد ئەگەر من ئەو شتانەی بۆ بگێڕمەوە، ئەویش چیرۆکی بەچێژم بۆ دەگێڕێتەوە. گوتی مەگەر خۆشترین لایەنی ژیانت هۆنینەوە و گوێگرتن لە چیرۆکی بەتام و پڕ لە چێژ نییە؟ بە دوودڵییەوە نەخشەیەکی لە جانتاکەی دەرهێنا، خراپترین نەخشەی ئیتاڵیا بوو تا ئەو کاتە دیبێتم. بڕیارم دا باسی ئیتاڵیای بۆ بکەم.

بە دەستی خرپنی کە منداڵی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ، ئاماژەی بۆ شارێکی سەر نەخشەکە کرد، پاش خوێندنەوەی ناوی شارەکە بە حینجە، بەوردی ئەو فانتازیایانەی منی تۆمار کرد کە لە بارەی ئەو شارەوە بۆم گێڕایەوە. بۆ هەر شارێکیش بەسەرهاتێکی دانسقە و پڕ لە سەمەرەی دەویست. بەو جۆرە، شەوێک تا بەیانی دانیشتین و لە سیازدە شەودا لە باکورەوە بۆ باشوور بە سیازدە شاری ئەو وڵاتەدا گەڕاین و منیش یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا دەمبینی. پاشان کەشتییەک ئەوی لە سیسیلیاوە بۆ ئەستەنبوڵ هێنایەوە. ئەویش لە گێڕانەوەکانم ڕازی بوو، بڕیاری دا لە پاداشتی ئەوەدا دڵم خۆش بکات و کەوتە گێڕانەوەی باسی ونبوونی تەنافبازەکان لە ئاسمانی عەکا؛ ژنێک قۆنیا کە لەبری منداڵ، فیلی بووە؛ گای شین و باڵداری کەنار ڕووباری نیل؛ پشیلەی پەمەیی؛ قوولەی سەعاتی ڤیەنا؛ ددانەکانی پێشەوەی کە لەوێ بە دروستکردنی دابوون و بە زەردەخەنەوە پێشانی منی دان؛ ئەشکەوتی قەسەکەری کەنار دەریای ئازۆف و مێرووولەی سووری ئەمریکا. ئەم بەسەرهاتانە، لەبەر هۆیەکی نەزانراو خەمێکی نامۆیان لە ناخمدا چاند و لە قووڵایی هەناومەوە دەمویست بگریم. تەواوی سوورایی خۆر لە ژوورەکەمی دابوو؛ کاتێک ئەولیا لێمی پرسی داخۆ منیش چیرۆک و بەسەرهاتی سەیر و سەمەرەم لەکن دەست دەکەوێت، یان نا، داوام لێی کرد خۆی و پیاوەکانی لای ئێمە ڕۆژ بکەنەوە، چونکە بەڕاستی دەمویست تووشی سەرسووڕمانی بکەم. پێم گوت چیرۆکێکم هەیە دەربارەی دوو کەس کە جێی یەکیان گرتووەتەوە و زۆرت پێ خۆش دەبێت.

شـــەو، دوای ئـەوەی هـەرکـــەس چووە ژووری خــۆی و ئەو بێــدەنگیــیــەی هـەردووکـــمـــان چاوەڕێی بـووین، هاتـە ئاراوە، گـــەڕاینـەوە بـۆ ژوورەکـــە. بۆ یەکەمجار لەو کاتەدا پێشبینیی ئەم چیرۆکەم کرد کە ئێستا ئێوە وا خەریکن لە خوێندنەوەی دەبنەوە! لـەوە نەدەچوو چیرۆکەکەم دەستکرد بێت، وەک ئەوە وا بوو کەسێکی تر بە نەرمی هەموو ئەو وشانەی بە گوێی مندا چرپاندبێت و ڕستەکان هێدی هێدی بەدوای یەکدا ڕیز بووبن: "ئەو کاتەی کەشتییەکانی تورک ڕێیان پێمان بڕی، لە ڤینیسیاوە بەرەو ناپۆلی دەچووین..."

درەنگانێکی دوای نیوەشەو، پاش کۆتاییهێنان بە بەسەرهاتم، بێدەنگییەکی درێژ هـاتە ئاراوە. هـەسـتـم دەکـرد مـێـوانەکـەم و خـۆشـم بیـرمـان لـە (ئەو) دەکردەوە، بەڵام (ئەو)ێکی زۆر جیاواز لەوەی من لە سەری ئەولیادا بوو. هیچ گـومـانم نەبوو لەوەی لەو ســاتەدا بیــر لـە ژیانی خــۆی دەکـاتەوە! منیش بەخــەیاڵمـدا هـات ژیانی خــۆم و (ئەو) و بەســەرهاتی خــۆم خــۆش دەوێت. شانازیشم بە سەرجەم ئەو ڕووداوانەوە دەکرد کە بەکردەوە بەسەرم هاتبوون، یاخۆ بەخەیاڵمدا ڕابووردبوون. ئەو ژوورەی تیایدا دانیشتبووین، تژە بوو لە بیرەوەریی ئەو شتانەی سەردەمانێک دەمانویست بە ئەنجامی بگەیەنین. ئەو کــاتـە ڕاست و ڕەوان حـــاڵی بووم نـاتوانم (ئـەو) لە بیــر بکەم و ئەمـــەش تا کۆتاییی ژیان ناشـادم دەکات. ئیدی دەمـزانی هەرگیز ناتوانم بەتەنیا بژیم. لەگـەڵ گـێـڕانـەوەی بەسـەرهـاتمدا، تارمـاییی خـێـوێک، وەک ئەوەی بیــەوێت هەردووکمان پەرۆش و نیگەران بکات، لە نیوەی شەودا باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو. مێوانەکەم لە بەرەبەیاندا دوای ئەوەی گوتی بەسەرهاتەکەمی خۆش ویستووە و دڵخۆشی کردم، بەڵام گوتی چەند شتێک ڕەت دەکاتەوە. منیش، لەوانەیە بـەمـەبەسـتی ڕزگاربوونم لە بیرەوەریی تاڵی خۆم و برای هاوجـەمکم بووبێت، بەوردی گوێم بۆی ڕاگرت.

ئەو بە پێویستی زانی بەدوای شتە سەمەرە و سەرسووڕهێنەرەکانی وەک ئەوانەی ناو بەسـەرهـاتەکەمدا بگەڕێین. بەڵێ، ڕەنگە ئەمە تـەنـها شـتێک بێت لەبەرامبەر داهێزراویی وەڕسکەری دنیـادا لە دەستمان بێت. لەبەر ئەوەی هەر لە سـەردەمی منداڵی و سالانی خوێندنەوە پەی بەم شتـە بردووە، هیچ کاتێک

بەخەیالیدا نەهاتووە ژیانی خۆی لە ناو چوار دیواردا بەسەر ببات، بۆیە سەرلەبەری ژیانی لە گەڕان و لە ڕێگە و بانە بێ کۆتاییەکاندا بەدوای کۆکردنەوەی بەسەرهاتدا بەسەر بردووە. پێی وا بوو دەبێت لە دنیای دەرەوەی خۆمان، نەک لە ناخماندا، بەدوای شتی نامۆ و سەمەرەدا بگەڕێین و دەیگوت گەڕان بەدوای خۆماندا و بیرکردنەوەی زۆر لە خۆمان، ناشادمان دەکات! پێی وا بوو ئەمە هەمان شت بوو کە بەسەر مرۆگەلی ناو چیرۆکەکەی من هاتبوو. دەیگوت لەو سۆنگەیەوەیە قارەمانەکان ناتوانن خۆیان بن و بەردەوام لە هەوڵی ئەوەدان ببن بە کەسێکی تر. دواتر لێمی پرسی: "با وای دابنێین ڕووداوەکانی ناو ئەم بەسەرهاتەی تۆ ڕاستن، ئایا باوەڕ دەکەیت ئەو مرۆڤانەی کە جێی یەکتریان گرتووەتەوە، بتوانن لە ژیانی نوێیاندا بەختەوەر بن؟" دوایی نازانم لەبەر چی بوو، بڕگەیەکی ناو بەسەرهاتەکەمی هێنایەوە بیرم: "پێویستە خۆمان بە ئومێدی لە جۆری ئەوەی کۆیلەی ئیسپانیی قۆڵ پەڕێندراو دڵخۆش نەکەین! ئەگەر نا، بە نووسینی بەردەوامی ئەو جۆرە بەسەرهاتانە و بە گەڕانی بەردەوام بەدوای شتە سەیر و سەمەرەکان لە خۆماندا، تەماشا دەکەین بووین بە کەسێکی تر. خوا خۆمان و خوێنەرانمان بپارێزێت." ئەولیا نەیدەویست بیر لە دنیایەکی ترسناکی ئەوتۆ بکاتەوە تیایدا مرۆگەل بەردەوام باس لە خۆیان، سەیر و سەمەرەیی خۆیان بکەن و بەردەوام لە کتێب و بەسەرهاتیشیاندا هەمان شت بگێڕنەوە.

بەڵام من دەمویست! بۆیە پاش ئەوەی ئەو پیاوە خوێنشیرینەی کە بە ڕۆژێک خۆشم ویست، لەگەڵ تاریک و ڕوونی بەیاندا پیاوەکانی کۆ کردەوە و بەمەبەستی چوون بۆ مەککە وەک تیر بۆی دەرچوو، یەکسەر دانیشتم و کتێبەکەم نووسییەوە. هەتا لە دەستم هات شتی زۆرم لەمەڕ خۆم و (ئەو)ی لە خۆم ترازاو خستە ناوی. ڕەنگە ئەمەم لەبەر باشتر وێناکردنی مرۆڤەکانی ئەو دنیا ترسناکە بووبێت کە ئەولیا باسی دەکرد. بەڵام ئەمڕۆ پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە کە ماوەی شازدە ساڵ بوو فڕێم دابووە لاوە، بۆم دەرکەوت دەسەڵاتم بەسەریدا نەشکاوە و زۆرم لە دەست نەهاتووە. لەبەر ئەوە داوای لێبووردن لەو خوێنەرانەم دەکەم کە حەز ناکەن مرۆڤ لە بارەی خۆیەوە بدوێت (بەتایبەتیش

ئەو کاتەی مرۆڤ دەکەوێتە بەر شەپۆلی بەهێزی هەستەکانی) و ئەم پەڕەیە بۆ کتێبەکەم زیاد دەکەم:

(ئەو)م زۆر خۆش دەویست، وەک دیمەنی بێچارە و شێواوی خۆم لە خەونمدا، وەک نوقمبوونم لە شەرم و هەڵچوون و تاوان و خەمی ئەو دیمەنەدا؛ وەک کەسێکی شەرمن لە بەردەم ئاژەڵێکی کێویدا کە بەدەم ئازارەوە مردار دەبێتەوە؛ وەک ئەوەی بە بێ ئابڕوویی کوڕی خۆم هەڵچم؛ وەک ئەوەی خۆم بە قینێکی بودەڵانە و شادییەکی گەمژانەوە بناسمەوە. زیاتریش بەمجۆرە خۆشم دەویست: کتومت چۆن ڕاهاتبووم وەک مێش و مەگەز دەست و قۆڵم لە خۆرا بجووڵێنم؛ وەک زانینی ئەو بیرۆکانەم کە هەموو ڕۆژێک دەکوژانەوە و بە دیواری ئەقڵمەوە دەنووسان؛ جۆری بۆنی بێ وێنەی ئەو هەڵمەی لە جەستەی شەکەتمەوە دەردەچوو؛ وەک ناسینی پرچی شێواوم؛ دەمی دزێوم و دەستی پەمەییم بە پێنووسەوە. بەو جۆرە خۆشم دەویست، بۆیە کەس نەیتوانی فریوم بدات. دوای ئەوەی کتێبەکەم نووسی و بەنیازی لە بیرکردنی (ئەو) تورم هەڵدایە گۆشەیەکەوە، بەهیچ جۆرێک بە قسە و قسەڵۆک و گەمەی ئەوانەی ناوبانگی ئێمەیان بیستبوو، و دەیانویست سوودی لێ وەربگرن، فریوم نەخوارد! کەسانێک هەبوون بەدەم سوێند خواردنەوە دەیانگوت: والییەک لە قاهیرە خستوویەتیە ژێر باڵی خۆیەوە و کەلالەی دروستکردنی چەکێکی نوێی پێی سپاردووە! لە کاتی تێکشکانمان لە ڤیەنا، (ئەو) لە ناو شاردا بووە و بۆ ئەوەی بەزووترین کات بە دۆڕانمان بدات، ڕاوێژی پێشکێش بە دوژمنان کردووە! لە ئەدرنە بە جلوبەرگی سوالکەرەوە بیندراوە! خۆی لە شەڕێکی خاوەن پیشەکان هەڵقورتاندووە، لێفەدروویەکی بەر چەقۆ داوە و دوایی بێ سەروشوێن بووە! لە مزگەوتی گەڕەکێکی یەکێک لە ناوچە دوورەدەستەکانی ئەنادۆڵ پێشنوێژی دەکات! موەقیتخانەیەکی کردووەتەوە! دەستی کردووە بە کۆکردنەوەی پارە بۆ قوولەی سەعات! دوای پەتاکە چووەتە ئیسپانیا و لەوێ بە کتێب نووسین دەوڵەمەند بووە! تەنانەت کەسانێک هەبوون دەیانگوت بەهۆی فێڵ و تەڵەکەبازیی سیاسیی (ئەو)ەوە سوڵتان لە تەخت هێندراوەتە خوارێ! دەگوترا لە گوندەکانی سلاڤ ئەوەندە گوێی لە ددان پێداهێنەکان گرت تا

دواجار گەیشتە ترۆپکی ڕاستی، ئێستا وەک قەشەیەکی ئەفسانەیی ئاماژەی بۆ دەکرێت و سەرقاڵی نووسینی کتێبی گوماناوی و بێ سەروبەرە! بە ئەنادۆڵدا دەسووڕێتەوە و دەڵێت سوڵتانە گەمژەکان لە تەخت دەهێنێتە خوارێ. دەستەیەکی داوەتە دوای خۆی، بە فاڵگرتنەوە و شیعر چاوبەستی کردوون و منیشی بۆ لای خۆی بانگ کردووە! بەدرێژایی ئەو شازدە ساڵەی دەمویست (ئەو)ی تێدا لە بیر بکەم و خۆم بە مرۆگەلی ترسناکی داهاتوو، و دنیای ترسناکەوە سەرقاڵ بکەم، بۆ چێژ وەرگرتن لە خەیاڵەکانم چیرۆکم نووسی و زۆر واتەواتی لەوە زیاتریشم بیست، بەڵام بڕوام بەهیچیان نەکرد. نازانم، ئایا ئەوانی دیش هەستیان بەهەمان شت دەکرد: جاروبار ئەگەر چوار دیوارەکەی پشت کەنداوی زێڕینمان لە یەکتر دەکرد بە زیندان، ئەو ڕۆژانەی بێهودە چاوەڕێی بانگهێشتی کۆشک، یان سەرایەکمان دەکرد، یاخۆ بەچێژەوە نەفرەتمان لە یەکتر دەکرد، ئەو دەمانەی بەدەم نووسینەوەی لێکۆڵینەوەیەکی ترەوە بۆ سوڵتان، بەیەکتر پێ دەکەنین، لەپڕ هەردووکمان سەرنجمان لە وردەکارییەکی بچووکی ژیانی ڕۆژانە دەدا: سەگێکی تۆقیوی بەیانیان، ئەندازەی بیچم و ڕەنگی ڕیزی جلوبەرگی هەڵواسراوی سەر تەنافێکی نێوان دوو دار، یان هەڵەیەکی زمان کە هاوشێوەی ژیانی دەخستە ڕوو! ئێستا من لە هەموو شتێک زیاتر تاسەی ئەو شتانە دەکەم! بۆ ئەوەی جارێکی تر گشت شتەکان لە خەیاڵی خۆمدا زیندوو بکەمەوە: شەوانی پەتاکە، سەردەمی منداڵیم لە ئەدرنە، ئەو ساتە جوانانەی لە باخچەکانی سوڵتان بەسەرمان بردبوو، ئەو لەرینەوەیەی لە کاتی بینینی ڕووخساریی بێ ڕیشی (ئەو)دا لە بەردەم دەرگای کۆشکی والی هەستم پێی کرد، گەڕامەوە سەر کتێبی سێبەری خۆم. پێشبینیم کرد چەندین ساڵ، بگرە سەدان ساڵ دوای مردنم، لەوانەیە کەسێکی تامەزرۆ لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەمدا زیاتر پێشبینی ژیانی خۆی بکات وەک لە ژیانی ئێمە. خۆ ئەگەر کەسیش نەیخوێنێتەوە، هیچ باکم نییە و لەم سۆنگەیەشەوەیە ناوی (ئەو)م، ئەگەر زۆر بە قوڵیش نەبێت، تێدا شاردووەتەوە و ناشتووە. هەموو کەسێک دەزانێت بۆ بەدەستهێنانەوەی خەیاڵ و ژیانی بەسەرچوومان، پێویستمان بە

پێشبینیکردنیان هەیە: من باوەڕم بە بەسەرهاتی خۆم هێنا!

بەپەسندانی ئەو ڕۆژەی بڕیارم دا بەئەنجامی بگەیەنم، کۆتایی بە کتێبەکەم دەهێنم: دوو هەفتە لەمەوبەر، دیسان چوومەوە بەردەم مێزەکەمان و هەوڵم دا پێشبینیی بەسەرهاتێکی تر بکەم. لەو کاتەدا ئەسپسوارێکم بینی لەبەری ئەستەنبوڵەوە دەهات. ماوەیەک بوو کەس نەبوو هەواڵی (ئەو)م بۆ بهێنێت. لەوانەیە لەو ڕووەوە بووبێت کە زۆر وشک بووم لەگەڵیان. زۆر باوەڕیشم نەدەکرد لەمەودوا کەسی تر بێت، بەڵام ئەگەر ئەو ڕێبوارە سەمەرە و عەبا لەبەر و چەتر بەدەستەم دی، دەستبەجێ تێ گەیشتم بۆ کن من دێت. پێش ئەوەی بچینە ژوورەکەم، گوێم بۆی ڕاگرت. ئەگەر هێندەی (ئەو)یش نەبێت، بەهەمان هەڵەکانی ئەوەوە بە تورکی دەدوا. بەڵام هەر ئەوەندەی چووینە ژوورەکەم، یەکسەر وەریگێڕایە سەر ئیتالی. دوای ئەوەی بینی چارەم دا بەیەکدا و هیچ وەڵامم نەدایەوە، بە تورکییە خراپەکەی خۆی گوتی وای زانیوە هەر هیچ نەبێت من کەمێک ئیتالی دەزانم. دواتر دەستی بە گێڕانەوە کرد: ناوی منی لە (ئەو)ەوە بیستوە. (ئەو) دوای گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی، کتێبێکی ئەستووری سەبارەت بەو بەسەرهاتە لە ئەقڵ بەدەرانەی لە ناو تورکاندا بەسەری هاتووە، دواین سوڵتانی ئاژەڵدۆستی تورک و خەونەکانی و تورک و پەتا و کۆشک و ڕێساکانی شەڕی تورک نووسیوە. لەبەر ئەوەی ماوەیەکە تاسەیەکی پڕ لە ئەفسوون بۆ ناسینی ڕۆژهەڵات لە ناو چینی ئۆرۆستراکت و بەتایبەتیش لە نێوان خاتووناندا تەشەنەی کردووە، بە گەرمی پێشوازی لە نووسینەکانی دەکرێت. کتێبەکانی زۆر دەخوێندرێنەوە، لە ئەکادیمیاکان دەرز دەڵێتەوە و زۆر دەوڵەمەند بووە. لەوەش زیاتر، دەزگیرانی پێشووی شەیدای نووسینەکانی بووە و بێ گوێدانە تەمەنی، لە مێردی جیابووەتەوە و لەگەڵ (ئەو)دا زەماوەندی کردووە. خانووی دابەشکراو و فرۆشراوی خێزانی سەرلەنوێ کڕیوەتەوە و تیایدا گیرساونەتەوە، ماڵ و باخچەیان هێناوەتەوە دۆخی جاران. مێوانەکەم گشت ئەم شتانەی دەزانی، چونکە شەیدای کتێبەکانی بووە و لە ماڵەوە سەری لێ داوە. (ئەو) زۆر نەرم و نیان بووە، ڕۆژێکی تەواوی بۆ مێوانەکەم تەرخان کردووە، وەڵامی

پرسیارەکانی داوەتەوە و جارێکی تریش بەسەرهاتی ناو کتێبەکانی بۆی گێڕاوەتەوە. هەر ئەو کاتە دوور و درێژ باسی منی کردووە. کتێبێکی بە ناوونیشانی "تورکێک کە لە نزیکەوە دەمناسی"، دەربارەی من نووسیوە. پشت ئەستوور بە لێکدانەوەی زیرەکانەی خۆی بۆ تایبەتمەندییەکانی تاکی تورک، سەرلەبەری ژیانی منی هەر لە سەردەمی منداڵیمەوە لە ئەدرنە تا ڕۆژی جیابوونەوەی (ئەو) خستووەتە دووتوێی کتێبەکەیەوە و لەوەدایە بیخاتە بەردەستی خوێنەرانی بەپەرۆشی ئیتاڵی. مێوانەکەم گوتی: "ئای بەڕێزتان چەندە باسی خۆتان بۆ (ئەو) گێڕاوەتەوە!" پاشان بۆ ئەوەی تووشی سەرسوورمانم بکات، هەندێک وردەکاریی چەند پەڕەیەکی کتێبەکەی بیر کەوتەوە: لە کاتی منداڵیمدا، دوای ئەوەی بێ بەزەییانە لە هاوڕێیەکی گەڕەکی خۆمانم داوە، لەبەر ئەو ڕەفتارەم شەرمم بەخۆمدا هاتووەتەوە و بە خەمگینی گریاوم. زۆر ژیرم و بە شەش مانگ سەرپاکی ئەو زانستی گەردووونناسییەم هەرس کردووە کە (ئەو) فێری کردووم. خوشکەکەم زۆر خۆش دەوێت، پابەندی ئاینی خۆمم و سەرم بچێت، نوێژم ناچێت. شەیدای مورەبای گێلاسم و خولیای تایبەتیم بۆ لێفەدروویی هەیە، چونکە پیشەی باوەپیارەم بووە. لەبەر ئەوەی دەمزانی لەگەڵ ئەو گەمژەیەدا بە ساردی هەڵسوکەوت ناکەم و بۆم دەرکەوت شەیدای کەسانی لەو جۆرەیە، دوای ئەو هەموو بایەخەی بە منی دا، ژووور بە ژووری ماڵەکەم پێشانی دا. پاشان گەمەی منداڵە وردەکانم و هاوڕێکانیان لە باخچەدا سەرنجی ڕاکێشا؛ نەک تەنیا ڕێساکانی وازیی هەلووکێن، بگرە لە دەمی منداڵەکانەوە ڕێوشوێنی گەمەکانی چاوشارکێ، باباتونا و یاریی کەری درێژ کە من هیچ حەزم لێ نەدەکرد، لە دەفتەرێکدا تۆمار کرد. لەو کاتەدا بوو گوتی (ئەو) خۆی بە دۆستی تورک دەزانێت. لەبەر ئەوەی هیچی ترمان نەمابوو بیکەین، دوای نیوەڕۆ باخچەکەمان و گەبزە و ئەو ماڵەم پێشانی دا کە لەگەڵ (ئەو)دا ساڵانێکی درێژمان تێدا بەسەر بردبوو. ئەو هەر هەمان شتی دووبارە دەکردەوە. پەرۆشی بینینی ژێرزەمینەکەمان بوو. بەدەم هەنگاونانی وردەوە بەنێوان کوپەی مورەبا، ترشیات، گۆزەی ڕۆنی زەیتوون و سرکەدا، نیگای

کەوتە سەر نیگایەکی بۆیەی ڕۆنیی خۆم کە نیگارکێشێکی ڤینیسیایی بۆمی کێشابوو، کەمێکی تر چووە پێشەوە و ددانی پێدا نا (ئەو) دۆستێکی ڕاستەقینەی تورکان نییە. وەک ئەوەی پەردە لەسەر ڕازێک هەڵبداتەوە و بڵێت زۆر شتی دزێوی لەسەر تورک نووسیوە، گوتی: (ئەو) دەنووسێت ئیدی کەوتووینەتە لێژی و وەک ئەوەی باسی کۆنە دۆلابێکی پڕ لە پیس و پۆخڵی بکات، بەو جۆرە لە بارەی شتەکانی ناو مێشکمانەوە دەدوێت. دەڵێت نەمانتوانیوە خۆمان چاک بکەین، بۆ خۆ قورتارکردن، جگە لە ملکەچکردن لەبەرامبەر ئەواندا، هیچ چارێکی ترمان نییە. دوای ئەوەش جگە لە لاساییکردنەوەی ئەوانەی ملمان بۆیان کەچ کردووە تا ماوەی سەدان ساڵ، هیچی ترمان لە دەست نایەت. بۆ ئەوەی زۆر درێژەی پێ نەدات، گوتم: "بەڵام (ئەو) دەیویست ئێمە ڕزگار بکات. میوانەکەم یەکسەر گوتی: "بەڵێ، بۆ ئەو مەبەستە چەکێکیشی دروست کردووە، بەڵام ئێوە لێی تێ نەگەیشتوون. ئامێرەکە، لە بەیانییەکی تەماویدا، وەک چۆن با و تۆفان کەشتییەکی ترسناکی چەتەی دەریا فڕێ دەداتە ناو بەردەوە، چەقیوە و لە زۆنگاوێکی نامۆدا بەجێ ماوە. درێژەی دایێ و گوتی: "بەڵێ، (ئەو) زۆر، هەر زۆر لە خەمی ڕزگارکردنی ئێوەدا بووە، بەڵام ئەمە واتەی ئەوە ناگەیەنێت (ئەو) لە ڕەفتاری ئیبلیسیانە بێبەری بێت. هەموو داناکان هەر وا بوون!" نیگارەکەمی بە دەستەوە گرت و لە نێزیکەوە و وردتر سەیری کرد. لەبەر خۆیەوە چەند شتێکی گوت: "ئەگەر بە دیلی نەکەوتایەتە دەست ئێوە و ژیانی خۆی لە وڵاتی ئێوەدا بەسەر نەبردایە، ئەوا (ئەو) دەیتوانی ببێت بە لیۆناردۆی سەدەی حەڤدەیەم. دواتر جارێکی دی گەڕایەوە سەر بابەتی خراپەکاری کە دیار بوو زۆر حەزی پێ دەکرد. یەک دوو قسەلۆکی قرێژی تایبەت بە پارەی بۆم گێڕایەوە گوایە لە بارەی (ئەو)ەوە دەماودەم دەکات و ئەم بەباشی لە بیری نەماوە. دواتر گوتی: "سەیر ئەوەیە بەڕێزتان هیچ نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەریی (ئەو)ەوە!" دوای ئەوەی ناسیمی و خۆشی ویستم، سەرسووڕمانی خۆی دەربڕی: "من تێ ناگەم چۆن دوو مرۆڤ ئەو هەموو ساڵە پێکەوە ژیاون، ئەوەندە کەم لە یەک دەچن؟" ترسی ئەوەم بوو داوای وێنەکەم لێ بکات، بەڵام

نەیویست و لە شوێنی خۆی دای نایەوە. پاشان پرسی: "دەتوانم لێفەکانیش ببینم؟" من بە نیگای خاڵییەوە گوتم: "کام لێفانە؟" ئەو بە پەشۆکانەوە پرسی: "مەگەر کاتی بێکاریی خۆت بە لێفە درووونەوە بەسەر نابەیت؟" لەو کاتەدا بوو بڕیارم دا ئەو کتێبەی پێشان بدەم کە شازدە ساڵ بوو دەستم بۆی نەبردبوو.

زۆر شڵەژا، ڕوونی کردەوە دەتوانێت تورکی بخوێنێتەوە و گوتی زۆر پەرۆشی هەر کتێبێکە لە بارەی (ئەو)ەوە بێت. چووینە ژووری کارەکەم لەسەرەوە کە بەسەر باخچەی پشتەوەدا دەیڕوانی. لە بەردەم مێزەکەمان دانیشت. دوای شازدە ساڵ، وەک ئەوەی دوێنێ لەوێم دانابێت، کتێبەکەم لە شوێنی فڕێدانی دیتەوە. کردمەوە و لە بەردەمیدا دام نا. ئەگەرچی لەسەرخۆش بوو، بەڵام دەیتوانی تورکی بخوێنێتەوە. بەهەمان شێوەی ئەوەی لە هەموو گەڕیدەکاندا دیبووم و منی کەللەیی دەکرد، ئەویش بەنیازی بەدەستهێنانی کەمێک سەرسووڕمان، بێ ئەوەی لە جیهانی پتەو و بەمتمانەی خۆی جودا ببێتەوە، لە کتێبەکەمدا نوقم بوو. بەتەنیا جێم هێشت و چوومە باخچە. لەسەر کورسییەکی حەسیر لە شوێنێک، بەجۆرێک ئەوم لە پەنجەرە کراوەکەوە لێوە دیار بێت، دانیشتم. دەسپێک دڵخۆش بوو، لە پەنجەرەکەوە بانگی کرد: "هەر زۆر ئاشکرایە پێتان نەناوەتە سەر خاکی ئیتاڵیا!" بەڵام دواتر منی لە بیر چوو. ماوەی سێ سەعات لە باخچە دانیشتم و چاوەڕێم کرد تا لە خوێندنەوەی کتێبەکە بووەوە. جاروبار بە تیلەی چاو سەیرێکم دەکرد. دوای خوێندنەوەی، لە هەمووی تێ گەیشتبوو، نیشانەی سەرسووڕمان بەڕووخسارییەوە دیار بوو، بەدەمی پڕ لە هاوارەوە یەک دوو جار ناوی قەڵای سپیی پشت ڕۆنگاوی قوتدەری چەکەکەمانی گوتەوە. چەند جارێکیش، بێ ئەوەی پێویست بکات، بە ئیتاڵی لەگەڵم دوا. پاشان بەمەبەستی هەرسکردنی سەرسووڕمانی خۆی و ئەو شتانەی خوێندبوونییەوە و بۆ ئەوەی ماندوویی بحەسێتەوە، ڕووی لە پەنجەرە کرد و بە نیگای خاڵییەوە بۆ دەرەوەی ڕوانی. بەخۆشحاڵییەوە دەمبینی، وەک ئەوەی مرۆڤ هەموو جارێک لە سەرەتاکانی دۆخی لەو جۆرانەدا دەیکات، ئەویش نیگای بڕیبووە خاڵێکی بێ کۆتایی لە بۆشاییدا و سەیری چەقێکی نەبووی دەکرد. بەڵام دواتر، وەک منیش چاوەڕێم

دەکـرد، بینـی: ئەمـجـار سـەیری ئەو شـتـانەی دەکـرد کـە لـە چوارچێـوەی پەنجـەرەکـەوە لێـوەی دیار بوون. نەخـێـر، خـوێنەرانـی ژیرم حـاڵـی بوون. مێوانەکەم هێندە گەمژە نەبوو جۆری ئەوەی من بۆی چووبووم. وەک چاوەڕێم دەکرد، بەپەرۆشەوە دەستی کردە هەڵدانەوەی پەڕەکانی کتێبەکەم و دەگەڕا. منیش بەجۆشـەوە چاوەڕێ بووم بیدۆزێتـەوە. دواجـار، ئەوەی بۆی دەگـەڕا، دۆزییەوە و خوێندییەوە. پاشـان، جارێکی تر سەیری ئەو شتانەی کرد کە لە پەنجەرەی سـەر باخچەی پشتەوەی ماڵەکەمـەوە دەبیندران. بێگومان زۆر باش دەمزانی چی دەبینێت:

خۆخ و گێلاس لەسەر سینییەکی گەوهەرڕێژی سـەر مێزێک دانرابوون، لە پشت مێزەکەوە کورسییەکی لە حەسیر چندراو هەبوو. چەند سەرینێکی پەڕی باڵندەش لە هەمان ڕەنگی سەوزی چوارچێوەی پەنجەرەکە لەسەر کورسییەکە دانرابوون. منی تەمـەن حـەفـتـا سـاڵەش لەوێ دانیـشـتـبـووم. لە دواتریش، ئەسـتـێـرکـێکی ژێر بڕێک دار زەیتـوون و گـێـلاسی دەبینـی جۆلەکـەیەک بە قـەراغییـەوە نیشتبووەوە. جۆلانەیەکیش بەلقێکی بەرزی دارگوێزێکی دوای ئەوانەوە هەڵواسرابوو، هێدی هێدی بەدەم بایەکی نادیارەوە دەلەرایەوە.

١٩٨٤-١٩٨٥

کۆتایی

## فەرهەنگۆک

ئالماگاست: کتێبی المجسطی، ناوە ڕاستەقینەکەی بە یۆنانی (ماتماتیکا سینتاکسیس)ە و واتای نامەی بیرکاری دەگەیەنێت. ئەم کتێبە دەربارەی گەردوون و بیرکارییە، زانای یۆنانی پەتلیمۆس لە ساڵی ١٤٨ی زایینیدا لە ئەسکەندەریەی میسر نووسیویەتی. حنین بن إسحاق لە یۆنانییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، لە عەرەبیشەوە کراوە بە لاتینی و لە لاتینیشەوە بۆ زمانە ئەورووپاییەکانی تر وەرگێڕدراوە. ناوی کتێبەکە لە زمانە ئەورووپاییەکاندا بە ناوە عەرەبییەکەی (المجسطی - ئالماگاست) ڕۆیشتوە.

ئازتیەک: ئیمپراتۆریەتێکی کۆنی پارزەمینی ئەمریکایە لە نێوان سەدەکانی چواردەیەم و شازدەیەمی زایینیدا لە مەکسیکی ئەمڕۆدا فەرمانڕەوایی کردووە.

ئەمپۆلی: شارێکی ئیتاڵییە دەکەوێتە سنوری پارێزگای فلۆرنسا لە هەرێمی تۆسکانا و لە دەشتێکی قەراغ ڕووباری ئارنۆدا بنیات نراوە. ئەمپۆلی لەم چاخەدا بە پیشەسازیی مۆبیلیا، خواردەمەنی، چنین و ڕستن و شووشە بەناوبانگە.

ئەیاسۆفیا: لە ڕابردوودا کڵێسا و مزگەوت و ئێستا مۆزەخانەیەکی بەناوبانگە لە ئەستەنبوڵ و بە نموونەی بیناسازیی بێزەنتی دادەنرێت. لە ساڵی ٥٢٣ی زایینیدا بە فەرمانی ئیمپراتۆری بێزەنتی جەستنیان و لە ژێر چاودێریی ئەودا بینات نراوە و ماوەی هەزار ساڵی ڕەبەق خزمەتی بە ئاینی مەسیحی کردووە. عوسمانییەکان، لە ساڵی ١٤٥٣ی زایینیدا

قوستەنتینییەیان داگیر کرد و کلێساکەیان کرد بە مزگەوت. مستەفا کەمال ئەتاتورکیش لە چارەکی یەکەمی سەدەی ڕابردوودا کردی بە مۆزەخانە.

باباتونا: گەمەی بازدانی منداڵان بەسەر پشتی یەکتردا.

بۆزا: خواردنەوەیەکی خەست و ساردی زستانەیە لە گەنمەشامیی هاڕدراو دروست دەکرێت.

بۆزجائادا: سێیەم گەورەترین دوورگەی تورکییە لە دەریای ئیجەدا و ڕووبەرەکەی ٤٢ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە. ئەم دوورگەیە بەشێک بوو لە خاکی یۆنان، بەڵام ساڵی ١٩٢٣ لە چوارچێوەی پەیمانی لۆزاندا خرایە سەر تورکیا و ئێستا سەر بە پارێزگای چاناکالایە.

بۆکاچیۆ: نووسەر و شاعیر Giovanni Boccaccio، ١٣١٣ – ١٣٧٥ ز، یەکێکە لە دیارترین ناوەکانی ئەدەبیاتی ئیتاڵی. ئەمیش وەک دانتێ ڕۆڵێکی گرینگی لە پێشخستنی زمانی ئیتاڵیدا هەبووە و یەکێک بووە لە داکۆکیکەران لە هیومانیزم لە سەردەمی ڕێنەسانسدا. بە قسەی خۆی لە حەوت ساڵییەوە دەستی بە چیرۆک نووسین کردووە و لە ژیاندا شەیدای گەشتوگوزار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و نیگارکێشی و تێگەیشتن لە باری دەروونیی مرۆڤ بووە. "دەکامیرۆن" یەکێکە لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی بۆکاچیۆ.

پاڤوریا: جۆرێکە لە قرژاڵی دەریایی.

پەتلیمۆس: کلاودیۆس پتولیمایۆس، ٩٠-١٦٨ ز. بە پەتلیموس ناسراوە و زانایەکی بیرکاری و جوگرافی و گەردووناس و ئەستێرەناسێکی یۆنانییە. بڕوا دەکرێت لە نێزیک ئەسکەندەرییەی میسری سەردەمی ڕۆمانی لە دایک بووبێت. خاوەنی چەندین لێکۆڵینەوەی زانستییە، گرینگترینیان برێتییە لـ ـیبی ' لجبـطی - ئالماگاست.

توکیدیدەس:Thukidides، (دەورووبەری ٤٦٥ پ.ز-٣٩٥ پ.ز)، مێژوونووسێکی

یۆنانییه و ئەوەی یەکێک لەو خەزانە گەورانەیە کە سامانی زێڕی تراقیایان لە ژێر دەستدا بووە. ڕێبازێکی نوێی بۆ نووسینەوەی مێژوو داهێناوە و هەوڵی داوە پەند لە شەڕ و ڕووداوەکان دەربهێنێت. دەستی لە نووسینەوەی داستان و ئەفسانەی دەستێوەردانی خواکان لە کاروباری ئادەمیزاد هەڵگرتووە و تەنیا ڕووداوە ڕاستەقینەکانی تۆمار کردووە. بەوە ناسراوە لە نووسینەوەی مێژووی شەڕەکانی سەردەمی ژیانی خۆیدا زمانێکی کاریگەریی بەکار هێناوە.

تونجا: ڕووبارێکە لە بولگارستان هەڵدەقوڵێت و لە تورکیا دەڕژێتە دەریاوە.

تەنگەی بوسفۆر: Bogaz، ئەو ڕێگە ئاوییەیە کە دەریای ڕەش و دەریای مەرمەرە پێکەوە گرێ دەدات و ئەستەنبوڵ بەسەر دوو بەشی ڕۆمیی (ئەوروپا) و ئەنادۆل (ئاسیا)دا دابەش دەکات.

دانوب: ڕووباری دانوب، یان دۆناو درێژترین ڕووباری ناو سنووری یەکێتیی ئەوروپایە و دوای ڕووباری ئۆلگا، دووەم درێژترین ڕووباری پارزەمینی ئەوروپایە. بە ڕووباری پایتەختان بەناوبانگە، چونکە بە شارەکانی ڤیەنا، براتیسلاڤا، بودابست و بەلگراد دا تێ دەپەڕێت. درێژییەکەی ۲۸۵۰ کیلۆمەترە و دوای تێپەڕبوونی بە هەشت وڵاتدا، دەڕژێتە دەریای ڕەشەوە.

دەریای ئازاک: دەریایەکە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەشەوە. ڕووبەرەکەی ۳۷۷۰۰ کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، تەنگەی کەرچ و دەریای ڕەش بەیەک دەگەیەنێت.

پادوا: یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی ئیتاڵیا. پایتەختی هەرێمی پادوایە و بەدووری ۳۰ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای ڤینیسیا هەڵکەوتووە.

فلاندەرستان: بریتییە لە بەشی فلامەنی بەلجیکا.

قەرەگوێز و هاجیڤات: دوو ئەکتەریی سەرەکیی گەمەی بووکەشووشەی تورکین.

قولەدیبی: گەڕەکێکی زۆر کۆنی ئەستەنبوڵە.

کـاڕپات: نـاوچەیەکی شـاخـاوییـە لە نـاوەڕاست و ڕۆژهـەڵات و باشـووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا. لای براتیسلاڤا و ڤیەناوە دەست پێ دەکات و لە نێـزیک ڕووبارەکـانی مـۆراڤـا و نیـشـاڤـا و تیـمـبـۆک لە ڕۆژهەڵاتی سـربـسـتـان بەکۆتا دێت. بەرزترین زنجـیـرە چیـای ناوچەی کـاڕپات چیـای تاترایە کە دەکـەوێتە پۆڵۆنـیـا و سلۆڤـاکیـایەوە و لە بەرزترین شوێنیدا ٢٦٥٥ مەتر لە ڕووی دەریاوە بەرزە.

کۆرتێز: هێرنان کۆرتێزی ئیسپانی (١٤٨٥–١٥٤٧). لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ئیسپانیای بەجێ هێشتووە و بەنیازی گەڕان بەدوای ساماندا ڕووی لە ئەمـریکا کـردووە. لە ئاکـامـدا خـۆی لەگـەڵ سـوپای ئیـسـپـانیـدا گەیاندووەتـە سەرزەمینی ئازتێکەکان و دەستی هەبووە لە ڕووخاندنی ئیمپراتۆریەتی ئازتیکدا.

کۆسـمـۆگـرافی: بریتـییـە لە زانستی پێناسـەکردنی زەوی و گـەردوون. لە دوو وشەی یۆنانی (کۆسمۆس–زەوی و گرافی–پێناسەکردن) پێک دێ.

کـەنداوی زێڕین: Haliç، کـەنداوێکی بـچـووکـی ئەسـتـەنبـوڵە و لەگـەڵ دەریای مـەرمـەرەدا نیـمـچـە دوورگـەیەک پێک دەهێنێت. لە سـەردەمی ئیمپـراتۆریەتی بێزەنتەدا ناوەندی هێزی دەریایی ئیمپراتۆریەت بووە. لەم ڕۆژگـارەدا سێ پردی هـاوچەرخ ئەمـبـەر و ئەوبەری کـەنداوی زێڕین، گالەتا و ئەمینئۆنۆ، بەیەک دەگەیەنن.

گـۆتیک: شـێـوازێکی بیناسـازیی ئەورووپییـە کـە دەسـپـێکی سـەرهـەڵدانی بۆ سـەدەکانی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە. وشـەکە لە ناوی هۆزەکانی گۆتی ئەڵمـانییـەوە دێت، ئەو هۆزانەی کە لە سـەدەی پازدەیەمدا ئیتـاڵیـایان داگـیـر کـرد. شـێـوازی بیناسـازیی گـۆتیک پێـوەسـتـە بە بنیـاتنانی کلێـسـاوە لە باکـوری ئەوروپا. کلێـسـای بنیـاتنراو لەسـەر شـێـوازی گۆتیک بڵندە و ڕووبەرێکی کەم داگیر دەکات، بە پێچەوانەی شێوازی

بیناسازیی ڕۆمانی که کلێسا نزمه و ڕووبەرێکی گەورە داگیر دەکات.

لیمنی: ناوچەیەکی گەشتوگوزاریی دڵگیرە کەوتووەتە کەناری ڕۆژئاوای دوورگەی ئێڤیای یۆنانییەوە. لە هاویناندا شوێنێکی دڵگیری حەسانەوەی گەشتیارانی ئەورووپییە.

موەقیتخانە: ناوەندێکی پاشکۆی مزگەوتە بۆ چاودێری و دەستنیشانکردنی کاتەکانی نوێژ، ڕۆژوو، جەژن و بۆنە ئیسلامییەکان.

مەریچ: ڕووباری مەریچ، بە یۆنانی ئەڤرۆس، سنووریی وشکاییی تورکیا و یۆنان و بەشێک لە سنووری تورکیا و بولگارستان لە یەک جیا دەکاتەوە.

نەعیمە: مێژوونووسی عوسمانی مستەفا نەعیمە - ١٦٥٥-١٧١٥ز.

هەیبەلی: یەکێکە لە سەوزترین دوورگەکانی دەوری ئەستەنبوڵ و چوار گردۆلکەی بەسەرەوەیە و هەرە بەرزیان ١٤٠ مەتر لە ڕووی دەریاوە بەرزە.

هیپۆکرات: کوڕی ئاکدیلۆس هیپۆکراتە. ساڵی ٤٦٠ پ.ز. لە دوورگەی ئیستانکۆی لە یۆنان لە دایک بووە و ساڵی ٣٧٧ پ.ز. لە لاریسا کۆچی دوایی کردووە. بە باوکی زانستی نۆشداریی دادەنرێت و یەکەمین کەسە لە مێژوودا کتێبی پزیشکیی نووسیبێت.

یاسیادا: دوورگەیەکی بچووکە لە دەریای مەرمەرەدا لە نێزیک ئەستەنبوڵ هەڵکەوتووە.

بەفر:

(کا)ی شاعیر دوای بەسەربردنی دوزازدە ساڵ ژیان لە تاراوگەی ئەڵمانیا، بۆ ئەستەنبوڵ دەگەڕێتەوە. چوار ڕۆژ پاش گەڕانەوەی، ڕۆژنامەیەکی ئەستەنبوڵی بۆ ئەنجامدانی ڕیپۆرتاجێک لە بارەی دیاردەی خۆکوشتنی ژنان و هەڵبژاردنەکانی شارەوانی کە چاوەڕێ دەکرێت ئیسلامییەکان سەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنن، ڕەوانەی شاری قارسی دەکات. ئەمیش بەژێر بەفرێکدا کە هێدی هێدی و بێ وچان دەبارێت، کۆڵان، شەقام و دووکان بە دووکان دەگەڕێت و تێ دەکۆشێت ئاشنای ئەو شارە خەمگین و جوانە و دانیشتووانی بێت. لە گەڕانەکانیدا دەچێتە چایخانەکانی سیحناخ لە بێکارانی کورد، سەر لە خێزانی کچان و ژنانی خۆکوشتوو دەدات و لە هۆکارەکانی خۆکوشتنیان دەکۆڵێتەوە. لە ئاکامی هاتوچۆی زۆر و تاوسەندنی خولیای لێکۆڵینەوەدا، دەکەوێتە ناو تەنگژەی سیاسی و ئاینی و راپێچی تۆڕێکی تەموومژاویی پێوەندیی سیاسی و شەڕی دەسەڵات و پیلانگێڕان دەکرێت. بێ پەروا لە شەقام و کۆڵانەکانی شارێکی نەگبەتی تەناتەت لەلایەن خواشەوە فەرامۆشکراو، بەدوای ئەڤینی کۆنی سەردەمی زانکۆ و ڕاستی و لێکدانەوەی شیعرەکانیدا دەگەڕێت. لەپڕ کودەتایەک بەرپا دەبێت. بەفر ڕێگە و بانەکان دەگرێت و کەس ناتوانێت شار بەجێ بهێڵێت.

***

– ڕۆمانەکانی ئۆرهان پاموک ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو شایەنی خەڵاتی نۆبڵ بوو. (گۆڤاری ئایندە – کوردستان)

– ئۆرهان پاموک نە ئیدۆلۆگ، نە سیاسەتمەدار و نە ڕۆژنامەنووسە، ڕۆماننووسێکی گەورەیە.

(ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز – وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا)

– ڕۆماننووسی تورک ئۆرهان پاموک چۆنیەتیی ڕۆماننووسین پێشانی ئەوروپا دەدات. (ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ئەلگەماینەی ئەڵمانی)

**من ناوم سووره:**

ڕۆمانی من ناوم سووره که ئۆرهان پاموک به ڕەنگینترین و گەشبینترین ڕۆمانم" ناوی دەبات، ڕووداوەکانی لە نۆ ڕۆژی بەفراوی و تۆفی زستانی ساڵی ۱۵۹۱دا دەقەومێن. شەکوورەی شۆخ بە دوو کوڕی بچووکی بەردەوام پێکدا هەڵپڕژاوەوە دەکەوێتە گەڕان بۆ دۆزینەوەی مێردێکی نوێ و خۆشەویستێک لە جێی مێردی پێشووی، چونکە چوار ساڵ بەسەر نەگەڕاوەیدا لە شەڕ تێ پەڕیوە. بۆ ئەم مەبەستە، لە شوێنی خۆ شاردنەوەیەوە سەیری ئەو وەستا نیگارکێشانەی کۆشکی سوڵتان دەکات کە باوکی یەک بەیەک بۆ ماڵی خۆی بانگیان دەکات. وەستایانی نیگارکێش، ئەوانەی ڕوو لە ماڵی ئەمان دەکەن، لە ژێر کاریگەریی شێوازی فەرەنگدا نیگاری ترسناک بۆ کتێبێک دەکێشن سوڵتانی عوسمانی.بەنهێنی و بە چاودێریی باوکی شەکوورە بە ئامادەکردنی دەدات. پاش کوژرانی یەکێک لە نیگارکێشەکان، قەرەی پوورزا و ئەڤینداری شەکوورە پەیدا دەبێت. لە ئەستەنبوڵیش، دەستەیەک لە دەوری مەلایەک گرد بوونەتەوە، لە کاتێکدا گرانی و ترس و پەلاماری ئەم دەستەیە بۆ سەر تەکیەکان باڵی بەسەر شاردا کێشاوە، وەستایانی و خۆشنووسان شەوانە لە قاوەخانەیەک کۆ دەبنەوە و بەدەم گوێگرتن لە بەسەرهاتەکانی چیرۆکبێژێکی زماندرێژەوە کات بەسەر دەبەن و ڕادەبوێرن. ئەم کتێبە باس لە مردووان، زمانگرتنی شتومەک، مەرگ، هونەر، ئەڤین، ژیانی هاوسەری و بەختەوەری دەکات و هەریەکەشیان بە دەنگی خۆیان دەدوێن. هەمان کات شینێکی خەمگینیشە بۆ جوانییە لە بیرکراوەکانی هونەری نیگارکێشانی کۆن.

***

– شاکارێکی شاهانە و دەوڵەمەندی ئەدەبی جیهانییە.

(ڕۆژنامەی فرانکفورتەر ئەلگەماینەی ئەڵمانی)

پێویستە هەموو کەسێک بەرهەمەکانی ئۆرهان پاموک بخوێنێتەوە

(ڕۆژنامەی نیوستەیتمانی بەریتانی)

لە سەدەی حەڤدەیەمدا ڤینیسیاییەک لەلایەن چەتە دەریاوانەکانی تورکەوە دەستگیر دەکرێت و دەهێندرێتە ئەستەنبوڵ. ئەم کۆیلەیە پێی وایە سەری لە گەردووناسی، فیزیا و نیگارکێشی دەردەچێت. تورکێکی خاوەن هەمان ئەو خولیایانە دەیکڕێت. لێکچوونێکی سەیر لەو دوو مرۆڤەدا هەیە. کۆیلەدار دەیەوێت لە کۆیلەکەیەوە ئاشنای ڤینیسیا و زانستی ڕۆژئاوا ببێت. ئەم دوو کەسە، سەردار و کۆیلە، بەمەبەستی یەکترناسین، تێگەیشتن و گێڕانەوەی باسی یەکدی، لە ماڵێکی تاریک و چۆڵی سەر کەناری کەنداوی زێڕیندا، لەمسەر و ئەوسەری هەمان مێز دادەنیشن و قسە دەکەن. چیرۆک و بەسەرهات و بیرەوەرییەکانیان، ئەوان بەرەو شەقام و کۆڵانەکانی ئەستەنبوڵی تووشبووی پەتا، باخچە خەیاڵییەکان و ئاژەڵەکانی سوڵتانی منداڵ، دروستکردنی چەکێکی لە ئەقڵ بەدەر و پرسیاری "من بۆچی منم" بەکێش دەکات. بەدەم بەردەوامبوونی چیرۆکەکانیانەوە لە گزنگی بەیانەوە تا تاریکایی شەو، سێبەرەکانیان هێدی هێدی جێگۆڕکێ دەکەن.

- کامڵترین بەرهەمی خەیاڵە تا ئێستا گەیشتبێتە کتێبخانەکان و فرۆشرابێت.

(ئەی بی سی کولتوورا، ئیسپانیا)

- چیرۆکێکی پۆست مۆدێرنی بەچێژ و خەیاڵ بزوێنە، وەستایانە بنیات نراوە و بە داوی پارادۆکس هۆنراوەتەوە.

(پوبلیشەرز ویکلی، نیویۆرک)

چاپخانەی
هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil